# فەرهەنگی کینایە

کوردی - کوردی
کوردی - فارسی

ئیبراهیم ئەحمەدی

# فەرهەنگی کینایە

کوردی ـ کوردی

کـوردی ـ فارسی

ئیبراهیم ئـەحمەدی

سرشناسه: احمدی ابراهیم ۱۳۳۳
عنوان و نام پدیدآور: فرهنگی کینایه کوردی-کوردی کوردی-فارسی/ ئیبراهیم ئەحمەدی
مشخصات نشر: سنندج دانشگاه کردستان ۱۳۸۶
مشخصات ظاهری: ۲۸۰ص
شابک: ۲-۴-۰-۲۷۹۷-۹۶۴-۹۷۸
وضعیت فهرستنویسی: فیپا
یادداشت: فارسی کردی
موضوع: کردی واژەنامەها فارسی
شناسه افزوده: دانشگاه کردستان
ردەبندی کنگره: ۲۷۵الف۳۳آ/۳۲۵۶

# فەرهەنگی کینایە

نووسەر: ئیبراهیم ئەحمەدی
هەڵەگری و پێداچوونەوە: مەنسوور ڕەحمانی
سەرپەرشتی چاپ: شوان تاهیری
ڕازاندنەوەی: سومەییە تەیمووری (سۆما)
جار و ساڵی چاپ: یەکەم/ پاییزی ۱۳۸٦
شابەك: ۲-٠٤-۲۷۹۷-۹٦٤-۹۷۸
نرخ: ۲۸۰۰ تمەن

# بە ناوی خوای دلۆڤان

## چۆن ئەم فەرهەنگە نووسرا:

بە لە بەرچاوگرتنی ئەوەی کە ساڵەهایە وانەی ئەدەبیاتی فارسی و بەتایبەت وانەی "جوانکارییە ئەدەبییەکان" ئەڵێمەوە کاتێ کە ئەگەیشتمە وانەی "کینایە" هەمیشە هەستم بە بۆشاییەك لەم بوارە لە ئەدەبی کوردیدا ئەکرد. هەر بە هۆی ئەم بۆشاییە بە شێوەیەکی پراتیکی وردە وردە دەستم کرد بە کۆکردنەوەی کینایە و بەردەوامبوونم لە سەری بووە هۆی ئەوەی کە زۆرتر هۆگری کارەکە بم. یەکێ لەو کەسانەش کە بە ڕاستی دڵی گەرم کردم و هانی دام کە لە سەری بەردەوام بم هاوڕێ شاعیرم کاك "ڕەحیم لوقمانی" بوو.

لە پەرتووکخانەی ئەدەبیاتی کوردیدا هیچ سەرچاوەیەك کە ڕاستەوخۆ سەبارەت بە کینایە نووسرابێت نەمدۆزییەوە. سەرەتا بە نووسینی ئەو کینایانەی دەستم پێ کرد کە بە شێوەیەکی سەرزارەکی لە زمانی خەڵکەوە بیستبووم یان ئەمبیست و لە ئارادا بوون. پاشان دەستم کرد بە پشکنینی ئەو پەرتووکانەی کە سەبارەت بە پەندی پێشینیان و مەتەڵ و قسەی نەستەقی کوردی بوون و هەروەها چەند وشەدانم خوێندەوە و کینایەکانم دەرهێنا.

لە کۆی سەرچاوەکاندا کینایەکان بە سێ شێوە نووسرا بوون.

**دەستەی یەکەم:** ئەو کینایانەی کە بە کوردی شەرح کرابوون.

**دەستەی دووهەم:** ئەو کینایانەی کە بە فارسی شەرح کرابوون.

**دەستەی سێهەم:** ئەو کینایانەی کە تەنیا نووسرابوون و هیچ شرحێکیان لە سەری نەنووسیبوو.

ئەوانەی کە شەرحەکەیان کوردی بوو وەرمگێڕایەوە سەر زمانی فارسی و ئەوانەش کە شەرحەکیان فارسی بوو بە کوردی وەرمگێڕانەوە و دەستەی سێهەمیش کە تەنیا خودی کینایەکە بە بێ هیچ شەرحێ بوون بە هەردوو زمانی کوردی و فارسی شەرحم کردن. لە پەنای هەر کینایەیەك ئاماژەم بە سەرچاوەکەیشی کردووە. هەروەها کینایەکان لە سەرچاوەدا چۆن نووسراون دەقاودەق نووسیومەتەوە. جاری واش بووە کینایەکان لە دوو سەرچاوەدا هاتووە و هەرکامیان بە جۆرێك لێکی داوەتەوە . لەم شوێنانە هەر دوو لێکدانەوەکەم هانیوە.

ئەو شەرحەی کە لە نێوان چفتە یان قولاب دایە چ کوردی یان فارسی هی خۆمە و ئەوەیشی لە قولابدا نییە هی خاوەنەکەیەتی چ کوردی بێت یان فارسی و لە گەڵ

ئەوەدا کە دەمتوانی بەشی زۆری واتاکان لێکبدەمەوە حەزم کردووە هی سەرچاوەکان بنووسم و ڕێزی ڕەنجی خاوەنەکەیم داناوە و ئەگەر خاوەنەکی لە یەك یان دوو یان زیاتر ڕوونکردنەوە و شەرحی نووسیوە دوای ئاخرین شەرح سەر چاوەکەیشم هێناوە و ئەو کینایانەی کە لە دەم و زاری خەڵکەوە گیراون و دەماودەم هاتوون خۆم لێکم داوەتەوە و واتاکەم بۆ نووسیوە و ئیتر ئاماژەم بۆ سەرچاوە نکردووە. ژمارەیەك لە کینایەکانیش کە لە پاڵیاندا سەرچاوەکم نووسیوە ئەمانە بێ ڕوونکردنەوە و شەرح بوون و خۆم شەرح و واتام بۆ نووسیوە.

کینیایەکان لە دیالێکتە کانی زمانی کوردی و شوێنە جۆربەجۆرەکانی کوردەواری برێ جار واتاگەلێکی جۆراجۆریان هەیە بەڵام واتای زۆرینەی کینایەکان لە هەموو شوێنەکان وەکوو یەکە.

زۆربەی کینایە کۆکراوەکانی ئەم فەرهەنگە پەیوەندیان بە دیالێکتی سۆرانییەوە هەیە لە نێو ئەمانەشدا زۆرتری کینایەکان هی زاراوەی ئەردەڵانین. برێ لە کینایەکانیش هی دیالێکتەکانی ترن. واتای کینایەکان بە کوردی سۆرانی سلێمانی نووسراوەتەوە.

هەندێ لە کینایەکان بە هۆی ئەوەی کە بە چەن شێوە لە لایان خەڵکەوە بە کار هێنراون و وشەکانیان جێ بە جێگە بووگن لەم فەرهەنگەدا دووپات و بگرە سێ پاتیش بوویێتنەوە. ئەمە کارێکی ئاساییە هۆی دووپاتبوونەوەشی ئەوەیە کە هەرکەس بە پێ شێوە بە کارهێنانی خۆی کینایەکە لە نێو ئەم فەرهەنگەدا بدۆزێتەوە.

هاورێی بەڕێزم کاک "مەنسووری ڕەحمانی" ئەرکی هەڵەگیری پسپۆڕانە و فەنی کارەکەی بە ئەستۆ گرت و زەحمەتێکی زۆریشی بۆ کارەکە کێشا کە زۆر سپاسی ئەکەم و ڕێز و سپاس بۆ بەڕێوەبەرانی بەشی لێکۆڵینەوە (پژوهش) زانکۆی کوردستان، پسپۆڕان و لێزانان، دوکتۆر عەبدوڵڵا سەلیمی، دوکتۆر ئەحمەد پارسا، دوکتۆر نەجمەددین جەباری و دوکتۆر سەید ئەسعەد شێخ‌ئەحمەدی وە هەروەها سپاس بۆ کاک عەلی سۆرابی و ئەفشین بەهاری زەڕ و هەموو ئەوانەی کە بە هەر شێوەیەك یارمەتی ئەم کارەیان داوە.

ئیبراهیم ئەحمەدی - بەهاری ۱۳۸۶

## پێشەکی:

### پێناسەی کینایە Kenning:

کینایە وشە، جووتەوشە، چەند وشە، دەستەواژە یان ڕستەیەکە کە بێژەر جۆرێك بە کاری ئەهێنێت کە مەبەستی واتای ڕواڵەتی ئەوقسە نەبێت و ئامانجی لەو قسە واتا نهێنییەکەی بێت. کینایە دوو واتای هەیە نزیك و دوور بوێژجۆرێك بە کاری ئەهێنی کە بەردەنگ لە واتا نزیکەکەوە زەینی بەرەو واتا دوورەکە بڕوات لە کینایەدا واتای ڕواڵەتی پردێکە بۆ گەیشتن بە واتا و مەبەستی ڕاستەقینەی نووسەر.

وەکوو: "خوێن گەرمە" واتە: خۆش قسە و ڕووگەشە و خۆش مەشرەبە.

یان: ئاگر لە ماڵیدا ناکرێتەوە: واتە هەژار و نەدارە.

واتای ڕواڵەتی قسەکە ئەوەیە کە ئاگرێك لە ماڵیاندا داناگیرسێ بەڵام واتا کینایییەکەی ئەوەیە کە هیچیان نییە تا لە سەر ئاگری بنێن و بیخۆن و هەژارن.

### جیاوازی کینایە و خوازە (مەجاز Metonymy):

لە خوازەدا واتا ڕواڵەتی قسە بە هیچ جۆرێك مەبەست نییە بەڵام لە کینایەدا واتا ڕواڵەتییەکەی قسەش لە بەر چاو ئەگیردرێ. لە خوازەدا نیشانەیەك هەیە کە ئێمە بە هۆی ئەو

نیشانەیە دەزانین کە مەبەستی بێژەر واتا ڕواڵەتییەکە نییە بەڵام لە کینایەدا هیچ نیشانەیەك کە ئێمە بزانین مەبەستی بێژەر واتا نهێنییەکەیە بوونی نییە.

خواستن (استعارە *metaphor*) جۆرێکە لە خوازەیە کە ئەڵقەی پەیوەندییەکەی وێکچوونە. خواستن بریتییە لە بەکارهێنانی وشەیەك بۆ دەربڕینی واتایەکی تر بێجگە لە واتای ڕاستەقینەی (حقیقی) وشەکە بە مەرجیك ئەڵقەی پەیوەندی نێوان واتای دروست و واتای خوازەیی وشەکە وێکچوون (تشبیە) بێت. دەبێت نیشانەیەکیش بێت کە پیشان بدات کە ئێمە مەبەستمان لەو وشەیە واتا خوازەییەکەیە نەك واتا ڕاستەقینەکە. بۆ وێنە: لە ڕستەی "نەرگسی مەستی ئاماژەی بە کوژرانم ئەکرد" مەبەست لە "نەرگس" چاوە و ئێمە بە هۆی نیشانەگەلێك وەکوو "مەست" و "ئاماژە بە کوژران" دەزانین کە مەبەست لە وشەی نەرگس لەم ڕستەیە گوڵی "نەرگس" نییە. بەڵام لە درکە یان کینایە ئێمە مەبەستمان واتا دووهەمەکەیە. وەکوو: "دەستی گرت" کە بریتییە" لە یارمەتیدان نەك دەست گرتن.

بڕێك لایان وایە کە کینایە تەنیا ئەتوانێت ڕستە یان پارچە قسەیەك بێت بەڵام کینایەی یەك وشەییشمان هەیە. بۆ وێنە: "پیادە" لە ڕستەی" تا بە وقت گفتار و کردار پیادە نمانی"[1] لە زمانی فارسیدا وەکوو کینایە بۆ ئاوەڵناوی "عاجز و بێهێز" بە کار هێنراوە. یا وشەی "قورس" لە کوردیدا کینایە لە مرۆڤێکی ماقووڵ و لەسەرخۆیە.

### ئیهام (*amphilboly*):

لە ئیهامدا بێژەر وشەیەك بە کار دێنێت کە دوو واتای هەیە یەکێکیان نزیك لە زەین و ئەویدی دوور لە زەین و مەبەستی بێژەریش واتا دوورەکەیە و جۆرێ بە کاری دێنێ کە بەردەنگ سەرەتا زەینی بۆ واتا و مەبەستی یەکەمی وشەکە بڕوات و دواتر تێبگات کە مەبەستی بێژەر واتا دوور لە زەینەکەیە.

دوێنێ داستانی <u>شیرینم</u> خوێند/ چاوی نەرگس خومارە

---

1. فرهنگنامه کنایه، منصور میرزا نیا، تهران، چاپخانه سپهر ۱۳۷۸ ص ۸۵۶.

ز گریه مردم چشمم نشسته در خون است

ببین که در طلب حـــال مردمان چونست

مردم: معنی نزدیک به ذهن: **"مردم"** معنی دور از ذهن: **"مردمک چشم"**

**جۆرەکانی کینایە:**

**١. کینایە لە وەسفکراو (ناو):**

ئەو شتەی کە مەبەستی کینایەکەیە ناوی وەسفکراوە و خـودی کینایەکـە ئاوەڵناوێـك یـا کۆمەڵێك ئاوەڵناوە یان ڕستەیەکەی ئاوەڵناویی یـا بەدڵیـە کـە مەبەسـت لەمانـە ناوێکـە (وەسفکراو)

*بۆ وێنە:* دڵڕوون (ئاوەڵناو): کینایە لە کەسێك کە هیواداره. (ئەو کەسە ناوێکە کـە ئاوەڵناوی دڵڕوون وەسفی ئەکات)

**٢. کینایە لە ئاوەڵناو:**

کینایەکە ئاوەڵناوێکە کە مەبەست لەو کینایەیە ئاوەڵناوێکی ترە.

*بۆ وێنە:* بیَ پەڕوباڵ: کینایە لە بێهێز.

بیَ پەڕوباڵ (ئاوەڵناو) بێهێز (ئاوەڵناو)

**٣. کینایە لە فرمان (فعل):**

کـردار چـاوگ ڕسـتە یـان دەسـتەواژەیەك ببێتـە کینایـە بـۆ کـردار چـاوگ ڕسـتە یـان دەستواژەیەکی تر.

ئەم جۆرە کینایەیە باوترین جۆری بەکارهێنانی کینایەیە.

| | |
|---|---|
| *بۆ وێنە:* پشتی لە زەوی دا: بەزاندی. | بەزانـــدی (فرمان) |
| سووتاندی: ئازار و خەمێکی زۆری پیَگەیاند. | سووتاندی (فرمان) |

زۆرێك لە "*ئانە*" و "*ئەشەر*" و "*گۆشە*"ەکان لە زمانی کوردیدا دەچنە ریزی کینایەوە وەکوو: مفتخۆر: کینایە لە مرۆڤی تەوەزەل و هیچنەکەر.

## چۆنیەتی بەدیهاتنی کینایە:

کینایەکان لە زمانی خەڵکەوە لە دایك ئەبن. کینایەکانی خەڵك زۆرتر لە جۆری هێما و ئاماژەن.[1] زۆرێك لەم کینایانە لە ئاکارە مرۆییەکان و تایبەتمەندییە فەرهەنگییەکانی خەڵکەوە هەڵئەقوڵێن و لە ڕوانگەی خەڵکناسییەوە شایانی لێکدانەوەن. کینایەکان سەرەتا و ئەنجامی خۆیانیان هەیە برێك لە کینایەکان سەردەمین و لە داهاتوودا کارایی خۆیان لە دەست ئەدەن. بەئاڵوگۆڕبوونی بارودۆخەکان کینایەگەلێکی تازە دێنە ئاراوە. کینایەگەلی هەر سەردەمێکی مێژوویی و فەرهەنگی خاوەنی تایبەتمەندی خۆیەتی و وەکوو ئاوێنەیەك ڕەنگ و تایبەتمەندییەکانی سەردەمی خۆی پیشان ئەدات. ئەمڕۆکە ئەگەر کەسێك درەنگ لە قسەیەك تێبگا ئەڵێن: "دووقەرانییەکەی دێر دائەکەوێ" و بێ گومان بە پێشەوە چوونی سەردەم و گۆڕانی کۆمەڵگا و تکنۆلۆژی و ... ئەم کینایانەش ئەگۆڕدرێن. کینایە ناسکترین و وردترین هۆکارەکانی ڕەوانبێژییە گەلێك لەوە کاریگەرترە کە تۆ ڕاستەوڕاست ڕاستیەك ئاشکرا بکەیت و بیڵەیت چوونکە ئەم پاڵت پێوە دنێت بیر لە قسەکە بکەیتەوە هەروەها یاریت ئەدات کە ڕای خۆت بەرامبەر شتێك یان ناحەزێك دەرببڕیت لە کاتێکدا کە تۆ نەتەوێت ڕەپوڕاست ئەو شتە بڵەیت.

## کینایە بۆچی دروست بووە؟

کینایە هەم لە قسە ئاساییەکانی خەڵکدا هەیە و هەم لە هۆنراوە و پەخشان هەم لە پەندی پێشینیان و هەم مەتەڵەکان. تەنانەت زۆربەی زۆری مەتەڵە باوەکانیش جۆرێك کینایەن. بە ڕاستی هۆکاری سەرەکی ئەم جۆرە بەکارهێنانەی زمان چییە؟ ئەو هۆکارانەی کە ئەبنە هۆی ناڕاستەوخۆ قسەکردن یان پۆشراوە گوتن چین؟

---

۱. بیان، جلال الدین کزازی، انتشارات سعیدی، تهران، ۱۳۶۸ص ۱۷۴.

"یـــەکـــەم" هۆکـاری ڕەوانبێـــژییە. کینایـــەش وەکـــوو خـــوازە و خواســـتن (اســـتعارە *Metaphor*) و لێکچوون (تشـبیە *Simile*) یەکێ لە توخمەکانی قسەی ویژەییـە. هـەروەها کارتێکەریی کینایە لە قسەی ڕاستەوخۆ و ڕوون زۆرترە. «الکنایة ابلـغ مـن الـصراحة» زمـانی کینایەش جوانتر و ڕەوانتر لە قسەی ئاساییە. "دووهـەم": زەڕیـن کـووب وتـەنی «زۆربـوونی کینایە و هێما لە ئاسەوارەکانی سەردەمێك پێشاندەری زاڵبوون لە سەر ئـەو ترسـەیە کـە لـە دڵی خەڵکی ئەوسەردەمەدا جـێگیر بـووە»[1] بـڕێ جـار قـسەی ڕوون و ئاشـکرا ئەبێتـە هـۆی مەترسی. بێژەر لـەم جـۆرە کاتانـەدا بـە شـێوەیەکی تـەماوی و هێمـایین پەیامەکـەی خـۆی ئەگەیێنێتە گوێی بەردەنگ تا خۆی لـە هـەر جـۆرە گومـان و تۆمەتبارییـەك دوور بخاتـەوە و گیانی بپارێزێ. وەکوو چیرۆکی "شێر و گای کلیلە و دیمنە" کـە چیرۆکێکی هێماییـنە کـە ناڕاستەوخۆ باسی پیلانکاری و سیاسەتە هەڵەکانی دامودەزگای هێندووستانی ئـەو سـەردەمە ئەکات.

کینایەکان لە باری دەروونییەوە کارتێکەرییان لە قـسەی ئاسـایی زۆر بـەهێزترە جـاری وا هەیە ئەبنە هاندەر جاروایە هیوابەخشن و جاریش وایە ئەبنە دارمرکێنەری ئازارە دەروونییەکان و یان چارەسەری کێشەگەلێکی گەورە.

### کینایە و پەندی پێشینیان (*Adage*):

پەندی پێشینیان بە واتای هێنانەوەی قـسەیەکی کـورت و کاکڵـەدارە کـە لـە دەرەنجـامی ئەزموونێکدا بەدی هـاتووە. پەنـدی پێـشینیان قـسەیەکی بـاوی نـاو خەڵکـە و سـەرەکیترین تایبەتمەندییەکانیشی کورتی و ڕوونبوونی واتا و جـوانی و ڕێکـوپێکی پێکهاتـەی قسەکەیە وەکوو ئەم پەندە: "کردە پەشیمان نە نەکردە پەشیمان" کە پەندێکی پێشینیانە بـەڵام کینایـە نییە و بە واتای ئەوەیە کە ئەگەر ئامانجێکت هەیە هـەوڵ و کۆشـشی خـۆت بـدە جـا ئەگـەر

---

1. هەمان صص٨٦٩- ٨٦٧.

سەریش نەکەوتی پەشیمانیت زۆر کەمتر لەوەیە کە بێ هیچ هەوڵێك دایم تامـەزرۆی گەیـشتن بەو ئامانجە بیت.

لە دڵی پەندی پێشینیاندا کینایەی زۆریش بەرچاو دەکەوێ بۆ نموونە:

"دنیای بە هەر دوو دەست هەڵگرتووە" کە مەبەستی مرۆڤی چرووکە.

"تف هەڵخە ئەرچێ" کە مەبست ساردبوونی زۆری هەوایە.

"خۆر لە زینت نەدا" مەبەست ئەوەیە کە هەمیشە سوار و سەرکەوتوو بی.

ئەم فەرهەنگە داگری چـوارهەزارو نۆسـەد کینایەیـە و هیـواردارم تـوانیبێتم مـۆمێکی بچووکم لە ئەدەبیاتی بەسامانی گەلەکەم داگیرساندبێت. بێ گومـان قـەد نـاتوانم بانگەشـەی ئەوە بکەم کە تەنانەت یەك لە چواری کینایەکانی زمانی کوردیم کۆکردبێتـەوە بـەڵام ڕەنگـە هەر ئەوەندە دڵخۆش بم بەڵکوو ڕچەیەکی بـچووکم کردبێتـەوە تـا ڕۆڵـە ئازاکـانی سـەردەم و داهاتوو بەرەو لووتکەی بگەیێنن. بێ گومان کارەکەشم هـەر هەڵـەی تێـدا هەیـە و ڕەخنـە و پێشنیارە کانی ئێوە یاریدەری ئەم دەستە تینووانەن ■

دیاری شوان ئاڵەکۆکە یان فارس وتەنی: "برگ سبزی است تحفەی درویش"

ᘐᘐᘐ

## کورتکراوەکان ـ علائم اختصارية

١- ئەهوەن    کورتکراوەی محەمەد ئینسافجوویی دانەری کتێبی پەند و مووچیاری گەورەکانمان

٢- جلال محمود    کورتکراوەی جەلال مەحموود عەلی دانەری کتێبی ئیدیومی ١و٢

٣- حیرت    کورتکراوەی عەبدولحەمید حیرت سەجادی دانەری کتێبی پەندی پێشینیان بەرگی ١و٢

٤- خاڵ    کورتکراوەی شێخ محەمەد خاڵ دانەری کتێبی پەندی پێشینیان

٥- خاڵ.ف    کورتکراوەی شێخ محەمەدی خاڵ دانەری فەرهەنگی خاڵ بەرگی١و٢و٣

٦- رخزادی    کورتکراوەی عەلی رخزادی دانەری گوارەی کوردەواری

٧- شێخەڵا    کورتکراوەی عومەر شێخەڵا دەشتەکی دانەری پەندی کوردی

٨- فتاحی قاضي کورتکراوەی قادر فتاحی دانەری کتێبی امثال و حکم کوردی بەرگی ١و٢

٩- کریمپور    کورتکراوەی کەریم کریمپور دانەری فەرهەنگی خۆرهەڵات

١٠- معروف    کورتکراوەی عەلی معروف شارەزووری دانەری کتێبی پەندی پێشینیان

١١- مردوخ    کورتکراوەی شێخ محەمەد مەردۆخ دانەری کتێبی فەرهەنگ مەردۆخ بەرگی١

١٢- نانەوازادە    کورتکراوەی عەلی نانەوازادە دانەری کتێبی فەرهەنگی هەرمان

١٣- هەژار    کورتکراوەی عەبدوڕڕەحمان شەرەفکەندی دانەری کتێبی هەنبانە بۆرینە. فەرهەنگ کوردی ـ فارسی

# ئا

**ئابڕووی بردە سەر لقی دار:** [بڕێتی لە یەکێك کە ئابڕووی کەسێکیتر بە لای خەڵکەوە ببات]: کنایە از این کە پیش مردم آبرویی برای او باقی نگذاشت. (فتاحی قاضی. بەرگی ٢. ٦)

**ئابڕووی چووە:** بڕێتی لە یەکێك کە سووك و ڕسوا و سەرشۆڕی ناو کۆمەڵ بووە (جلال محمود. بەرگی ١. ٣١): [کنایە از بی‌آبرو].

**ئاخر خێر:** بڕێتی لە نزا و دۆعای چاکە بۆ یەکێك، بە پیرێك دەوترێت کە چاکە بکات و لەوە دوور بێت کە خراپەی بۆ کەس هەبێت (جلال محمود. بەرگی ١. ٣١): [کنایە از دعای خیر برای کسی یا پیری کە اعمال نیک انجام دهد و از بدی بدور باشد].

**ئاخرشەڕ:** بڕێتی لە نزا و دۆعای خراپە بۆ یەکێك، بە پیرێك دەوترێت کە خراپەی لێ بووەشێتەوە (جلال محمود. بەرگی ١. ٣١): [کنایە از دعای شر برای کسی و پیری کە اعمال بد انجام دهد].

**ئاخوئۆفی لێ بڕی:** [واتە: ئەوەندەی لێدا تەنانەت نەیتوانی بگری]: کنایە از کتک زدن کسی بە طوری کە حتی توان نالە و زاری نداشتە باشد. (فتاحی قاضی. بەرگی ٢. ٦)

**ئاخور لێگۆڕان:** هەوایەکی دیکە لە کەللەدا بوون و خۆ لێگۆڕان (ئاتەمرتزادە. ٤٥): [کنایە از خیال و آرزوی پراکندە در مغز داشتن و تغییر پیدا کردن].

**ئاخوڕی بەرزە:** ١) واتە زۆر تەماعکار و چڵێسە، بە یەکێك دەوترێ کە بە بەشی کەم دانەکەوێت ٢) فیزن، لووت بەرز (جلال محمود. بەرگی ٢. ١١): ١) [کنایە از شخص طمعکار کە بە سهم اندک قناعت نکند] ٢) [متکبر و خودخواه].

**ئاخوڕی خۆی تێك داوە:** لە خۆی گۆڕاوە (جلال محمود. بەرگی ٢. ١١): [کنایە از تغییر کردە و عوض شدە].

**ئاخوڕی خۆی گوم ناکات:** دابونەریت و ڕەسەنایەتی خۆی ئەپارێزێت و خۆی لێ لانادات (جلال محمود. بەرگی ٢. ١١): [کنایە از کسی کە آداب و رسوم اصل و نسب خود را حفظ کند].

**ئاخوڕی خوارە:** بڕێتی لە کارێکی چەوت و چەواشە (جلال محمود. بەرگی ١. ٣٢): [کنایە از کسی کە کار برعکس انجام دهد].

**ئاخوڕی چەورە:** بە یەکێك ئەوترێ، کە ساماندار و سایەچەور بێ (خال. ١٥): [کنایە از آدم ثروتمند].

**ئارەقی ڕەش و شینی کردووە:** ١) زۆر ماندوو بوو: ١) [بسیار خستە شد] ٢) زۆر شەرمەزار بوو (جلال محمود. بەرگی ١. ٣٢): ٢) [بسیار شرمندە شد و خجالت کشید].

**ئارەقی کرد:** ١) شەرمەزار بوو. تەریق بووەوە (جلال محمود. بەرگی ١. ٣٢): [شرمندە و خجالت‌زدە شد].

**ئارد بێخ دڕك (ئاردی ناو دڕك):** بە کارێکی بێ سوود ئەوترێ: پەرت و پەڵا بوون (ڕەخزادی. ١٨): [کنایە از کار بیهودە].

**ئاردی بە هارووییە:** [ئاردی گەنمە بەهارەیە]: لای ئێمە دەڵێن گەنمی قەندەهارییە: واتە هەموو شتێکی لێ دێت (جلال محمود. بەرگی ٢. ١١): [کنایە از چیزی یا کسی کە بە درد همە چیز می‌خورد].

**ئاردی خۆم دابێژتووە:** واتە کاری خۆم بە ئەنجام گەیاندووە و دەستبەتاڵم، لێبووەمەتەوە (جلال محمود. بەرگی ٢. ١١): [کنایە از این کە کار خود را انجام دادەام و بیکارم و از آن فارغ شدەام].

**ئاردی ڕۆیگە و سۆسی ماگە:** ئەوەی کە باش و خاوێن بووە ڕۆیشتووە و خراپەکەی ماوەتەوە (ڕەخزادی. ١٨):

[کنایە از بدلش ماندە و اصلش از بین رفتە].

**ئارون و قارون:** برێتی لە یەکێکی زۆر دەوڵەمەند و دارا: کنایە از بسیار ثروتمند. (مەژار.٤)

**ئاسانەی سووکە:** برێتی لە ئافرەتێك کە بە ئاسانی منداڵی ببێت (جلال محمود. بەرگی١. ٣٣): [کنایە از زنی کە بە آسانی زایمان کند].

**ئاسانەی گرانە:** برێتی لە ئافرەتێك کە بە گران و درەنگ منداڵی ببێت (جلال محمود. بەرگی١. ٣٣): [کنایە از زنی کە بە سختی زایمان کند].

**ئاسمان ئەستوونی دەوێت:** بۆ سەرسووڕمان لە شتێ دەوترێت. برێتی لە قسەیەك یا کارێك کە زۆر ستەمە و پیاو سەرسام دەبێت کە چۆن کراوە (جلال محمود. بەرگی١. ٣٤): [هنگام تعجب گفتە می‌شود. کنایە از لحن یا کاری کە بسیار دشوار است و انسان از انجام گرفتن آن متعجب خواهد شد].

**ئاسمان بە چاتۆڵ دەزانێت:** بە یەکێك دەڵێن کە فیزی زل و دەماری گەورە بێت (جلال محمود. بەرگی٢. ١١): [کنایە از آدم متکبر].

**ئاسمان بەری خست:** بە بارانێکی زۆر کەم دەوترێ ئاسمان بەری خستووە و ئاوی پێوە نەماوە (جلال محمود. بەرگی٢. ١١): [کنایە از باران کم و ناچیز].

**ئاسمان سەرەخەرێتی و زەویی ژێرەخەر:** بە یەکێك ئەوترێ کە زۆر هەژار و ڕەجاڵ بێ (خاڵ.١٨): [کنایە از شخص بسیار فقیر].

**ئاسمان لێ نادا لە زەوی:** واتە ئاسمان هەوری زۆر و بارانێکی قورسی پێوەیە (جلال محمود. بەرگی٢. ١١): [کنایە از آسمان بسیار ابری است و باران سنگینی را بە همراه دارد].

**ئاسمان لێف بێت دای‌نا پۆشێت:** برێتی لە یەکێك کە پاشڵی هێندە پیسە ئابڕووی چووە. بەد ناو بووە و ناوی زڕاوە (جلال محمود. بەرگی١. ٣٤): [کنایە از کسی کە بغلش بە حدی بدبوست کە موجب آبروریزی و بدنامی او شدە است].

**ئاسمان لێف:** برێتی لە یەکێکی نەدار و فەقیر: کنایە از انسانی تنگدست و فقیر.

**ئاسمان و ڕێسمان:** برێتی لە جیاوازی و دووری دوو شت (خاڵ.ف.٤٩): [کنایە از جدایی بین دو چیز].

**ئاسنی سارد دەکوتێ:** برێتی لە خەریکبوون بە ئیش و کاری بێهوودە و پڕوپووچ (خاڵ.١٨): [کنایە از بە امری بیهودە مشغول شدن].

**ئاسیاو (ئاشی ئاو) بێ‌ئاوی ئاگەسەوە:** ئاژاوەیەکی بێهۆی ناوەتەوە (جلال محمود. بەرگی٢. ١١): [کنایە از بی‌دلیل آشوب بە پا کردن].

**ئاسیاو بە نۆرە:** برێتی لەوەی کە لە هەموو کارێکدا نەزم پێویستە (رخزادی.٢٠): [کنایە از این کە در هر کاری نظم و انضباط لازم است].

**ئاسیاوی ئاوکەوتوو:** [برێتی لە جێگایەك کە لە هەوەڵەوە قەرەبالغ و جەنجاڵ بوویێت بەڵام ئێستا بێ دەنگ و هێمن بێت]: کنایە از محلی کە قبلاً پرهیاهو بودە اکنون آرام و بی‌صدا شدە است. (حیرت.٤)

**ئاش بە با دەگێرێت:** برێتی لە یەکێکی بێباك کە کارەکەی بێ‌خاوەن مابێتەوە پێك نەیەت. بۆ تەشەرە (جلال محمود. بەرگی١. ٣٥): [کنایە از آدم بی‌باك کە کارش معطل ماندە باشد و انجام نگیرد، برای طعنە است].

**ئاش‌بەتاڵ:** [برێتی لە کارێك کە تێك چووە یا هەڵشێواوەتەوە]: کنایە از کاری کە بهم خوردە و از

هم پاشیده. (فتاحی قاضی. بەرگی١. ٣)

**ئاشبەتاڵی لێ کرد:** برێتی لە یەکێك کە وازی لە کارەکەی هێناوە و دەسی لێ هەڵگرتووە و بە نیوەچڵی جێی هێشتووە (جلال محمود. بەرگی١. ٣٥): [کنایە از کسی کە از کارش دست برداشتە و نیمە کارە آن را رها کردە است].

**ئاشبگیریان کرد:** تالانیان کرد. ماڵیان وێران کرد (جلال محمود. بەرگی١. ٣٥): [کنایە از او را غارت کردند، خانە و کاشانەی او را ویران کردند].

**ئاشتی کتك و مشك:** [برێتی لە ئاشتی دەمدەمی نێوان دووکەس]: کنایە از آشتی و دوستی ظاهری و موقتی میان دو نفر. (حیرت.٦)

**ئاشکرابوون:** برێتی لە ئاشکرابوونی عەیب و کارێك: کنایە از فاش شدن عیب یا مشکلی.

**ئاشی بۆ ناوەتەوە:** واتە گێرە و کێشەیەکی بۆ ساز کردووین، پیلانێکی ئەوتۆی بۆ ناوینەتەوە و گرفتاری کردووین (جلال محمود. بەرگی١. ٣٥): [کنایە از این کە گرفتاری و مشکلی برایمان درست کردە، توطئە و دسیسەی او، موجب مشکل و گرفتاری ما شدە است].

**ئاشی پێ دەگەڕێ:** [برێتی لە زۆربوونی شتێك]: کنایە از زیاد بودن چیزی. (فتاحی قاضی.١٢٦)

**ئاشی زۆردار:** برێتی لە دەسەلات و حکوومەتی زۆردارانە: کنایە از قدرت ظالم.

**ئاشی کرپیوە:** ١) زوو زوو قسەکردن و نۆرەی کەس نەدان ٢) زوو زوو بە پەلە نان خواردن: ١) کنایە از پرگویی و فرصت بە دیگران ندادن ٢) کنایە از عجول بودن در غذا خوردن.

**ئاغا باڵاسەر:** برێتی لە یەکێك کە خۆی گەورە بنوێنێت (جلال محمود. بەرگی٢. ١٢): [کنایە از کسی کە خود را بزرگ جلوە دهد و فرمان دهد].

**ئاغا بەڵێیە:** واتە: [هەرچی بڵێین ئەم مۆری دەکات. بێ‌لێکدانەوە، بڕوای پێدەکات] (جلال محمود. بەرگی٢. ١٢): [کنایە از کسی کە هرچە بگویند تایید کند و بدون تحقیق آن را بپذیرد].

**ئاگای لە فتنگی خۆی نییە:** واتە بێ‌هۆشە وریا نییە (جلال محمود. بەرگی٢. ١٢): [کنایە از آدم ناآگاه و بی‌خبر].

**ئاگر ئەکاتەوە:** بە یەکێکی زۆر تووڕە ئەوترێ (خاڵ.٢٣): [کنایە از آدم بسیار خشمگین].

**ئاگر بارانە:** ١) برێتی لە شەڕ و تەقە و فەرتەنەیە: ١) [کنایە از جنگ و آشوب] ٢) هەوا زۆر گەرمە (جلال محمود. بەرگی١. ٣٨): ٢) [کنایە از بسیار گرم بودن هوا].

**ئاگر بە دەس مەردم هەڵ ئەگرێ:** کاری پڕ مەترسی بەم و بەو دەکات (جلال محمود. بەرگی٢. ١٢): [کنایە از کسی کە کارهای پرمخاطرە را با این و آن انجام می‌دهد].

**ئاگر بەرپا کردن:** برێتی لە ئاژاوە نیانەوە: کنایە از آشوب بە پا کردن.

**ئاگر بەری داویە لە سەری:** ١) برێتی لە یەکێك کە بە هۆی سێکسەوە شەرم و شکۆی پێ هەڵگیرابێت: ١) [کنایە از کسی کە بە واسطە آتش شهوتش بی‌پروا و بی‌شرم شدە باشد] ٢) کاری نابەجێ بکات و لای خەڵك سووك و ریسوا بێت (جلال محمود. بەرگی٢. ١٢): ٢) [کنایە از کسی کە کار ناشایست انجام دادە و همین موجب بی‌آبروی و رسوایی او در میان مردم شدە باشد].

**ئاگرتێبەربوون:** برێتی لە ڕق هەستان و ئاڵۆزی: کنایە از خشمگین و پریشان بودن.

**ئاگرپاره:** برێتی له یه‌کێکی هاروهاج، وریا و زیت: کنایه از انسان زبر و زرنگ.

**ئاگرپه‌رست:** برێتی له گاور: کنایه از زردشتی.

**ئاگر تێبه‌ر بوو:** ۱) تووڕه بوون: ۱) [کنایه از عصبانیت]. ۲) دل پێسووتان، زگ پێسووتان: به‌زه‌یی به که‌سێکدا هاتن (نانەوزادە.۱۰۳): ۲) [کنایه رحم کردن و دلسوزی کردن].

**ئاگر تێبه‌ردان:** ئازادانی که‌سێك به قسه یا کرده‌وه‌یه‌ك، چزاندن (نانەوزادە.۱۰۳): [آزار رسانیدن، کنایه از اندوهگین کردن کسی با قصه یا رفتار نامناسب].

**ئاگر تێچوون:** به‌خیلی و ئیره‌ییبردن به که‌سێك (نانەوزادە.۱۰۳): [کنایه از بخل و حسد به کسی ورزیدن].

**ئاگر جه‌رگی هه‌لگرت:** تاسه‌ی دیتنی منداڵ کردن (نانەوزادە.۱۰۵): [کنایه از آرزوی دیدار فرزند را داشتن].

**ئاگر خۆش ده‌کات:** برێتی له یه‌کێك که هانه هانه بدات و ئاشووبه‌که گه‌رمتر بکات. شه‌ڕ تیژ بکات و گۆبه‌ند بگێڕێت (جلال محمود. به‌رگی۱. ۳۷): [کنایه از کسی که طرفین دعوا را تحریک کند تا آشوب را شعله‌ورتر کند].

**ئاگر خۆش کردن:** هه‌ڵایسان و خۆشکردنی ناکۆکی و دووبه‌ره‌کانێ نێوان دوولایه‌ن که به‌ینیان خۆش نییه (نانەوزادە.۱۰٤): [کنایه از ایجاد آشوب میان دو نفر که با هم اختلاف دارند].

**ئاگر دان:** برێتی له تووڕه کردن: کنایه از عصبانی نمودن.

**ئاگر ده‌نێته‌وه:** ۱) برێتی له ئاژاوه و ئاشووب به‌رپا کردن و خه‌ڵك به گژیکدادان: ۱) [کنایه از آشوب به پا کردن و مردم را با هم درگیر کردن]، ۲) دوو زمانی ده‌کات (جلال محمود. به‌رگی۲. ۱۲): ۲) [کنایه از دورویی کردن].

**ئاگر زمانه:** دوو زمانه، ئاژاوه‌گێڕه (جلال محمود. به‌رگی۲. ۱۲): [کنایه از منافق و دورو و آشوبگر].

**ئاگر غه‌زه‌بی لێ به‌ربێ:** تووشیاری به‌ڵای خودایی بێ، جۆریکی دۆعای شه‌ڕه (نانەوزادە.۱۰۵): [کنایه از گونه‌ای نفرین].

**ئاگر که‌فتگه گیانی:** برێتی له یه‌کێك که سه‌ره‌وتی له به‌ر برابێ: کنایه از کسی که آرام و قرار نداشته باشد.

**ئاگر کردنه‌وه:** ساز کردنی شه‌ڕ، برێتی له په‌ره‌دان به شه‌ڕ و کۆنه‌قین نێوان دووکه‌س، فیتنه نانه‌وه، ئاگر نانه‌وه (نانەوزادە.۱۰٤): [کنایه از آشوب به پا کردن].

**ئاگرکردنه‌وه:** [برێتی له ئاژاوه‌نیانه‌وه]: کنایه از آشوب به پا کردن. (فتاحی قاضی. به‌رگی۲. ۹)

**ئاگر گرتن:** ۱) ئیره‌یی بردن تووڕه‌بوون و هه‌ڵچوون، توندوتیژبوون (نانەوزادە.۱۰٤): ۱) [کنایه از حسودی بردن] ۲) [کنایه از خشمگین بودن].

**ئاگر گۆشت نه‌برژێنێ:** واته هه‌ڕه‌شه و گوڕه‌شه‌ی بێ‌به‌هایه لێ مه‌ترسه (جلال محمود. به‌رگی۲. ۱۲): [کنایه از این که تهدیدهای او بی‌پایه است نترس].

**ئاگر له بان پشتیه‌وه بکه‌ره‌وه:** [برێتی له که‌سێك که ته‌مه‌ڵ و بێ جوربزه و ده‌ماروشك بێت که له بابه‌تێکا ده‌بێ لێی بدرێ]: کنایه از شخص تنبل و بی‌غیرت و تعصب و خونسرد در همه موارد، او را تنبیه کن. (حیرت.۸)

**ئاگر له بان زگی ده‌کاته‌وه:** ۱) برێتی له که‌سێك که سوور بێت له‌سه‌ر نکوولکردنی تاوانێ: ۱) [کنایه از

کسی که اصرار بر انکار گناه کند]. ۲) سووربوون و دانەبەزین لە سەر بڕیار و قەراری خۆت (جلال محمود. بەرگی۲. ۱۲): ۲) [پافشاری و اصرار بر عقیده و قول خویش].

**ئاگر لە چاوی ئەباری:** بە یەکێك ئەوترێ کە ئەوەندە تووڕە بووبێ چاوی سوورهەڵگەڕابێ: (خاڵ. ۲۳/ جلال محمود. بەرگی۲. ۱۲/ رخزادی. ۲۲ /حیرت.۸) کنایە از آدم خشمگینی کە از شدت خشم چشمانش قرمز شدە باشد.

**ئاگر لە دەمدا بوون:** زۆر توند قسە کردن، توند توند قسە کردن (ئانەوزادە.۱۰٤): [کنایە از سریع سخن گفتن مجال بە کسی ندادن].

**ئاگر لە دەمی واری (دەبارێت):** بریتی لە یەکێکی دەم شڕ: کنایە از آدم دهن‌لق.

**ئاگر لە سەر پشتی بکەرەوە:** بە یەکێکی حیزی تەمبەڵ و بێ نرخ ئەوترێ کە هیچی لە دەست نەیەت (خاڵ.۲۳/ رخزادی.۲۲): [کنایە از شخص تنبل و بی‌غیرت کە در همە موارد او را می‌توان تنبیە کرد].

**ئاگر لە سەر پشتی دەکەمەوە:** ۱) واتە خراپی بە سەردەهێنم: ۱) [کنایە از این کە با او بد رفتار می‌کنم]، ۲) سزایەکی ئەوتۆی دەدەم کە هەرگیز لە بیری نەچێتەوە (جلال محمود. بەرگی۲. ۱۲): ۲) [کنایە از آنچنان بلایی بر سر او می‌آورم کە هرگز یادش نرود].

**ئاگر لە کای کۆن بەر نەبێ:** بە کۆنە عاشقێك یا خەفەتبارێك ئەوترێ کە عشقەکەی یا خەفەتەکەی تازە بووبێتەوە. (خاڵ.۲۳) [کنایە از عاشقی یا غمگینی کە عشقش یا غمش دوبارە تکرار شود].

**ئاگر لە کوولەکەی تەڕدا دەکاتەوە:** واتە زۆردار و چەوسێنەر (جلال محمود. بەرگی۲. ۱۲): [کنایە از آدم ظالم].

**ئاگر نەکەفێتە سەرێوان کۆنە:** ۱) یاخوا ئەوەی خانەدانە لە بەین نەچێت: ۱) [خدایا، خانوادەهای اصیل را محفوظ کن] ۲) کۆنە عاشقێك یان بریندارێك برینەکەی یان خەفەتەکەی تازە نەبێتەوە (جلال محمود. بەرگی۲. ۱۲): ۲) [کنایە از عاشقی یا بیمار و زخمی‌ای کە زخمش یا غم و غصە‌اش تازە نشود].

**ئاگر و پووشن:** ناکۆك و ناتەبان هەر کە گەیشتنە یەك، بەگژ یەکدا دەچن و چنگ دەدەنە یەك (جلال محمود. بەرگی۲. ۱۲): [کنایە از عدم موافقت و ضد و نقیض بودن دو نفر کە بە محض رسیدن بە هم با هم گلاویز می‌شوند].

**ئاگر وە تێن دان:** پەرەدان بە ناکۆکی نێوان دوولایەن (ئانەوزادە.۱۰۳): [کنایە از دامن زدن بە اختلاف میان دو طرف].

**ئاگر هاتن (بۆ ئاگر هاتن):** زۆر بەپەلەبوون و نەگیرسانەوە لە شوێنێك (دەتگوت بۆ ئاگر هاتبوو و هەر نەهاتە ژووری) (ئانەوزادە.۱۰٤): [کنایە از تعجیل داشتن و نماندن در جایی].

**ئاگرەکە کوژیاوە:** واتە: [ئاژاوەکە خموت]: کنایە از پایان آشوب و بلوا. (حیرت.۹)

**ئاگرەکەی کوژاندەوە:** بریتی لە ئاژاوەیەك یا شەڕێك بڕێتەوە و دایمرکێنی (جلال محمود. بەرگی۱. ۳۸): [کنایە از کسی کە آشوب یا دعوایی را خاتمە دهد].

**ئاگری بە پووشوپڵاشەوە نا:** ۱) ئاژاوەیەکی گەورەی نایەوە [کنایە از آشوب و بلوای بزرگی بە راە انداخت]. ۲) ئاگری ئاژاوەی هەڵگیرساند: (جلال محمود. بەرگی۲. ۱۲): [کنایە از آتش آشوب را برافروخت].

**ئاگری بەی بۆسۆی لێ هەڵنەسێ:** بریتی لە یەکێکی زۆر

فەقیر و هەژار (رخزادی،٢٢): [کنایه از فرد بسیار فقیر].

**ئاگری بێئامان تێیەر بوون:** تووشی بەڵا و بەدبەختیەکی گەورە هاتن (ئانەوزانە،١٠٥): [کنایه از به بلا و مصیبت بزرگی دچار شدن].

**ئاگری بێدووکەڵ:** بۆ نەهاتییەکی کوتوپڕ دەوترێ، واتە لە ناکاو و بێ ئاگا ئەو نەهامەتییە سواری شانی بووە (جلال محمود. بەرگی٢. ١٢): [کنایه از ناگهان و بی‌خبر بدشانسی به کسی روی آورد].

**ئاگری پێوە بنێت بۆسۆی هەڵناسێت:** بریتی لە یەکێکی زۆر ڕووت و ڕەجاڵ و هەژار (جلال محمود. بەرگی١. ٣٨): [کنایه از آدم بسیار فقیر و ندار].

**ئاگری دا:** واتە تووڕەی کرد و ڕقی هەستاند: کنایه از به هیجان آوردن و عصبانی کردن کسی.

**ئاگری دێزە خۆش دەکات:** ١) ئاژاوە دەنێتەوە: ١) [کنایه از این که آشوب بپا می‌کند] ٢) بەڵای ڕك و کینە و دووبەرەکی و ناتەبایی هەڵ دەستێنێت (جلال محمود. بەرگی٢. ١٢): ٢) [کنایه از کسی که آتش فتنه و اختلاف بپا می‌کند].

**ئاگری گرتووە:** ١) بریتی لە یەکێك کە زۆر ببزوێت: ١) [کنایه از کسی که بسیار جنب جوش داشته باشد] ٢) سزای خەڵك بدات و خراپە وئازاری هەبێت (جلال محمود. بەرگی١. ٣٧): ٢) [کنایه از کسی به دیگران رنج و آزار می‌رساند].

**ئاگری لە دەمدایە:** ١) بریتی لە یەکێکی دەمهەراش: ١) [کنایه از آدم زبان دراز] ٢) بریتی لە یەکێکی بێشەرم و ئابڕوو (جلال محمود. بەرگی١. ٣٩): ٢) [کنایه از آدم بی‌شرم و آبرو].

**ئاگری لێ دەبێتەوە:** دەمارگیر بووە، بە گڕ دار و بەردا دەچێت (جلال محمود. بەرگی٢. ١٢): [کنایه از آدم متکبر که با همه کس و همه چیز در گیر شود].

**ئاگری نیا جەرگمەوە:** واتە پەژارەیەکی زۆری پێ دام و دڵمی تەزاند: کنایه از غم و غصەی بسیاری به من داد.

**ئاڵاهەڵگر:** بریتی لە سەرۆك دەسپێکەر و دامەزرێنەری ڕێبازێك (ئانەوزانە،١١٤): [کنایه از رهبر و آغازگر حرکت و جنبش و...].

**ئاڵقە لە گوێ:** فەرمانبەر، گوێ بیست، گوێ لە مشت، بەندە: کنایه از مطیع و غلام

**ئالیکی (ئالف) دوو وڵاخی پێ بەش ناکرێ:** بریتی لە یەکێکی بێکارە و بێدەسەڵات (جلال محمود. بەرگی٢. ١٣): [کنایه از آدم بیکار و ناتوان].

**ئامە و ماڵم کوتی قاڵیە/ئەیخەمە ئەملا و ئەولا خاڵییە:** بریتی لە یەکێك کە زۆر هەژار بێ (جلال محمود. بەرگی٢. ١٣): [کنایه از آدم بسیار ندار].

**ئامیانی حەوت قازان شیرە:** بریتی لە یەکێکی زۆر فێڵباز: کنایه از آدم بسیار مکار.

**ئاو:** ١) بریتی لە ئابروو ٢) بریتی لە ئاوی پشت: ١) کنایه از آبرو ٢) کنایه از نطفه و آب منی.

**ئاو ئەجاوێ:** بریتی لە کەسێکی مفتەوێژ و بێ کەڵك: کنایه از آدم بیهوده گو و بی‌سود.

**ئاو ئەکاتە سەوەتە:** بە یەکێك ئەوترێ کە ڕنجێکی بێهوودە بدا (خاڵ،٢٤): [کنایه از بیهوده دست زدن به کاری].

**ئاواتی برپیا:** [ئاواتی با بردی و هیوای لە دەس دا]: آرزویش بر باد رفت و ناکام ماند. (حیرت،١١)

**ئاواتی هاتە دیین:** [بە هیوای خۆی گەیی]: کنایه از امیدش برآورده شد. (حیرت،١١)

**ئاو بێرا و دەس شۆرە:** ١) ئاو بێنە و دەست بشۆرە بریتی لە تەواوبوونی ئیش و کار: ١) [کنایه از به اتمام

رسیدن کار]. ٢) بەشتێك ئەوترێ کە هیچی نەمابێ (رخزادی.٢٤): ٢) [کنایه از چیزی که هیچی از آن نمانده باشد].

**ئاو بوێسێ ئەو ناوێسێ:** برێتی لە یەکێکی گورج و گۆڵ: سەرەوت بە خۆی نادات: کنایه از فرد چست و چالاک که آرام و قرار ندارد.

**ئاو بە ئاگردا کردن:** [برێتی لە کوژاندنەوەی ئاژاوە و کەتن]: کنایه از خوابانیدن فتنه و آشوب. (فتاحی قاضی. بەرگی١. ٥)

**ئاو بە ئاوەدانیا ئەچێ:** واتە تێر ئارەزووی ئاوخواردنەوە ئەکات نەك برسی (خاڵ.٢٤): [کنایه از آدم سیر تشنەی آب است نه گرسنه].

**ئاو بە ئاوەرێژەدا ئەچێ:** برێتی لە هەموو چتێ بە رێگەی خۆیا ئەروا (رخزادی.٢٤): [کنایه از هر چیزی در مسیر خود می‌رود].

**ئاو بە بێژنگا کردن:** برێتی لە یەکێك کە رەنجێکی بێهوودە و بی‌کەڵك بدات (خاڵ.٢٢): [کنایه از کار بیهوده کردن].

**ئاو بە ژێر کادا دەبات:** برێتی لە یەکێك کە بە نهێنی کار دەکات، پیلان دەگێرێت (جلال محمود. بەرگی١. ٤٥): [کنایه از کسی که مخفیانه توطئه‌چینی کند].

**ئاو بە شۆنا کردن:** برێتی لە خواردنی ماڵ یا شتێکی یەکێك: کنایه از خوردن مال دیگران.

**ئاو بە گوریس بەستن:** برێتی لە خەریکبوون بە ئیش و کاری پروپووچ: کنایه از کار بیهوده کردن، به امر غیر ممکن دست زدن.

**ئاو بە مل ئاگردا کردن:** ئاژاوەکە کوژایەوە (رخزادی.٢٦): [کنایه از خاموش شدن آشوب و بلوا].

**ئاو پاکی کردە دەسیا:** نائومێدی کرد (جلال محمود. بەرگی٢. ١٣): [کنایه از ناامید کردن و جواب رد دادن].

**ئاو پاکیم کردە دەسیا:** دڵنیایم کرد و ئەوەی کە ئەبێ بیڵێم پێم وت (رخزادی.٢٥): [کنایه از مطمئن کردن].

**ئاو پرژێنی دڵی کرد:** زۆر خۆشحاڵ و شادمانی کرد (جلال محمود. بەرگی٢. ١٤): [کنایه از آرامش پیدا کردن و شاد شدن].

**ئاو چووە مل ئاگرا:** ئاو کرا بە ئاگرا برێتی لە کەسێك کە لەو هەو و تەو کەوت (رخزادی.٢٥): [کنایه از آرام گرفتن].

**ئاوچاوسەندن:** برێتی لە کەسێ کە ترسێنراوە (خاڵ.ف.٦٢): [کنایه از ترساندن].

**ئاوچاوی سنیاگە:** [ئەویان ترساندووە]: کنایه از او را ترسانده‌اند، مرعوب شده. (حیرت.١٢)

**ئاو خستگیە لاوە:** [بە کەسێك دەڵێن کە لەسەر کار دەریان کردبێ]: کنایه از کسی که از کار برکنار شده. (حیرت.١٢)

**ئاو خواردنەوەیە:** کارێکی زۆر سانا و هاسان: کنایه از کار سهل و ساده.

**ئاو داگیەسە لاوە:** [لە کار لایان بردووە]: کنایه از کسی که از کار برکنار شده. (حیرت.١٢)

**ئاو دە ئاشی زۆردار کردن:** یارمەتی زۆردار و دەسەڵاتداردان: کنایه از کمک کردن به حاکم ظالم.

**ئاو دە گیرفانی کەسێك وەردان:** هەموو پووڵ و پارەی کەسێك وەرگرتن و گیرفان بە تاڵ کردن (نانەوازانە.١٣٩): [کنایه از پول کسی را گرفتن و جیب او را خالی کردن].

**ئاو دەم مردگ:** [برێتی لە جەوهەری کەمرەنگ یان چای کەمرەنگی سەردەوە بووە]: کنایه از مرکب کم‌رنگ یا چای سرد و کم‌رنگ. (حیرت.١٢)

**ئاو ژێر کا:** برێتی لە یەکێکی زۆر فێڵباز و ئاژاوەگێڕ کە کەس پێی نەزانێ و لە ژێرەوە کار بکا، بە نهێنی کار دەکات و پیلان دەگێڕێت (رخزادی.٢٢): [کنایە از آدم بسیار مکار و آشوبگر کە مخفیانە بە توطئەچینی می‌پردازد].

**ئاو زابیە دەمی:** زۆر حەز کردن لە شتێ (جلال محمود. بەرگی٢. ١٣/ مریوخ.١٠): [کنایە از میل وافر بە چیزی، یا غذایی یا بهرە و سودی].

**ئاو زابیە چاوی:** [واتە خەم و پەژارەی کەسێکی هاوردە پێش چاو]: کنایە از حالت تأثر کسی را مجسم کردن. (حیرت.١٣)

**ئاو زەنگیی لێ دا:** خێرا بۆی دەرچوو و گورج شانی پێدا کرد (جلال محمود. بەرگی٢. ١٣): [کنایە از سریع بە دنبال کاری رفتن و آنرا شروع کردن].

**ئاور بن کای (ئاگری ژێر کا):** برێتی لە کەسێك کە زۆر فێڵەباز و ئاژاوەگێڕ بێ و کەس پێی نەزانێ. (جلال محمود. بەرگی١. ٤٠): [کنایە از شخص نیرنگ‌باز و آشوب‌طلب کە کسی او را نمی‌شناسد].

**ئاور دەکوولەکەی ئەوردا دەکەنەوە:** برێتی لە کارێك کە هەرگیز نەکرێ (جلال محمود. بەرگی٢. ١٤): [کنایە از کاری کە انجام دادن آن غیر ممکن باشد].

**ئاورشتن:** برێتی لە دیاری کردنی رێگا و شوێن بۆ کەسێك: کنایە از اعمال نفوذ در کار دیگران.

**ئاورکردنەوە:** برێتی لە یەکێك کە کاری ئاژاوە نیانەوەیە: کنایە از فتنە و آشوب بە پا کردن.

**ئاوروو جەم ئەکا:** [برێتی لە یەکێك کە ڕەفتار و ئاکاری جوانی هەیە]: کنایە از حسن سلوک دارد. (حیرت.١٣)

**ئاورووی داماڵیاگە:** [برێتی لە یەکێکی بێ شەرم و ئابڕووە]: کنایە از شخص وقیح و بی‌شرم. (حیرت.١٣)

**ئاوساوە:** واتە بە هۆی داخ و خەفەت وەڕس و بێزارە (جلال محمود. بەرگی١. ٤٦): [کنایە از کسی کە بە واسطە غم و غصە پکر شدە است].

**ئاوکردنە ژێر کەسێ:** برێتی لە جێی پێ لەق کردن (رخزادی.٢٨): [کنایە از برکنار کردن کسی و بدگویی کردن از کسی].

**ئاوهێنانەوە:** برێتی لە دەسپەڕ،خۆ ڕەحەت کردن بە دەست (خال.ف.٦٧): [کنایە از استمنا].

**ئاوی بۆ ڕژاوە:** واتە وا فێرکراوە، وا بۆی لواوە (جلال محمود. بەرگی٢. ١٤): [کنایە از این کە این گونە یاد گرفتە].

**ئاوی بێ‌لەغاو خواردنەوە:** ئەنجام دانی کارێك بەکەیف و ئارەزووی خۆ و گوێ نەدان بە قسەی کەس (خال.٢٧/ ئانوزادە.١٤١): [کنایە از کاری را با میل و آرزوی خویش انجام دادن و گوش بە حرف کسی ندادن].

**ئاوی بەستگەسە ژێری (ئاوی کردە ژێری):** برێتی لە کەسێك کە کەم کەم خەریکە کارێ ئەکا. کە کەسێکی تر لە سەرکار دەرکا (رخزادی.٢٨): [کنایە از کسی کە بە تدریج اقدام بە اخراج کسی دیگر بکند].

**ئاوی تاڵ و سوێرمان پێکەوە خواردۆتەوە:** دۆستی دێرینی یەکین، هاوڕێ یەك دڵ و یەك هەستین (جلال محمود. بەرگی٢. ١٤): [کنایە از دوست قدیمی هستیم، دوست یکدل].

**ئاوی جێگایەك خواردنەوە:** برێتی لە یەکێك کە ماوێك لە شوێنێکا بمێنێتەوە دابونەریتی ئەو شوێنە بوا بە رێگەوە: کنایە از کسی کە در اثر ماندن در جایی آداب و رسوم آنجا را رعایت و فرا گیرد.

**ئاوی چاوی سنراوە:** بە یەکێك ئەوترێ کە لە کار خرابێ

یا ترسێنرابێ (خال.٢٧): [کنایە از کسی کە برکنار شدە باشد یا ترساندە شدە باشد].

**ئاوی داخی خواردۆتەوە:** [برێتی لە یەکێك کە لەگەڵ دابونەریتدا ناسیاری نەبێت. لە قسەی دروست حاڵی نەبێت]: کنایە از کسی کە با آداب و رسوم آشنایی ندارد، کنایە از کسی کە حرف حق سرش نمی‌شود. (فتاحی قاضی. بەرگی٢. ٩)

**ئاوی داگە بە جەماڵیا:** [برێتی لە یەکێك کە شتێکی بە تەواوی فەوتاندبێت و نابوودی کردبێ]: کنایە از کسی کە چیزی را بە تمامی از بین بردە و نابود کردە. (حیرت.١٨)

**ئاوی داگە بێخیا:** واتە تەواوی خوارد و هیچی نەهێشت: کنایە از این کە تمامش را خورد و از آن چیزی باقی نگذاشت.

**ئاوی دەگونان گەڕاوە:** [برێتی لە کوڕێك کە گەیشتبێتە تەمەنی جوانی و بە شوێن حەزلێکەریدا بێت]: کنایە از پسری کە بە سن بلوغ رسید و بە دنبال عشق و عاشقی باشد. (فتاحی قاضی.١٢٦)

**ئاوێ ڕژا و کۆ نابێتەوە:** بە شتێك ئەوترێ کە لە دەست چووبێ (خال.٢٨): [کنایە از آب ریختە جمع نمی‌شود].

**ئاوی ژێر کاسەیە:** برێتی لە یەکێکی بێ کەڵك (جلال محمود. بەرگی١. ٤٥): [کنایە از آدم بی‌ارزش].

**ئاوی سەرەو ژوور دەڕوات:** ١) بەختەوەرە: ١) [کنایە از آدم خوشبخت] ٢) بەتوانا و بە دەسەڵاتە: ٢) [کنایە از آدم توانا و قدرتمند] ٣) کاری لە برەو دایە (جلال محمود. بەرگی٢. ١٣): ٣) [کنایە از رو بە پیشرفت بودن].

**ئاوی کەڵلە تەزێن:** برێتی لە ئاوی زۆر سەرد: کنایە از آب بسیار سرد. (فتاحی قاضی.١٢٦)

**ئاوێ گەرم ناکا:** برێتی لە یەکێك کە توانای هیچ کارێکی نەبێ (حیرت.١٨/ رەخزادی.٢٨): [کنایە از او کاری ساختە نیست].

**ئاوی گوێی دا:** ئامۆژگاریی کرد و تەگبیری بۆ کرد. ئەمە بۆ سەرزەنشت دەوترێت (جلال محمود. بەرگی٢. ١٤): [کنایە از نصیحت و چارەاندیشی برای کسی. او را سرزنش کرد].

**ئاوی لە ئاومرۆ کردووە:** برێتی لە یەکێك کە لە ئەندازە بەدەر خراپە دەکات (جلال محمود. بەرگی١. ٤٣): [کنایە از کسی کە بیش از اندازە بد باشد].

**ئاوی لێ بەستگە:** [لە دەس بڵاویا هەرا ئەکا زۆر هەڵە خەرجە]: کنایە از کسی کە در اصراف و ولخرجی بیداد می کند. (حیرت.١٨)

**ئاوی وا ڕژاوە:** وا فێربووە و خۆی گرتووە (نانەوزادە.١٢٨): [کنایە از همان ابتدا این گونە بار آمدە].

**ئاوی وا ڕژیاگە:** [برێتی لە شێوە و بنەمایەك کە لە هەوەڵەوە خراپ دانرابێت، کەسێك کە خراپ بار هاتبێت]: کنایە از اصول و شیوەیی کە از اول بد بنیاد نهاد شدە باشد، و آدمی کە بد بار آمدە باشد. (حیرت.١٨)

**ئاوی ها بە بێڵەوە:** ١) برێتی لە کەسێك کە خۆشیەتی و دۆخی بە سامانە: ١) [کنایە از روزگارش بە کام است] ٢) بە یەکێك ئەوترێ کە هەموو ئیش و کارێکی خۆی ئەنجام بدات: ٢) [کنایە از آدمی کە توانایی انجام همە کارهای خود را دارد]. ٣) ئاوی هابە بێڵەوە: برێتی لە کەسێك کە دەسی ئەڕوات و دەسەڵاتی هەیە (حیرت.١٩/ خال.٢٧/ رەخزادی.٢٨): ٣) [کنایە از شخص صاحب قدرت].

**ئاوی ها بە جۆگەوە:** [برێتی لە پیرێك کە هێشتا بە گوڕ و توانایە]: کنایە از پیری توانا و مقتدر کە

روزگارش بکام است. (حیرت.١٩)

**ئاویان بە جێگایەکا ناچێ:** برێتی لە یەکنەگرتنی بیر و ڕای دوو کەس: کنایە از عدم ایجاد توافق میان دو نفر.

**ئاویان لە گیرفانی دەردا (بەردا):** هەرچی پووڵ و پارەیەکی پێ بوو لێیان سەند (جلال محمود. بەرگی٢. ١٤): [کنایە از هر چە پول و سرمایە داشت از او گرفتند].

**ئاوێزان لە گورێزان خاسترە:** [برێتی لە کۆبوونەوە باشتر لە جیایی]: کنایە از جمع بە از تفرقە. (حیرت.١٨)

**ئاوێنە ئەگرنە بەر دەمیەوە:** [برێتی لە یەکێك کە لە حاڵی مەرگ دایە]: کنایە از کسی کە در حال مرگ است. (حیرت.١٩)

**ئاوێنەی دڵی پاکە:** ١) مروڤێکی دڵ ساف و بێکینەیە: ١) [کنایە از آدم پاك و بی کینە] ٢) حەز بە چاکە و دۆستایەتی هەموو کەسێك دەکات (جلال محمود. بەرگی٢. ١٤): ٢) [کنایە از مشتاق نیکی و دوستی با دیگران را دارد].

**ئاە لە بیساتا نییە:** برێتی لە یەکێکی نەدار و هەژار: کنایە از آدم بسیار فقیر و درماندە.

**ئاهووی مانیاگ ئەگرێ** (مریوخ.١٠): [بە یەکێك ئەوترێ کە بچێ بە گژ یەکێکی زەبوونا: کنایە از کسی کە بر آدم بیچارەای خشمگین شود].

**ئاهووی نەگیریاگ ئەوەخشێ** (مریوخ.١٠): [بە یەکێك دەڵێن کە شتێك ببەخشێ کە هین خۆی نەبێ، لە ماڵ خەڵك بەخشین: کنایە از بخشش از مال و ثروت دیگران].

**ئاهووی نەگیریاگ فرەس:** [بۆ سەرکەوتن دەرفەت زۆرە]: کنایە از برای پیروزی فرصت بسیار است. (حیرت.١٩/ مریوخ.١٠)

**ئاهێکی نەماوە:** [برێتی لە یەکێکی زۆر پیر کە نزیك بە مردنە]: کنایە از شخص مشرف بە موت. (فتاحی قاضی. بەرگی١. ١٠)

**ئایسان:** جوانی لە ڕادەبەدەری مێینەی مروڤ: مریم هێند جوانە دەڵێی چرایە دایسێ (تانموزانە.١٧٩): [کنایە از زیبایی بیش از حد زن].

**ئاینەکەی گوم کردگە:** برێتی لە یەکێکی خراپ کە ناوی یەکێکیتر بە خراپە بەرێت (جلال محمود. بەرگی٢. ١٤): [کنایە از آدم فاسدی کە از دیگران بدگویی کند].

**ئەترشچوون:** برێتی لە زۆر ترسان و زراوچوون (خال.ف.٧١): [کنایە از بسیار ترسیدە].

**ئەچێتە ڕێگا لەرەی تێ:** برێتی لە یەکێکی پێیەوبووگ: کنایە از شخص چاق.

**ئەچێتە کەوانی:** [لەگەڵیا بە شەڕ تێ]: کنایە از این کە با او مبارزە می کند. (حیرت.٢٠)

**ئەچێتە کەوانی:** [واتە: لەگەڵیا بەرەنگاری ئەکا و ئیبەزێنێ]: کنایە از این کە با او مبارزە می کند و از عهدەاش برمی آید. (حیرت.٢٠)

**ئەچێتە گەرووی شێرا:** واتە زۆر دلێر و بوێرە (جلال محمود. بەرگی٢. ١٥): [کنایە از آدم شجاع].

**ئەخت و چار:** برێتی لە پێداگری زۆر. بۆ وێنە: فیسار کەس لە بەر درکەی ڕاوەستابوو، ئەخت و چارم کرد نەهاتە ژوورەوە: کنایە از بسیار کوشیدن و اصرار کردن.

**ئەژنۆی دادا (چۆکی دادا):** ١) بەزی و ژێرکەوت: ١) [شکست خورد] ٢) تێشکاو و ژێر کەوت: ٢) [کنایە از شکست خورد] ٣) بەسەریدا زاڵ بوون (جلال محمود. بەرگی١. ٤٧): ٣) [بر او پیروز شد].

**ئەژنۆی شکا:** ١) هێزی لەبەر بڕا: ١) کنایە از قدرتش را از دست داد ٢) کۆستی کەوت و پشتیوانی نەما:

٢) عــزیزی را از دســت داد ٣) دەسەڵاتی نــەما: ٣) قــدرتی برایش نماند ٤) زیانێکی گەورەی لێ کەوت کە تەواو پێوەی دیار بێت (جلال محمود. بەرگی١. ١٥): ٤) ضربەای یا شکستی بر او وارد شد کە آثارش معلوم است.

**ئەستێرەی لە ئاسماندا نەماوە:** ١) برێتی لە یەکێکی ناهومێد: ١) [کنــایە از شــخص ناامید] ٢) بێکەسە: ٢) [تنهاست] ٣) بەدبەخت و چارەڕەشە (جلال محمود. بەرگی١. ٤٨): ٣) [بدبخت].

**ئەسپی جۆخومر بووگە:** [برێتی لە پیاوێك کە ناتوانێ بێ ژن بێت]: کنایە از مردی است کە نمی‌تواند بدون همسر بماند. (حیرت.٢٢)

**ئەسپی هەڵی تیزان:** برێتی لە ڕەقهەڵسان: کنایە از خشمگین شدن.

**ئەسپیکوژ:** برێتی لە قامکە گەورەی دەست (خاڵ.ف.٧٤): [کنایە از انگشت شست].

**ئەقڵی لە ئەژنۆی دایە:** نەزان و بێ‌عەقڵە. بۆ سووکی بە کەسێکی نەزان دەوترێت (جلال محمود. بەرگی٢. ١٥): [کنایە از آدم نابخرد].

**ئەقڵی ها لە چاویا:** [برێتی لە یەکێکی ڕواڵەتبین]: کنایە از شخص ظاهربین است. (حیرت.٢٢)

**ئەگەر ئاش‌خۆری کەوچکت کوا:** [کار بە کردن دەکرێ نە بە قسە]: کنایە از بە عمل کار برآید نە بە حرف. (حیرت.٢٣)

**ئەگەر و ئەگەر:** برێتی لە رووننەبوونی کارێك یان شتێك بۆ وێنە: نازانم کارەکەم جێ بە جێ دەبێ یان نابێ، لە ئەگەر و ئەگەردایە: کنایە از نامشخص بودن کار یا چیزی.

**ئەلف لەیل ئەخوێنێ:** بە یەکێك ئەوترێ کە زۆر بەرەوانی قسەی بێ سوود بکات (خاڵ.٤١): [کنایە از شخصی کە بە راحتی سخنان بیهودە بر زبان آورد].

**ئەم ئاوە خراو رژیاگە:** برێتی لە ڕەسم و یاسەیەك کە خراپ دامەزراوە (رخزادی.٢٨): [کنایە از آداب و رسومی کە از اول بد پایە گذاری شدە است].

**ئەم بان و ئەو بان ئەکا:** [برێتی لە یەکێك کە هەردەم لەسەر بیر و بڕوایەکە، قسەکانی لە ئاراستەیەکدا نییە]: کنایە از آدم هرهری مذهب و بی‌ثبات، کسی کە در چارچوب حرف نمی‌زند. (حیرت.٣٠)

**ئەم پا و ئەو پا ئەکا:** [برێتی لە یەکێکی دوودڵ و ڕاڕایی]: کنایە از شخص دودل و مردد. (حیرت.٣٠)

**ئەم چێشتە دەم ئاسووتێنێ:** ئەم کارە بێ بایەخە (جلال محمود. بەرگی٢. ١٥): [کنایە از بی‌ارزش بودن].

**ئەم دەس و ئەو دەس ئەکا:** [دوودڵ و سەرگەردان]: کنایە از شخصی کە در انجام کاری شک دارد و مردد است. (حیرت.٣٢)

**ئەم دەسی لەو دەسی چلك ناگرێ:** [برێتی لە یەکێکی ڕژد و چنوك]: کنایە از آدم خسیس. (حیرت.٣٢)

**ئەم دیو و ئەودیو کردن:** برێتی لە وردبوونەوە و تێبینی لە کارێکا (خاڵ.ف.٧٩): [کنایە از دقت و کنجکاوی در کاری].

**ئەم شاخ و ئەو شاخ ئەکا:** ١) کەللە ڕەقی دەکا و لە قسەی خۆی نایەتە خوارێ: ١) [کنایە از این کە لجبازی می‌کند و دست از حرف خود برنمی‌دارد] ٢) هیچی لە باردا نییە (جلال محمود. بەرگی٢. ١٦): ٢) [کنایە از بی‌بهرە و بی‌خاصیت].

**ئەمری خوای بەجێ هێنا:** برێتی لە مردن (جلال محمود. بەرگی١. ٥٠): [کنایە از مردن].

**ئەنگوست تێخستن:** ئاژاوە گێڕی: کنایە از آشوب بە پا کردن.

**ئەنگوست گەستن:** [پەشیمان بوونەوە]: کنایە از پشیمانی و حسرت بردن. (حیرت.٣٥)

**ئەنگوستەچاو:** برێتی لە تاریکایی خەست: (شەوەزەنگ) (خال.ف.٨٠) [کنایە از بسیار تاریک].

**ئەو حەقە ناوێتە گۆڕ:** [واتە: قەرەویت لێ دەسێنمەوە]: حقی را کە بر تو دارم از تو می‌گیرم. تلافی می‌کنم. (حیرت.٣١)

**ئەو دڕکە لە ژێر پات دەرتێنم:** بۆ هەڕەشەیە. تۆڵەت لێ ئەستێنمەوە، بەسەرتەوە ناروات (جلال محمود. بەرگی٢. ١٦/ شێخەڵا.٣٥): [برای تهدید است کنایە از انتقام گرفتن].

*****ئەم دڕکە لە ژێر پات دەرتێرم:** [بۆ هەڕەشەیە]: کنایە از تهدید. (حیرت.٣٢)

*****ئاوێکی لێ گەرم ناوێ:** برێتی لە یەکێکی تەنبەڵ و تەوەزەل کە هیچێکی لە دەست نایەت: کنایە از آدم تنبلی کە کمکی از او برنمی‌آید.

**ئاو کە دەمی ئەیجاوێ:** برێتی لە یەکێکی گەوج: کنایە از شخص نادان و سادە لوح.

**ئاو کەوتووە ژێری:** لابردنی کەسێك لە شوێنێك یا دەرکردنی (خال.٢٨): [برکناری کسی از جایی یا بیرون کردن او].

**ئاو کردن:** لە مل کردنەوە و فرۆشتنی شتومەکی لە سەر دەست ماو: کنایە از فروختن کالایی کە روی دست فروشندە ماندە باشد.

**ئاو لە ئاو تەکان ناخوات:** هەموو لایەك ئارامە و دنیا کشووماتە (رخزادی.٢٦): [کنایە از آرامش و سکوت].

**ئاو لە ئاو تەکان نییەوەی:** ستارەی هەیە و خۆی گرتووە، نابزوێت (جلال محمود. بەرگی٢. ١٤): [کنایە از آرام گرفتن، حرکت نکردن].

**ئاو لە ئاوەڕۆ دەرکردن:** لە باری ئاسایی چوونە دەری کار و ئاکار، بێ حەیایی (ئانەوزادە.١٤٠): [کنایە از اخلاق و کردار خارج از عرف و میزان].

**ئاو لە دەستی ناتکێ:** زۆر پیسکەیە (خال.٢٦/حیرت.١٥): [کنایە از بسیار خسیس].

**ئاو لە دەسی ناتکێت:** برێتی لە یەکێکی ڕژد و چنۆك (خال.٢٦): [کنایە از بسیار خسیس بودن است].

**ئاو لە دەنگا ئەکوتێ:** برێتی لە کەسێك کرداری بێ ئاکام ئەکا (رخزادی.٢٦): [کنایە از کاری بیهودە و بی‌سرانجام].

**ئاو لە دڵ ڕۆیین:** برێتیلە برسیەتی زۆر (خال.ف.٦٥): [کنایە از گرسنگی زیاد].

**ئاو لە دڵ هاتن:** بێزوو کردن، مژنکردن (ئانەوزادە.١٤٠): [کنایە از ویار].

**ئاو لە دڵی دەڕوات:** برێتی لە یەکێکی زۆر برسی (جلال محمود. بەرگی١. ٤١): [کنایە از آدم بسیار گرسنە].

**ئاو لە سەر زوڵفی ئەتکێ:** واتە زۆر گەنج و جوانە (خال.٢٦): [کنایە از آدم بسیار جوان و زیبا].

**ئاو لە سەر گوزەریان:** برێتی لە یەکێك کە تووشی زۆر بەسەرهاتی ناخۆش بووبێت و پابەند و دەربەستی هیچ شتێك نەبێ: کنایە از آدم بی خیال

**ئاو لە سەرچاوەوە لێڵە:** برێتی لە شتێك کە هەر لە سەرەتاوە باش نەبێ (خال. ٢٦/ جلال محمود. بەرگی١. ٤٢): [کنایە از چیزی کە از اوّل بد باشد].

**ئاو لە سەری دەرچووگە:** واتە گیانی لە دەست داوە بێچارە و بەدبخت بووە، کاری تەواو بووە (جلال محمود. بەرگی٢. ١٣): [کنایە از مردن، بیچارە و بدبخت شدن، و

کارش به پایان رسیده].

**ئاو لە سکیا ناجووڵێتەوە:** برێتی لە یەکێکی زۆر چرووك و بەرچاوتەنگ، لەسەر خۆ بڕوات تا برسی نەبێت (جلال محمود. بەرگی٢. ١٣): [کنایه از آدم خسیس که در راه رفتن هم آرام رود تا مبادا گرسنه شود].

**ئاو لە گیرفانی کەسێك بەردان:** [برێتی لە هەموو پارەی کەسێك وەرگرتن]: کنایه از همه‌ی پولهای کسی را گرفتن. (فتاحی قاضی. بەرگی١. ٦)

**ئاو لە ناو ئاوانا (دەسکەوانا) ئەکوتێ:** ڕەنجی بێ هوودە دەدات کارەکەی لە ژێری نییە (جلال محمود. بەرگی٢. ١٣): [کنایه از رنج بیهوده کشیدن].

**ئاو لەئاسیاو کەفت (ئاشی ئاوکەوتوو):** برێتی لە تەواوبوون، هەموو لایەك بێدەنگە (رخزادی.٢٦): [کنایه از تمام شدن، آرام گرفتن].

**ئاو لێڵ کردن:** برێتی لە دوو بەرەکی کردن و هەڵخڕاندن: کنایه از نفاق افکندن، شوراندن.

**ئاو لێڵ مەکە:** [ناکۆکی و جیاوازی پێك مەهێنە]: کنایه از اختلاف مینداز. (حیرت.١٦)

**ئاو لێڵ ناکا:** ناتەوانە: کنایه از ناتوانی.

**ئاو مەدرەسەی خواردگەسەو:** [برێتی لە منالی هار و هاج]: کنایه از بچه شرور. (حیرت.١٦)

**ئاو نە پاڵاوتن:** پێداگربوون، سووربوون لە سەر بیر و باوەڕ، بۆ وێنە: هێندە موسڵمانە ئاو ناپاڵێوێ! (ئانەوڵزادە.١٤٠): [کنایه از اصرار و پافشاری بر عقیده و مرام].

**ئاو نەبهانیوە:** ١) خۆ بێکەس نییە: ١) [کنایه از تنها و بی‌کس] ٢) خۆ بە خۆڕایی دەست نەکەوتووە (جلال محمود. بەرگی٢. ٥٩): ٢) [کنایه از این که مفت به دست نیامده].

**ئاو و ئاگر:** بەڵا، مەترسی یەکجار زۆر (ئانەوڵزادە.١٦٥): [کنایه از بلا و خطر بسیار بزرگ].

**ئاو و گڵ:** برێتی لە وادەی مەرگ، ئەجەل، ئەجەل: کنایه از اجل، مرگ. (مەزور.١٥)

**ئاو ها بە دەستەوە مەیخۆرەوە:** [واتە پەلە بکە و خۆت بگەیێنە]: کنایه از شتاب کن و خود را برسان. (حیرت.١٦)

**ئاو هەس ئەکاتەوە:** کارەکەی بێ‌ئەنجام و بێ‌کەڵکە (جلال محمود. بەرگی٢. ١٣): [کنایه از کار بیهوده انجام می‌دهد].

**ئاو هەسەوکەرە:** یەکێکی بەتاڵپیا و خوێڕی (رخزادی.٢٨): [کنایه از بیکاره].

**ئاوسوو:** برێتی لە مەردومی بێعار (خال.ف.٦٧): [کنایه از انسان بی‌عار و ننگ].

**ئاوەکە شیرتینە:** برێتی خوش چوونەوە پێشەوەی کارێك: کنایه از کار تقریباً بر وفق مراد است.

**ئاوەکە وا ڕژاوە:** [برێتی لە دەستورێکی خراپ دانرابێ و شتێکی خراپ کرابێتە بە باو]: کنایه از آداب و رسوم بدی که معمول و رایج شده باشد. (فتاحی قاضی. بەرگی١. ٣٠)

**ئەم ماستە بێ موو نییە:** خەوشێك لەم کارە هەیە، ئەم کارە پاك و بێ‌گەرد نییە (جلال محمود. بەرگی٢. ١٦): [کنایه از منظور و هدف بدی در این کار وجود دارد].

**ئەمڕۆ و سۆزی کردن:** برێتی لە دواخستنی کارێك: کنایه از به عقب انداختن کاری.

**ئەو دووکانە هەڵچنیا:** [چاوەڕوانی مافی پێشوو لە ئێستادا هەڵمیە]: آن سبو بشکست و آن پیمانه ریخت دیگر نمی‌توانی به دستش بیاوری. (حیرت.٣٥)

**ئەو سەرمەشقەی بۆ دامەدە:** واتە فێری ئەو جۆرە ڕەفتار و ئاکار و قسە و بیرەی مەکە (جلال محمود. بەرگی٢. ١٧): [کنایه از این که او را با این نوع رفتار و اعمال و سخن و افکار آموزش مده].

**ئەو گرێیە کوێرە بە من ناکرێتەوە:** ١) ئەو کێشەیە، بە من چارە ناکرێت ئەو نهێنیە بە من نادۆزرێتەوە (جلال محمود. بەرگی٢. ١٧): [کنایه از این که این مسأله به وسیلەی من حل نخواهد شد].

**ئەو ماستە بێ موو نییە:** [برێتی لە ئیش و کارێك کە فڕوفێڵی تێدایە]: کنایه از کاسه ای زیر نیم کاسه هست. (فتاحی قاضی. بەرگی١. ٢٥)

**ئەو هێلکەیە بە دەستی من ڕەنگ مەکە:** ئەو کارە نابەجێیە، بە من مەسپێرە (جلال محمود. بەرگی٢. ١٧): [کنایه از این که این کار ناشایست و نامناسب را به من مسپار].

**ئەوە گۆڕی بێت:** ١) واتە هەڵ دەگرێت وای بە سەر بێت: ١) [کنایه از این که حقش بود این بلا سرش بیاید]، ٢) برێتی لە یەکێك کە بە لاساری کارێکی ناپەسەند بکات لە پاشان تووشی زیانی خۆی بێت (جلال محمود. بەرگی١. ٥٣): ٢) [کنایه از آدم حرف نشنو که کار زشت و ناپسند انجام دهد و بعداً گرفتار عذاب آن شود].

**ئەوە کەرکێ تۆپیوە:** بۆ سەر سووڕمان و لە کاتێکدا دەوترێت کە کارێك بکرێت: کنایه از تعجب کردن در مواقعی گفته می‌شود که کاری انجام گیرد توسط کسی که انتظار آن نرود.

**ئەوەندەی بە دەمی کێ دادەم:** برێتی لە شتێکی زۆر کەم: کنایه از چیز بسیار کم.

**ئەیاتەو دەس:** [بە تۆڵەی کرداری خۆی دەگەیی]: کنایه از به مکافات عمل خود میرسد. (حیرت.٤٤)

**ئەیژێ لە دەم فێڵ داکەوتووە (لە لووتی فێڵ داکەوتووە)** (مریوخ.١٠): [برێتی لە کەسێك کە بەفیز و دەمارە: کنایه از آدم متکبر].

**ئەیژن کەنیشك هەوەی دایکە (هەوەی دایکبوون):** [واتە کەنیشك دەیەوێ هەرچی دایکی هەیەتی ئەویش بیبێ]: کنایه از هرچه مادر داشته باشد و او نداشته باشد حسودیش می‌شود. (حیرت.٤٤)

**ئەیژێ ناو لای داگە:** [شەکەت و مانیاگ]: کنایه از شخص خسته و بیحال. (حیرت.٤٥)

**ئەیژێتە موویان هەڵکزاند:** [برێتی لە یەکێك کە بەخێرایی بۆ جێگایەك خۆی بگەیەنێ]: کنایه از کسی که سریع در جایی حاضر شود. (حیرت.٤٧)

**ئیتر لە دایك ناوێتەوە:** [لە ژیانتا خۆش ڕابوارە و ڕێزی بۆ دانە]: کنایه از زندگی لذت ببر و قدر زندگی را بدان. (حیرت.٤٨)

**ئێختەیان کرد:** ١) دەستەمۆیان کرد، هێنایانە ژێر بار: ١) [کنایه از اهلی کردن] ٢) لە هەڕە و گێف و گوڕەیان خست (جلال محمود. بەرگی١. ٥٥): ٢) [کنایه از، از ادعا افتادن].

**ئیسگەی تفەنگ نایگاتێ:** واتە: زۆر خێرایە: کنایه از بسیار سریع است.

**ئێسك سووك:** برێتی لە شتی جوان کە بچێتە دڵەوە (خاڵ.ف.٨٧): [کنایه از چیز یا شخص دوست داشتنی].

**ئێسك قورس:** برێتی لە شتی ناشیرین کە نەچێتە دڵەوە (خاڵ.ف.٨٧): [کنایه از بداخم].

**ئێسکی قورسە:** خوێن‌تاڵە، ناوچاوتاڵە: کنایه از آدم بداخم و تو دل نرو.

**ئێقدانەوە:** برێتی لە شەپۆلدانی قەڵەباڵغی زۆر

بەرەنگێکی وا کە پاشە و پاش بگەرێتەوە لە بەر زۆری (خاڵ.ف.۸۷): [کنایه از جمعیت بسیار زیاد در جایی].

**ئیمان خوەت مەسووزنە:** [بێ بەڵگە لە کەسێك بەدگومان مەبە]: کنایه از بی‌مورد به دیگران سوءظن نداشته باش. (حیرت.٤٩)

**ئیمرۆ بە لای چەپا هەڵساگە:** برێتی لە یەکێك کە کردەوەکانی وەکوو پێشوو ئاسایی نەبێت (جلال محمود. بەرگی۲. ۱۸): [کنایه از کسی که رفتارش بر خلاف معمول گذشته بد شود].

**ئیمرۆژ وەرمق جۆرێترە:** [برێتی لە کاروبار گۆڕاوە هەمووشتێك ئاڵوگۆڕهاتووە بە سەریا]: کنایه از همه چیز فرق کرده، اوضاع تغییر کرده. (حیرت.٥٠)

**ئێوارە وەختە جرپن بەچەختە:** بە تەوسەوە: برێتی لە ئافرەتێ تەمەڵ کە درەنگ کەوتبێتە خۆی (جلال محمود. بەرگی۱. ٥٦): [برای طعنه، کنایه از زن تنبل که دیر بجنبد].

# ب

**باب دەرهێنان:** زۆر توند ئازاردان و تەنبێ کردنی کەسێك (ئانەوزانە.١٨٦): (کنایه از تنبیه کردن شدید کسی).

**بابردوو:** ١) برێتی لە شتی زۆر سووك ٢) مرۆڤی بێدەسەڵات و بێئەنوا (خاڵ.ف.٩٠): ١) [کنایه از چیز بسیار سبک] ٢) [کنایه از آدم ناتوان و فقیر].

**با بێت شەن ئەکات، باران بێت ئاسیاو ئەگەڕنێ:** [برێتی لە یەکێك کە لەگەڵ هەر بارودۆخێکدا خۆی رێك بخات]: کنایه از کسی که با وضع موجود خود را تطبیق دهد. (حیرت.٥٦)

**بابیان سووتاند:** تووشی زیان و ئازارێکی گەورەیان کرد (جلال محمود. بەرگی٢. ١٩): [کنایه از این که او را گرفتار مصیبت و بلای بزرگ کردند].

**بابیان لە کەرکێشا:** ١) تووشی ئازار و زیانیان کرد، خراپیان بەسەرهێنا: ١) [کنایه از او را دچار سختی و مصیبت کردند و بلای بدی را بر سر او آوردند]، ٢) دەسەڵاتیان بڕی (جلال محمود. بەرگی٢. ١٩): ٢) [کنایه از او را از تاب و توان و قدرت انداختند].

**با بە پای قوڵیا ناگەیێ:** برێتی لە یەکێك کە لە رێگەچووندا توند و خێرا بێ: کنایه از کسی که در حرکت بسیار سریع باشد.

**باج سمێڵ ئەگرێ:** [برێتی لە یەکێکی زاڵم و دەست درێژکەر بە مرۆڤ زۆر ئەڵێ]: کنایه از گردن کلفت و جباری که به مردم ظلم می کند. (حیرت.٥٦)

**باج سمێڵ ئەگرێ:** واتە: کەڵەگایی دەکا، زۆرداره: کنایه از گردن کلفت و جباری که به مردم زور می گوید.

**باج لێ گرتن:** برێتی لە هەڵگرتنی شتێك لە شتێك بە نقورچك (خاڵ.ف.٩٣): [کنایه از ناخنک].

**باخی بەبەرە:** برێتی لە یەکێك کە ئاواتی هاتبێتە دی (خاڵ.٨٠/جلال محمود. بەرگی٢. ١٩): [کنایه از کسی که به آرزویش رسیده باشد].

**بادانەوە:** برێتی لە پەشیمان بوونەوە لە قسەیەك یا کردەویەك (خاڵ.ف.٩٤): [کنایه از پشیمان شدن کسی از کاری یا حرفی].

**بادەرچوون:** برێتی لە لووت بە بەر خۆدا هاتنەوە (خاڵ.ف.٩٤): [به حالت طبیعی برگشتن].

**با دەرکەی لێ ناکاتەوە:** ١) کەس بە لایدا ناچێت: ١) [کنایه از کسی سراغ او را نمی گیرد] ٢) کەس بە فریای ناکەوێت بە هانایەوە ناچێت: ٢) [کسی به کمک او نخواهد رفت] ٣) بێکەس و خوێشە (جلال محمود. بەرگی٢. ١٩/ فتاحی قاضی.١٧٦): ٣) [کنایه از بی کس].

**با دەرکەی لێ نەکردنەوە (با دەرکەی لا ناکاتەوە):** ئاسوودە و بێمزاحم بوون، بێ خزم و بێکەس و کار و هەڤاڵ (ئانەوزانە.١٨٢): [کنایه از آسوده و بی دردسر، بی کس].

**با دێزە بەدەرخۆ نەبێت:** واتە ئەم باسە با هەر بە نهێنی بمێنێتەوە (خاڵ.٨٠): [کنایه از این راز باید مخفی بماند].

**باراش لێکردن:** برێتی لە درێژەدان بە قسە (خاڵ.٩٤): [کنایه از وراج و پرگو].

**باران باری بە تەقەتەق/ درزو دروومان هاتەوە یەك:** برێتی لە خزمانێك کە پاش لەیەکبوون و دڵگیربوون ئاشتیان بێتەوە و یەك بگرنەوە (جلال محمود. بەرگی١. ٥٨): [کنایه از نزدیکان و فامیل پس از مدتی ناراحتی و

نزاع دوباره با هم صلح کنند و یکی شوند].

**بارچەوت:** برێتی لە پیاوی ناڕاست و بێئاکار: کنایه از شخص ناراست و بداخلاق. (مەزن.٤٠)

**بار ڕاست کردنەوە:** یارمەتی دان بە کەسێك کە چەتێکی کەوتۆتە سەر ڕێی دەست گرتن بە تایبەت لە باری مادییەوە (ئانەوزادە.١٩٩): [کنایه از دستگیری و کمک کردن به دیگران].

**بارکەفتن:** برێتی لە بەدبەختی و نەهاتی (خاڵ.ف.٩٦): [کنایه از بدشانسی].

**بارکەوتن:** ئەرکی خەڵك وە ئەستۆ گرتن (ئانەوزادە.١٩٩): [مسئولیت کسی را به گردن گرفتن].

**بارکەوتوو:** برێتی لە یەکێك کە بەدبەختی و نەهاتی ڕووی تێ کردبێ (خاڵ.ف.٩٦): [کنایه از شخصی که بدشانسی و بدبختی به او روی آورده باشد].

**بارکێش:** برێتی لە یەکێك کە ئەرکێکی قورس کەوتبێتە سەری (خاڵ.٩٦): [کنایه از کسی که وظیفه‌ای سنگین بر دوشش افتاده باشد].

**بارکێشان:** برێتی لە هەڵگرتنی ئەرکێکی قورس (خاڵ.ف.٩٦): [کنایه از کسی که وظیفەی سنگینی را بر عهده گرفته باشد].

**بارکێشانن:** برێتی لە بەرگەی ڕەنج و ئازار گرتن: کنایه از تحمل رنج و بلا کردن.

**بار و بارخانە:** بە هێما بۆ سمتی گەورەی ژنان دەڵێن: عەجەب باروبارخانەیەکی هەیە: کنایه از باسن بزرگ. (مەزن.٤١)

**بارەشاری تێتۆ** (مەریوخ.٢٠): [برێتی لە کەسێك کە زۆر بە کارێك شادمانە]: [کنایه از کسی که از چیزی بسیار شادمان و خوشحال است].

**بارە گوێزی لێنی، خرەی نایەت:** برێتی لە یەکێکی گوێ ڕایەڵ و فەرمانبەر (خاڵ.٨١): [کنایه از آدم مطیع].

**بارەی بڕی:** دەم کوتی کرد. لە جرت و فرتی خست. بۆ سووکی بە یەکێك دەوترێت وەك بزن دەبارێنێت (جلال محمود. بەرگی٢. ١٩): [کنایه از او را وادار به سکوت کرد. به عنوان تحقیر به کار می‌رود].

**بارەهەنگرە:** ١) خۆڕاگر و ئارامە: ١) [کنایه از این که صبور و آرام است] ٢) بە تەوسەوە بۆ سووکی بە یەکێك دەوترێت کە مل شۆڕی بنوێنێت (جلال محمود. بەرگی٢. ١٩): ٢) [با طعنه به کسی گفته می‌شود که سربزیر باشد].

**باری بە ڕێوەیە:** [برێتی لە ژنێك کە لە زایین دایە]: کنایه از زنی زایش و فارغ شدن او نزدیک است. (فتاحی قاضی. بەرگی١. ٣٩)

**باری خستووە:** ١) پشوو دەدات و دەحەسێتەوە: ١) [استراحت می‌کند و خستگی درمی‌کند] ٢) تا بو شتی هەستان، کاری نییە: با باوێژ لە سکی خۆی دەرکات: برێتی لە یەکێك کە تووڕە بێت و بە قسە هەڕەشە و گوڕەشە بکات (جلال محمود. بەرگی١. ٥٧): ٢) [کنایه از آدم عصبانی و خشمگینی که دیگران را تهدید کند].

**باری خۆی بەست:** برێتی لە قازانجێکی زۆری بە دەست هێنا: کنایه از سود کلانی به دست آورد.

**باری کرد:** ١) [کۆچی کرد، ڕۆیشت]: ١) کنایه از کوچ کردن ٢) [مرد]: ٢) مرد ٣) [ئەرك و زەحمەتی خستە سەر شانی جا ئەو ئەرکە مادی بێت یان هەر جۆرێکی‌تر]: ٣) کنایه از رنج و زحمت بر کسی تحمیل کردن حال این رنج و زحمت مادی باشد یا هر نوع دیگر ٣) [برێتی لە خولتەی درۆ بە یەکێك کردن] ٣) کنایه از تملق و ستایش دروغین. (حیرت.٥٩)

**باریك ڕێسی:** برێتی لە دانەواندن و قسە لووس کردن: کنایه از تملق. (مەژار.٤١)

**باریکان دەڕێسیٚ:** [برێتی لە یەکێکی وڕاج و قسەفرەکەر]: کنایه از پرحرف. (حیرت.٥٩)

**باریکی کردۆتەوە:** [برێتی لە یەکێك لە شتێك دەست هەڵگرێ و داخوازیەکانی کەم بکاتەوە]: کنایه از کسی که از کاری یا خواستەای کوتاه بیاید و آن را کاهش دهد. (فتاحی قاضی. بەرگی٢ . ٢٧)

**باری کەوتووە:** ١) داماو و خەفەتبار و پەککەوتەیە: ١) [کنایه از آدم درمانده و غمگین و از کار افتاده] ٢) نوشوستی هێناوە و گرفتارە: ٢) [بدبیاری آورده و گرفتار شده] ٣) لە کۆمەڵدا سووك بووە (جلال محمود. بەرگی١. ٥٩): ٣) [در میان جامعه بی‌اعتبار و بی‌ارزش شده].

**باری گران کرد:** ١) تووشی سەختی ژیانی کرد: ١) [کنایه از این که او را دچار دشواریهای زندگی کرد]، ٢) خەرجییەکی زۆری هاوێشتە سەرشانی: ٢) [کنایه از این که خرج زیادی را به دستش داد] ٣) کار و ئەرکێکی زۆری بەسەردا دا: ٣) [کنایه از این که کار و وظیفەی سنگینی را به او واگذار کرد] ٤) کارەکەی لیٚ ئالۆز کرد: ٤) [کنایه از سردرگمش کرد]. ٥) تووشی مەراق و دەردی سەرییەکی زۆری کرد (جلال محمود. بەرگی٢. ١٩): ٥) [او را دچار غم و اندوه و دردسر بزرگی نمود].

**باری گرانە:** ١) ئەرکی زۆرە و زۆر ماندوو دەبێت: ١) [کنایه از کسی که وظیفەاش سنگین است و زود خسته می‌شود] ٢) خێزانی زۆرە (جلال محمود. بەرگی١. ٥٩): ٢) [زن و بچەی زیادی دارد و عیال‌بار است].

**با هەر بومڕیٚ:** [برێتی لە یەکێك کە قسەی بیٚ کەڵك دەکا]: کنایه از کسی که سخن بیهوده می گوید. (فتاحی قاضی. بەرگی١ . ٣٨)

**با هەر بومڕێت:** بۆ سووکی بە یەکێك دەوتریٚ کە قسە و شتی ناشیرین بڵێت و تۆ وەڵامی نەدیتەوە (جلال محمود. بەرگی٢. ٢١): [برای تحقیر است، کنایه از کسی که حرف زشت و نامناسب گوید و تو او را بی‌محل کنی].

**با هەر لە ورگی یان لە سکی خۆی بدات:** واتە با هەر بۆ خۆی بڵێت، گینگڵ بدات و چاوەڕوان بێت چی دەکات بیکات. ئەولا، دەست لەو شتە هەڵناگرێت و داخوازییەکەی ئەم بیٚکەڵکە (جلال محمود. بەرگی٢. ٢٠): [کنایه از این که بگذار هر چه می‌خواهد بگوید انجام دهد. طرف مقابل او بی‌اعتناست و کار خودش را انجام می‌دهد].

**بازاڕ تیژی کردن:** برێتی لە بازاڕگەرمی و پەرەپێدان: کنایه از رونق دادن، بسامان کردن.

**بازاڕ دڵۆپەیە:** واتە کەس نازانیٚ کڕیار کەی دیٚ بۆ لای (خاڵ.٢.٨): [کنایه از کسی نمی‌داند که کی مشتری پیش او می‌آید].

**بازاڕی:** ١) برێتی لە ئادەمیزادی هیچ و پووچی بیٚ مایە: ١) [کنایه از شخص بی ارزش] ، ٢) برێتی لە شتومەکێك کە تایبەتی و چاك نەبیٚ (خاڵ.ف.٩٨): ٢) [کنایه از کالای نامرغوب].

**بازاڕی کەساسە (کزە):** ١) بیٚدەرامەتی: ١) [کنایه از بی‌درآمدی] ٢) نافرۆشرێت: ٢) [کنایه از عدم فروش] ٣) کەس بە لایدا نایەت و پشتگوێ خراوە. کەس گوێی لیٚ ناگرێت (جلال محمود. بەرگی١. ٦٠) ٣) [کنایه از کسی که به طرف او نمی‌آید و طرد شده، کسی

گوش به حرف او نمی‌دهد].

**بازارگرمی:** له فرۆشی زۆر و بڕەو له بازاڕدا (خاڵ.٩٨): [کنایه از فروش بسیار].

**بازاڕی گەرمە:** [بریتی له یەکێك که سوود و دەستکەوتی زۆر بێ]: کنایه از کسی که درآمدش زیاد باشد. (حیرت.٦٠)

**باز له بازگەدا ئەگیرێ:** واته هەموشت ئەبێ له هەلی خۆیا بگیرێ (خاڵ.٨٢): [کنایه از هر کاری را به موقع باید انجام داد و از فرصت استفاده کرد].

**بازەڵە خوێندن:** بریتی له بێ شەرمی و چاونەترسی (خاڵ.ف.١٠): [کنایه از بی‌شرم و بی باک].

**بازەڵەی بەستووە:** بریتی له لاوێك که تازه دڵی دڵداریی پەیدا کردبێ (جلال محمود. بەرگی٢. ٢٠): [کنایه از جوانی که تازه شروع به عشق و عاشقی کرده باشد].

**بازەڵەی خوێندووە:** واته: له خۆشیدا هار بووە، هەر جرت و فرتیەتی. شەرم و ترسی لا نەماوە (جلال محمود. بەرگی١. ٦١): [کنایه از خوشحالی ناآرام شده، بازیگوش و جلف شده. بی‌شرم و حیا شده].

**بازنی زێڕی له دەستدایە:** بریتی له یەکێکی دەست ڕەنگین که پیشەیەك بزانێت و بە هەوڵی بازووی خۆی بتوانێت بژی (جلال محمود. بەرگی١. ٦١): [کنایه از کسی که پیشه یا حرفه‌ای را می‌داند و با توان و قدرت بازوی خویش زندگی می‌کند].

**بازی دەوڵەتی لە سەر نشین:** بەخت ڕووتێکردن، چاك بۆ هاتن، بەختەوەر بوون (نانەوازادە.٢١٣): [کنایه از شانس به کسی روآوردن].

**باسی سەرە:** [بریتی له مەترسی تێیاچوون]: کنایه از خطر نابودی. (فتاحی قاضی. بەرگی١. ٤٠)

**باشەواڵا:** بریتی له لینگ ڕووت و بێ دەرپێ: کنایه از شخص بدون شلوار. (مەزهەر.٤٤)

**باغی بەبەرە:** به ئاوات گەیشتووە (نانەوازادە.٢٦٦): [کنایه از کسی که به آرزویش رسیده].

**باقر بوون:** عەیب دەرکەوتن و ڕووڕەش بوون (نانەوازادە.٢٣٠): [کنایه از آشکار شدن عیب و خجل شدن].

**باقر دەرهاتن:** عەیب دەرکەوتن (نانەوازادە.٢٣٠): [کنایه از آشکار شدن عیب و نقص].

**باگردن:** بریتی له تووڕەبوون: کنایه از خشمگین شدن.

**باڵ و پەڕشکیان:** بریتی له داماوی و بێچارە بوون: کنایه از درمانده و بیچاره بودن.

**باڵا کردن:** بریتی له گەشەکردن (گەز گەز باڵا ئەکەم) واته له خۆشیانا گەشه ئەکەم(خاڵ.ف.١٠٢): [کنایه از نشو و نما کردن از شادمانی].

**باڵشکان:** تووشی بەدبەختی بوون سەرنەکەوتن (نانەوازادە.٢٣٦): [کنایه از گرفتار شدن و شکست خوردن].

**باڵە شۆڕە:** [بریتی له یەکێکی ناخۆش و بێ حاڵ]: کنایه از آدم مریض و بیحال. (حیرت.٦٠)

**باڵە شۆڕیەتی:** واته زۆر نەخۆشە، پەرێشانە (جلال محمود. بەرگی٢. ٢٠): [کنایه از بسیار بیمار و اندوهگین بودن].

**باڵەشۆڕەی گرتووە:** [بریتی له یەکێك که له ترسا یا به بۆنەی نەخۆشی سەختەوە شانی کەوتبێت]: کنایه از در اثر ترس و وحشت یا بیماری شانه‌هایش فرو افتاده. (فتاحی قاضی. بەرگی٢. ٢٧)

**باڵەفڕ بووە:** بریتی له منداڵێك که هاتووە بە خۆیدا و گەورە بووە (جلال محمود. بەرگی١. ٦١): [کنایه از بچه‌ای که رشد کرده و بزرگ شده است].

**باڵەوازە بووگە:** [برێتی لە یەکێك کە کەڵەشێری ئەخوێنێ و فێری مەکر و فێڵ بووە]: کنایە از کسی کە خروسش خواندە، کلک و حیلەبازی یاد گرفتە. (حیرت.٦٠)

**باڵەوازەبوون:** برێتی لە گەنجێکی تازە پێگەیشتوو کە دەسی کردبێ بە دڵداری (رخزادی.٦٥): [کنایە از جوانی کە تازە در خط عشق و عاشقی افتادە باشد].

**باڵی لێ پەیدا بوو:** خێرا ڕۆیشت، وەك بفڕێت (جلال محمود. بەرگی١. ٦١): [کنایە از این کە با عجلە رفت گویی پرواز کردە].

**باڵیان بڕیوە:** ١) لە جموجووڵیان خستووە: ١) [کنایە از جنب‌وجوش انداختن کسی] ٢) دەسەڵاتیان نەهێشتووە: ٢) [کنایە از، از قدرت انداختن] ٣) هیچیان بە دەستەوە نەهێشتووە (جلال محمود. بەرگی٢. ٢٠): ٣) [چیزی برایش نگذاشتەاند].

**باڵیان بەستووە:** دەسەڵاتیان بڕیوە (جلال محمود. بەرگی٢. ٢٠): [کنایە از این کە او را برکنار ساختند].

**با بە قولا کردن:** برێتی لە دەنەدان و پیاهەڵدانی بە درۆ بۆ کەسێك: هەنی دا ژێر باڵی، کنایە از تعریف و تمجید مبالغەآمیز از کسی کردن.

**با گوڵێ بێتەوە لە کانی:** بۆ گاڵتە پێکردن و تەوسە. واتە: ئەو شتە هەر نابێت و ئەو داخوازییە نایەتە دی (جلال محمود. بەرگی١. ٥٧): برای طعنە: [آن چیز انجام نخواهد گرفت. این مسالە برطرف نخواهد شد].

**با لە سك خۆیا دەر ئەکا:** برێتی لە یەکێك کە قسەی بایخی نییە و تەنیا خەم و کەسەری خۆی خاڵی دەکاتەوە: کنایە از کسی کە حرفهایش اهمیت ندارد و کسی را نمی‌ترساند فقط دق دل خودش را خالی می‌کند.

**با لە کوێوە بێت ئەو لەوێوە شەن دەکات:** برێتی لە یەکێك کە بە پێی ڕۆژ هەڵسووڕێت و لە گەڵ هەموو دەستە و تاقمێکدا خۆی دەگونجێنێت (جلال محمود. بەرگی١. ٥٧): [کنایە از کسی کە مطابق با روز نان می‌خورد و برای تأمین منافعش با هر گروە و دستەای می‌سازد].

**با مەکە قولی:** [واتە: پێیا مەخوێنە و خوڵتەی پێ مەکە، دەنەدان]: کنایە از تعریف و تمجید بی‌مورد کسی، تحریک کردن. (حیرت.٦٠)

**با نۆش لە سەر دەی بێت:** واتە: با ئەم بارەش لەسەر بارەکانی‌تر بێت (جلال محمود. بەرگی١. ٥٨): [کنایە از این کە بگذار این دفعە هم بە دفعات دیگر نیز اضافە شود].

**بارەباری پێ‌خستووە:** بۆ پێکەنین یان سووکی بە یەکێك دەوترێت کە هاواری پێ هەڵسێنرابێت، واتە هێناویەتە گیر و گاز و هاوار و دەس بە دامان (جلال محمود. بەرگی٢. ١٩): [بە عنوان مسخرە بە کسی گفتە می‌شود کە داد و فریادش بلند شود یا تحت فشار قرار گرفتە باشد و استمداد جوید].

**باڵیان شکاندووە:** بێ‌دەسەڵاتیان کردووە (جلال محمود. بەرگی٢. ٢٠): [کنایە از این کە قدرتی را برایش نگذاشتەاند].

**با مەکە قولی:** یان کاڵەك مەخە بن هەنگەڵی: ١) بۆ ئەو کارە دەنەی مەدە: ١) [کنایە از این کە او را تحریک بە انجام آن کار مکن] ، ٢) هانی مەدە و تێژی مەکە. چونکە شایانی ئەوە نییە (جلال محمود. بەرگی٢. ١٩): ٢) [کنایە از این کە او را تحریک مکن زیرا شایستەی آن نیست].

**بامجان پاك ئەکا** (مریوخ.٣): [برێتی لە خۆڵتە کردن: کنایە از چاپلوسی کردن].

**بانگی محەمەد بە ئاشکرا خۆشە:** کاری چاك پێویست

بە شاردنەوە ناکات (جلال محمود. بەرگی١. ٦٢): [کنایە از این کە لازم نیست کار نیک را مخفی کرد].

**باوێژ:** بای نێو زگ: کنایە از باد شکم.

**باوشی بە دنیادا کردووە:** حەزی لە ماڵی دنیا زۆرە، بۆی سووتاوە، چاوی تێر نابێت لەوانەیە رێی چەوتیشی بۆ بگرێت (جلال محمود. بەرگی٢. ٢٠): [کنایە از اشتیاق وافر بە مال دنیا و برای بە دست آوردن آن امکان دارد راه خلاف را هم برگزیند].

**باوەڵێ:** واتە ١) سست و بێبناغە: ١) [کنایە از سست و بیاساس] ٢) پیری پەك كەوتوو کە لە مردندایە (نانەوزانە.٢٥٧): ٢) [کنایە از پیر در شرف مرگ].

**باوەڵێ بایەکی بەسە تێبینی:** ئەم کنایە لەوەوە هاتووە کە باوەڵێ لە سەرجێی خۆی هێند سستە بە فوویەکی سووك، با دەیبا.

**باودیانە:** برێتی لە کەسێك کە کەسێکی بەدڵە: کنایە از باب طبع بودن.

**باومەیلیە:** برێتی لە یەکێك کە شتێك یا کەسێکی بە دڵ بێ: کنایە از باب طبع بودن.

**باوێشکدان:** [برێتی لە ماندوو و شەکەت]: کنایە از خستگی. (حیرت.٦٢)

**باوێشکی بۆ نەدات:** ١) واتە گوێ بە قسەی ئەو نادا، بیری بە لای قسەی ئەوەوە نییە٢) حەزی زۆر لێیە و دەستی ناکەوێت. خەوی پێوە دەبنیێت (رخزادی.٦٦): ١) [کنایە از کسی کە گوش بە حرف دیگری ندهد و حواسش پیش او نباشد] ٢) [کنایە از این کە آرزوی آن را دارد ولی بە دستش نمیرسد. خوابش را میبیند].

**بای بافە (باقە) شێوێنە:** واتە ئاژاوە ئەنێتەوە (جلال محمود. بەرگی٢. ٢١): [کنایە از این کە آشوب بپا میکند].

**بای باڵم بڕیا:** [برێتی لە ماندوویوونی زۆر، لە کاتی ماندوویووندا ئەمە دەڵێن]: کنایە از خستگی زیاد، هنگام خستگی زیاد این کنایە بیان میشود. (حیرت.٦٣)

**بای تێ چووە:** برێتی لە خۆ باییبوون (جلال محمود. بەرگی١. ٥٨): [کنایە از آدم متکبر].

**بای تێ کراوە:** ١) هەڵیان داوە و لە خشتە براوە: ١) [کنایە از فریب خوردە] ٢) هانیان داوە و تێزیان کردووە بۆ ئامانجی خۆیان هەڵیان ناوە و فریویان داوە (جلال محمود. بەرگی١. ٣٢): ٢) [تحریکش کردەاند و برای هدف خودشان او را فریب دادەاند].

**بای دەرێ:** [برێتی لە یەکێك هەموو کاتێ لە ماڵدا نەبێت]: کنایە از کسی کە همیشە در منزل نباشد. (فتاحی قاضی. بەرگی٢. ٢٥)

**بای شانی خۆشە:** ١) کارەکەی لاتاسانە: ١) [کنایە از کسی کە کار پیش او آسان است] ٢) باش بۆی تێ هەڵدەچێت، کارەکە بە دەستیەوە سووك دێت: ٢) [کنایە از کسی کە محکم و اساسی کار را انجام میدهد در نتیجە کارش آسان خواهد شد] ٣) لە کار کردندا گورج و گۆڵە (جلال محمود. بەرگی٢. ٢١): ٣) [کنایە از کسی کە در کار کردن چست و چالاک است].

**بای گوێیان داوە:** هانەهانەیان داوە. تەگبیریان بۆ کردووە (جلال محمود. بەرگی٢. ٢١): [کنایە از او را تحریک کردەاند. او را نصیحت کردەاند و در گوش او خواندەاند].

**بای لە زگی خۆی دەردەکا:** قسەکانی بێبایەخن، کەس پێ ناترسێت. با داخی خۆی هەڵبرێژێت (جلال محمود. بەرگی٢. ٢١): [کنایە از سخن بیارزش، کە کسی بە آن وقعی نمینهد. بگذار غم و ناراحتی خویش را بیان

کند].

**بدەر:** برێتی لە ژنی بێ شەرم: کنایە از زن بی شرم. (مەژار.٥٠)

**بژارە کردن:** خەو لێنەکەوتن لە بەر فکر و خەیاڵ (نانەوازادە.٢٩١): [کنایە از نخوابیدن بە علت ناراحتی فکری یا روحی].

**برای سەڵاحێ:** [برێتی لە کەسێك کە ئاشتی دەوێ]: کنایە از کسی کە صلح و صلاح می‌خواهد. (فتاحی قاضی. بەرگی١. ٤٢)

**بڕبڕەی پشت:** خزمی زۆر نزیك (نانەوازادە.٢٧٧): [کنایە از خویشاوند نزدیک].

**بڕبڕەی پشتە:** ١) خزمێکی زۆر نزیکە: ١) [کنایە از خویشاوند بسیار نزدیک] ٢) پشتیوانێکی گەورەیە، لە کاتی تەنگانەدا بە فریا دەکەوێت (جلال محمود. بەرگی١. ٨٧): ٢) [کنایە از پشتیبان بزرگی است در موقع تنگنا بە کمک می‌شتابد].

**بڕمێن:** برێتی لە مرۆڤی ئازای بە دەستوبردی جوامێر (خاڵ.ف.١١٣): [کنایە از شخص شجاع و رادمرد].

**بڕوێشکردن:** برێتی لە قسەکردن بە هەڵەیی فسیار کەس کەوتە (بروێش‌کردن) واتە کەوتە قسەی بێ کەڵك (خاڵ.ف.١١٤): [کنایە از سخن بی سروتە و درهم و برهم].

**برین دەوەشێنێ، تیماریشی دەکا:** برێتی لە یەکێك کە لە پشتەوە شیر دەوەشێنێ و لە ڕووەوە دەرمانی دەکا: کنایە از فرد دشمن دوست‌نما کە از پشت خنجر می‌زند و در ظاهر تیمارش می کند.

**بزمار لێدان:** فێڵ لە کەسێك کردن (نانەوازادە.٢٨٤): [کنایە از در حق کسی نیرنگ کردن].

**بزن تارەت هەڵناگرێ:** [برێتی لە یەکێك کە نەتوانێ لە ڕەفتار و ئاکاری خراپ دەس هەڵگرێ]: کنایە از کسی کە نمی‌تواند از گفتار یا کردار زشت و ناپسند دست بردارد. (حیرت.٦٧)

**بزنی ئاردخواردگ:** بە کەسێك دەڵێن دارکاری کرابێ (شێخەڵۆ.٢٨): [کنایە از کسی کە کتک خوردە باشد].

**بزووتنەوە:** ١) سەرکەوتنی نرخی شت بەرە بە بەرە: ١) [کنایە از افزایش کم‌کم و بتدریج نرخ اشیا] ، ٢) برێتی لە زیادبوونی ئاو بەرە بە بەرە (خاڵ.ف.١٢٠): ٢) [کنایە از زیاد شدن آب بتدریج].

**بسکەی تێ:** [برێتی لە یەکێکی بەکەیف و زۆر خۆشحاڵ]: کنایە از کسی است کە از خوشحالی در پوست خود نمی گنجد. (حیرت.٦٩)

**بسکەی سمێلی دێ:** برێتی لە یەکێکی زۆر کەیفخۆشە (خاڵ.٩١): [کنایە از آدم خوشحال].

**بشێوە لە دەمیا خێزاوە ئەکا:** [برێتی لە کەسێکی ئاژاوەگێڕ و قسەهاوروبەر نێوان خەڵکی]: کنایە از کسی کە در کار این و آن دوبهمزنی و کارشکنی می کند. (حیرت.٦٩)

**بگرە و بەردە:** هەرا و فەرتەنە و بە گژ یەکدا چوون (جلال محمود. بەرگی٢. ٢٨): [کنایە از آشوب و بلوا و گلاویز شدن].

**بگرە و لێ نیشەیە:** بەرەڵڵاییە، نە یاسای هەیە و نە دەسەڵاتی میری (جلال محمود. بەرگی٢. ٢٨): [کنایە از آزاد و یلە و لاقیدی کە نە قانونی باشد و نە قدرت حکومتی].

**بلەربەزێن:** برێتی لە هاروهاج، بێ ئارام: کنایە از بزن بهادر. (مەژار.٥٨)

**بلقی سەر ئاو:** کەم خایەن و کەم بەهایە (جلال محمود. بەرگی٢. ٢٨): [کنایە از ناپایدار و بی‌ارزش].

**بلوێر بۆ گا لێدان:** راوێژ کردن بۆ گەوج و نەزان (نانەوازادە.٢٩٦): [کنایە از نصیحت کردن کسی کە هیچی بە گوشش نمی‌رود].

**بلوێر بەزێن:** برێتی لە مرۆی بزوز و دانەسەکناو: کنایە از شخص ناآرام. (مەزیر.٥٨)

**بلوێری شەیتانە:** برێتی لە یەکێك کە بە زوانبازی خەڵك فریو بدات (جلال محمود. بەرگی٢. ٢٨): [کنایە از گمراه و آشفتە کردن مردم].

**بلوێری شەیتانی:** [برێتی لە یەکێکی فێڵباز]: کنایە از شخص مکار و زبان فریب و گمراه کنندە. (فتاحی قاضی. بەرگی١. ٤٣)

**بن دە ئاودانەبوون:** شیاوی تەواو بوون، کۆتایی پێهاتنی شتێك (نانەوازادە.٣٠٢): [کنایە از سزاور تمام شدن و بە انتها رسیدن چیزی].

**بن رژان:** نەمانی کچێنی بەر لە مێرد کردن بە هۆی رووداوێك: کنایە از پارە شدن پردە بکارت دختری بە علت حادثە یا رویدادی قبل از ازدواج.

**بن کلکی ئەخورێ:** برێتی لە یەکێك کە حەزی لە جەنگ و ئاژاوە بێ و بیەوێ هەڵیگیرسێنێ (خاڵ.٩٢): [کنایە از کسی کە طرفدار جنگ و دعواست و می‌خواهد آشوب بە پا کند].

**بن کلکی دەخورێت:** حەزی لێ دەکا، حەز لە گەمە، یاری، شەڕ یان هەر شتێکی‌تر (جلال محمود. بەرگی٢. ٢٩): [کنایە از میل و یا آرزوی کاری یا چیزی را داشتن].

**بن کیسە تەکێن (بێخ گیفان تەکێن):** برێتی لە خەڵەتاندن و گیفان خاڵی کردنی یەکێك (قەزات لە گیانم بە درووە سەر لەرزین دلاڵ و بەقاڵ بن کیسە تەکێن): کنایە از فریب دادن کسی و جیب او را خالی کردن.

**بناراوهاتن:** برێتی لە بنەبڕبوون و تیاچوون: کنایە از ریشە‌کن شدن و از بین رفتن.

**بنەجۆگەی شێلاوە:** خەریکە کارەکەی بنج بەست دەکا و بە ئەنجام دەگەینێت (جلال محمود. بەرگی٢. ٢٩): [کنایە از این کە دارد کارش را محکم می کند و بە انجام می‌رساند].

**بنەجۆگەشێلان:** ١) [برێتی لە لێکدانەوەی کارێك بەر لە دەستپێکردن]: ١) کنایە از تە و تو درآوردن کاری قبل از شروع، ٢) [برێتی لە تێکچوون و شڵەژاوی یەکێك دەربڕین]: ٢) کنایە از بیان اوضاع نابسامان و آشفتەی کسی، ٣) [برێتی لە کچێك کە کچێنی نەمابێ]: ٣) پارە شدن پردەی بکارت. (حیرت.٦٩)

**بنەوی شێلیاگە** (مەربوخ.٣): [١) تێکچوون و شەڵەژاوی یەکێك دەربڕین ٢) بە کچێك ئەڵێن کە (بنی) پژیاگ بێ و هیچی نەمابێ: ١) کنایە از منقلب و دگرگون شدن کسی ٢) کنایە از دختری کە پردە بکارتش نماندە باشد].

**بنج دیوار ئەکەنێ و بانە ناو (سواغی سەربان)ی پێ ئەکا:** کارەکەی بە باشی نازانێت و تێبینی ئەنجامەکەی ناکا (جلال محمود. بەرگی٢. ٢٩): [کنایە از کسی کە در کارش دقیق و آگاه نیست و در فکر آخر و عاقبت آن نیست].

**بنجبەست:** سەقامگیر، خۆ گرتوو (نانەوازادە.٢٠٧): [کنایە از نهادینە شدە، استوار].

**بنجبەستکردن:** برێتی لە دامەزراندن و جێ بە جێ کردنی کارێك (خاڵ.ف.١٢٧): [کنایە از جایگیر کردن و انجام دادن کاری].

**بنجداکوتان:** برێتی لە جێگیربوونی شتێك [فسیارکەس

بنجی داکوتا] (خال.ف.١٢٧): (کنایه از استقرار پیدا کردن).

**بنگووسەبالا چل گەزە ریشە:** [برێتی لە منداڵی زیرەك و زانا]: کنایه از بچەی زبر و زرنگ. (حیرت.٨٠)

**بنکۆڵ کردن:** پیلانگێری (نانەوزانە.٣٠٩): [کنایه از توطئەچینی].

**بنکڵێشە:** برێتی لە فکر و بیر، قووڵبوونەوە: کنایه از تأمل، فکر عمیق. (مەژار.٥٩)

**بنوو (بخەفە) بێتە خەوت:** بە تەوەسەوە، برێتی لە یەکێ کە بە تەمای شتێك بێت و هەرگیز پێی نەگات (جلال محمود. بەرگی١. ٩٠): [برای طعنه است و کنایه از کسی که به امید چیزی باشد و هیچوقت به آن نرسد].

**بنەهەبوون:** کچێك کە کچێنی بنی هەڵنەگیراوە (نانەوزانە.٣٠٢): [کنایه از دختری که دارای پرده بکارت است].

**بنی لە ئاودا نییە:** ١) واتە کۆتایی دێت و دەستی پێوە بگرە: [کنایه از تمام می‌شود] ٢) تەواو بووە و نەماوە (جلال محمود. بەرگی٢. ٩٥): [کنایه از تمام شده و نمانده].

**بنێشتی مەلای مەزبوورە:** برێتی لە دارایی و ماڵی بەرچاو (نانەوزانە.٣١٥): [کنایه از مال و ثروت زیاد].

**بو لای دیوار خاسە:** برێتی لە یەکێکی بێکارە و لێنەهاتوو: کنایه از آدم نالایق.

**بوخچەی نەکراوە:** برێتی لە کوڕێك کە هێشتا ژنی نەهێنابێ (خال.ف.١٣١): [کنایه از پسری که هنوز ازدواج نکرده باشد].

**بوچ:** برێتی لە (...) ژن: کنایه از فَرجِ زن. (مەژار.٦١)

**بوغە:** پیاوی قەڵەو و زگزل و مل ئەستوور (نانەوزانە.٣٢٠): [کنایه از آدم چاق و شکم گنده و گردن کلفت مغرور].

**بوکسەوات کردن:** لە سەرجێی خۆ بوون و پێش نەکەوتن لە شتێك یا کارێك (نانەوزانە.٣٢٣): [کنایه از سرجای خود بودن و در کار یا مسئله‌ای پیشرفت نکردن].

**بوڵبوڵی نەخوێنێ:** [برێتی لە یەکێکی خۆ هەڵکێش و دەماراوی]: کنایه از آدم پرمدعا. (حیرت.٨٠)

**بۆ ئاگر هاتووی:** [برێتی لە هاتنی بەپەلەی یەکێك بۆ جێگایێك و خێرا بگەڕێتەوە، لە رابوردودا ئاگریان لە شوێنێکەوە ئەبرد بۆ شوێنێکیتر دەبوا بەخێرا بیانبردایە چون ئاگرە کە دەکوژایەوە. بەو بۆنەوە دەڵێن مەگەر بۆ ئاگر هاتووی]: کنایه از به محض رسیدن می‌خواهی مراجعت کنی. (حیرت.٧٠)

**بۆ دە کەس خۆی ناخورێنێ:** برێتی لە یەکێکی ئازا و بوێر: کنایه از آدم شجاع.

**بۆ شۆن مامان خاسە:** [بە یەکێکی تەمەڵی لێنەهاتوو دەڵێن]: کنایه از آدم تنبل و بی‌عرضه. (حیرت.٧٨)

**بۆ نۆك و نەخۆشەرمکەی نەگەڕێ:** واتە زۆر لە سەر ئەو قسە ئەڕوا (رخزادی.٧٧): [کنایه از زیاد به مسئله یا سخنی پرداختن و توجه کردن].

**بۆ هیچکە شیر نادات:** کەڵك و خەیری بۆ کەس نییە: کنایه از کسی که نفعش به دیگران نمی‌رسد.

**بۆتە بنی قاوەی:** [برێتی لە یەکێك کە کەم دێتە نێوی خەڵك]: کنایه از کسی که کمتر در انظار ظاهر شود، منزوی. (فتاحی قاضی. بەرگی١. ٤٩)

**بۆژۆ کردن:** برێتی لە سەرکردنە سەر یەکێك و بێزار کردنی (خال.ف.١٣٤): [کنایه از آزار دادن و رنجاندن

کسی].

**بۆران کردن:** برێتی لە تووڕەبوون: کنایە از عصبانیت.

**بۆرە خزم:** خزمێکی دوور (جلال محمود. بەرگی۱. ۹٦): [کنایە از فامیل دور].

**بۆرە سوار:** سوارێکی هەژار. سوارێك کە ناودار و ناسراو نەبێت (جلال محمود. بەرگی۱. ۹٦): [کنایە از سوارکار فقیر، سوارکاری کە معروف و مشهور نباشد].

**بۆسۆ کردن:** بەدناو کردن (نانەوزانە.۳۳۰): [کنایە از بدنام کردن کسی].

**بۆسۆ لێ هەستان:** برێتی لە بڵاوبوونەوەی دەنگوباسێکی ناشیرین بە یەکێکەوە: کنایە از شایعەی ناجور و نامناسب در بارە کسی.

**بۆسۆ لێهەڵنەسان:** برێتی لە زۆر ڕووتی و هەژاریی یەکێك [فسیار کەس ئەوندە ڕووتە بۆسۆی لێ هەڵناسێ (خاڵ.ف.۱۲٤)]: [کنایە از شخص بسیار فقیر].

**بۆسۆبوون:** بەدناوبوون (نانەوزانە.۳۳): [کنایە از بدنام شدن].

**بۆنی خوێنی لێ دێت:** بە قسەیەك یان شوێنێك یان ڕۆژگارێك دەوترێت کە چاوەڕێی کوشتار و خوێنڕشتنیان لێ بکرێت (جلال محمود. بەرگی۲. ۳۱): [کنایە از سخنی یا مکانی یا دورانی کە بوی خون و کشتار از آن می‌آید و احتمال وقوع حادثەایی وجود دارد].

**بۆنی شیری خاو لە زاری دێ:** [برێتی لە یەکێکی منداڵ و بێئەزموون]: کنایە از کسی کە هنوز جوان و بی‌تجربە است. (فتاحی قاضی. بەرگی۱. ٤۹)

**بۆنی کردووە:** ۱) نهێنی یان تاوانەکە ئاشکرا بووە: ۱) راز و گناە آشکار شدە ۲) پیاوێك کە ڕیسوا بووە، ناوی زڕاوە: ۲) کنایە از مردی کە بدنام شدە و آبرویش رفتە باشد.

**بۆی تێچاند:** قسەی بۆ هەڵبەست بوختانی بۆ کرد، خەڵکی لێ هاندا (جلال محمود. بەرگی۱. ۹۸): [کنایە از این کە حرف برایش درآورد و بهتان کرد، و مردم را نسبت بە او تحریک کرد].

**بۆی پینە کرد:** [برێتی لە داپۆشینی نەنگی یەکێك و چاککردنی هەڵەی کەسێك]: کنایە از عیب او را پوشانید و اصلاح کرد. (فتاحی قاضی. بەرگی۱. ٤۸)

**بۆی خوێنی لێ تێ:** [برێتی لە ئەگەری ڕوودانی کارەساتێك لە لایان کەسێکەوە]: کنایە از احتمال و وقوع فاجعەایی از طرف کسی. (حیرت.۸۳)

**بۆی خوێنی لێ هاتووە:** ئەگەری کوژرانی هەیە: کنایە از احتمال قتل و کشتار در کار بودن.

**بۆی شۆردەوە:** [نەنگ و ناتەواوی یەکێك چاك کردن]: کنایە از عیب کسی را اصلاح کردن. (فتاحی قاضی. بەرگی۱. ٤۸)

**بوو بە مووی لووت:** برێتی لە یەکێك کە تۆ لێ وەڕس بیت و ئەو لێت نەبێتەوە (خاڵ.۹۸): [کنایە از کسی کە از او بیزار باشی ولی او از تو دست‌بردار نیست].

**بووگە داچکە خۆشەی دمە ئەم و ئەو (بنێشتە خۆشەی زاری ئەم و ئەو):** واتە خەڵکی هەمیشە باسی دەکەن، سا لە حەسوودیدا یا بە چاکە، یا بە خراپە، هەمیشە ناوی دەبەن: کنایە از مردم از او می‌گویند چە از حسودی، یا خوبی یا بدی باشد.

**بووکی بەهار:** گوڵ (نانەوزانە.۳٤۳): [گل].

**بووکی دانەبەزیو:** کچێك کە لە نێو ماڵدا دەست لە هیچ نەدا و کاران نەکا (نانەوزانە.۳٤۳): [کنایە از دختری کە در منزل دست بە سیاە و سفید نزند].

**بووکی ڕۆژ:** هەتاو، خۆرەتاو (نانەوزانە.۳٤۳): [خورشید].

**بووکی سوور:** بووکێك کە کچ بێ و بێوەژن نەبێ (نانەوازادە.٣٤٣): [کنایە از عروسی کە دختر باشد نە بیوەزن].

**بووکی مالآن:** کچی کارزان و کارکەر (نانەوازادە.٣٤٣): [کنایە از دختری کاردان و کاری].

**بوون:** برێتی لە دارایی و دەست ڕۆیین (خال.ف.١٢٨): [کنایە از ثروتمند بودن].

**بوونەئاو:** ١) بە خۆدا شکانەوە لە بەر ئاشکرابوونی مەسەلەیەك، خەجالەت بوونەوە (نانەوازادە.١٤١): [کنایە از شرمندە شدن].

**بۆی ڕۆیشتن:** [گومان بۆ دۆزینەوە و زانینی شتێك]: حدس می‌زند. (حیرت.٨٥)

**بە ئاسماندا چوو (چوویە حەوادا):** ١) زۆر تووڕە بوو: ١) [کنایە از بسیار عصبانی و خشمگین شدە] ٢) ڕاچەڵەکی. خێرا پەڕی (جلال محمود. بەرگی١. ٦٢): ٢) [یکە خورد. سریع برخاست].

**بە ئاگر کەسێ سووتیان:** برێتی لە یەکێك کە بە بۆنەی سووچ و تاوانی یەکێکیترە: تووشیار بێت: کنایە از کسی بە واسطە گناە دیگری گرفتار شود.

**بە ئاوادان:** برێتی لە بەفێڕوودان: کنایە از حرام گردانیدن. (مەزیر.٦٦)

**بە ئاودا دان:** فەوتاندنی پارە و دەسمایە و سامان، دە ئاو کردن(نانەوازادە.١٤١): [کنایە از نابوود کردن پول و سرمایە].

**بە ئاودا هاتن و بە ئاندا خوران:** لە پڕا ونبوون و بێ‌هێچ شوێن پێیەك(نانەوازادە.١٤١): [کنایە از ناپدید شدن ناگهانی بدون باقی گذاشتن هیچ اثری].

**بە ئاویدا دا (بە بایدا):** برێتی لە، لە دەستیدا. بە فیڕۆی دا. فەوتاندی (جلال محمود. بەرگی١. ٦٢): [کنایە از آن را بیهودە از دست داد و نابودش کرد].

**بە با چوو:** ١) فەوتا، لە ناو چوو: ١) [از دست رفت، از بین رفت] ٢) بە فیڕۆ ڕۆیشت (جلال محمود. بەرگی١. ٦٣): ٢) [بیهودە از دست رفت].

**بە باڵ یەکیتر پەڕین:** [بە بۆنەی دەسەڵاتی کەسێکیترەوە دەسی ئەڕوا]: کنایە از کسی کە توانایش بە خاطر قدرت کس دیگری است. (حیرت.٨٤)

**بە باڵای براوە:** برێتی لە یەکێك کە هەمیشە دەبێت گرفتار بێت، وای بۆ بڕاوەتەوە (جلال محمود. بەرگی١. ٦٣): [کنایە از کسی کە همیشە باید گرفتار باشد، سرنوشتش چنین است].

**بە بڕشت:** برێتی لە مرۆڤی دەم ڕاستی فەرمان ڕەوا (خال.ف.١٤٠): [کنایە از آدم سخن‌دان و توانا].

**بە بلوێری تۆ هەڵ ناپەڕین:** واتە بە قسەی تۆ ناکەین، فریوناخۆین، بە فشاڵی تۆ بڕوا ناکەین (جلال محمود. بەرگی٢. ٢١): [کنایە از این کە بە سخن تو عمل نمی‌کنیم. فریب نمی‌خوریم. بە لاف و گزاف تو اعتماد نمی‌کنیم].

**بە بلوێری کەسێك هەڵپەڕین:** بە قسە و مەیل و هەوای کەسێك جووڵانەوە (نانەوازادە.٢٩٦): [کنایە از بە میل کسی رفتار کردن].

**بە بووك بردن:** [برێتی لە بێ ئابڕووکردنی یەکێك لە نێو خەڵکا]: کنایە از کسی را در انظار عام رسوا کردن. (فتاحی قاضی. بەرگی١. ٥٣)

**بە بێ ئەو پەنچە ناکا بە ئاوا:** واتە: زۆر فەرمانبەریەتی: کنایە از بسیار مطیع بودن.

**بە بێ‌شمشاڵ (دەهۆڵ یان زوڕنا هەر دەیژەنێت، هەڵدەپەڕێت):** بە یەکێك دەڵێن کە بە بێ هۆیەك

کەوتبێتە جرت و فرت (جلال محمود. بەرگی۲. ۲۱): [کنایە از کسی کە بدون هیچ دلیلی سر خود را شلوغ کردە و جست و خیز می‌کند].

**بە تۆزی پێیدا ناگەیەت:** واتە زۆر خێرا دەروات (جلال محمود. بەرگی۲. ۲۲): [کنایە از تند و سریع رفتن].

**بە تالان چوو:** ۱) بە هەرزان فرۆشرا: ۱) [کنایە از ارزان فروختن] ۲) لە دەست چوو، بە فیڕووڕۆشت (جلال محمود. بەرگی۲. ۲۲): ۲) [از بین رفت، بە هدر رفت].

**بە تەقەی تفەنگ بێرەدا ناڕوات:** واتە قەت سەردانی ئێرە ناکات (جلال محمود. بەرگی۲. ۲۲): [کنایە از اصلاً از این طرفها گذری نمی‌کند].

**بە تەمای شیری مانگا بۆر:** بە تەوسەوە بە یەکێك دەوترێ کە مرخی لە شتێك خۆش کردبێت (جلال محمود. بەرگی۲. ۲۲): [برای طعنە است. کنایە از کسی کە هوس چیزی را در سر داشتە باشد].

**بە تەنگەوە دێ:** بریتی لە یەکێك کە دڵی بۆ کارەیك یان بۆ کسێك دەسووتێت و دڵسۆزە (جلال محمود. بەرگی۱. ٦٥): [کنایە از کسی کە دلش برای کاری یا کسی می‌سوزد و مهربان است].

**بە تڕ گۆزەڵە ئەشکێنێ:** بریتی لە یەکێك کە زۆر بەدەمارە (رخزادی.۸۲): [کنایە از شخص متکبر].

**بە ترێ بەنە:** بریتی لە شتێکی بێ دەوام: کنایە از چیز بسیار سست و ناپایدار. (فتاحی قاضی. بەرگی۲. ٤١/ جلال محمود. بەرگی۱. ٦٥)

**بە تویکل:** بریتی لە وتەیەك کە دوو واتای ببێ (خال.ف.١٤١): [کنایە از گفتەای کە دو معنا داشتە باشد].

**بە تیرێك دوو نیشان دەپێکێت:** بە قسەیەك یان کردارێك دوو ئامانج دێنێتە دی (جلال محمود. بەرگی۱. ٦٥): [کنایە از کسی کە بە سخنی یا روشی بە دو هدف می‌رسد].

**بە پارە قەمچان ئەکا:** بریتی لە دەوڵەمەندبوون (معروف.٢٥): [کنایە از آدم بسیار ثروتمند].

**بە پاوە ئاو بردگیە:** بریتی لە مرۆڤی لاواز و ناتەوان: کنایە از انسان لاغر و ناتوان.

**بە پای خۆی چوو بۆ قەسلوخانە** (ئەمومن.٧٦): [بریتی لە کەسێك خۆی چوویێتە پێشوازی مەرگ: کنایە از کسی کە خود بە استقبال مرگ رفتە باشد].

**بە پای گیان:** بریتی لە زۆر بوونی شتێك: کنایە از زیادی و فراوانی چیزی است.

**بە پەتی خەڵك خۆت مەخنکێنە:** بریتی لە یەکێك کە چاو لە گەورەتر و تواناتر لە خۆی بکات (جلال محمود. بەرگی۱. ٦٤/ خال.١٠٥): [کنایە از کسی کە از بزرگتر از خود و قوی‌تر از خود تقلید و پیروی کند].

**بە پەڕێك سەر دەبڕێت:** بریتی لە یەکێکی ساویلکە و بێ‌دەسەڵاتە (جلال محمود. بەرگی۱. ٦٤): [کنایە از فرد سادەلوح و ناتوان].

**بە پەلەپیتکە (پلتووک) خۆی دەتەکێنێت:** ۱) خۆی زۆر پاك و خاوێن ڕادەگرێت: ۱) [کنایە از کسی کە بسیار خود را پاک و تمیز نگهدارد] ۲) بێزی نایەت خۆی بگەیەنێتە هیچ کارێك، فیزی زلە (جلال محمود. بەرگی۱. ٦٤/ رخزادی.٨١): ۲) [کنایە از میل ندارد در هیچ کاری خود را دخالت دهد، زیاد افادە دارد].

**بە پێ فیلانە:** [بریتی لە زۆربوونی شتێك]: کنایە از زیادی و فراوانی چیزی است. (فتاحی قاضی. بەرگی۱. ٥٤)

**بە پیری فێر پلاو خواردن بووگە:** واتە دوای تەمەنێکی درێژ تازە فێری ڕەسم و یاسای مەدەنی بووە (رخزادی.٨١): [کنایە از کسی کە بعد از سال ها تازە آداب و رسوم

شهرنشینی را یاد گرفته].

**بە پێی گیان:** بە شتی زۆر فراوان دەوترێ (جلال محمود. بەرگی۲. ۲۲): [کنایه از چیز بسیار زیاد].

**بە پێیە:** بریتی لە یەکێك کە لە ڕۆیشتندا گورج و گۆڵە. باش دەڕوات و ماندوو نابێت (جلال محمود. بەرگی۱. ٦٥): [کنایه از کسی که در راه رفتن تند و سریع و خسته نمی‌شود].

**بە جارِیا نەچووگە:** [بریتی لە یەکێك کە بە هیچ جۆرێك لە کارێکدا سەردرنایەرێت] (حیرت.٨٦): کنایه از کسی که در کاری به هیچ وجه وارد نباشد.

**بە جەڕ بەندە:** [بریتی لە دوو شت یا دوو کەس کە پێکەوەبوونیان زۆر لەڕ و لاوازە و ناسکە و هەردەم دەشێ کە لە یەك ببچڕێت]: کنایه از اتصال و پیوستگی میان دو چیز یا دو کس ضعیف و ناپایدار است. (فتاحی قاضی. بەرگی۱. ٥٥)

**بە جەرگە (جەرگی قایمە):** ۱) دلێر و نەترسە: ۱) [کنایه از شجاع و نترس] ۲) بەرگەگرە ـ دڵی قایمە (جلال محمود. بەرگی۱. ٦٦): ۲) [تحمل‌دار و صبور، مطمئن].

**بە جەستەم بی:** واتە تووشی ڕۆژڕەشی من بێت: کنایه از اینکه به حال و روز سیاه من دچار شوی.

**بە حەفت ئاو شۆریاگەسەو شۆراوەتەوە:** [بریتی لە شتێکی زۆر پاك و خاوێن]: کنایه از چیزی بسیار تمیز. (حیرت.٨٨)

**بە حەوت ئاو پاکی نایەت:** بریتی لە یەکێك کە زۆر ناپاك و پیسە: کنایه از شخص یا چیز ناپاك و کثیف.

**بە حینجە و فینجەیە:** بریتی لە یەکێك کە زۆر بەبڕوبیانووە (جلال محمود. بەرگی۱. ٦٧): [کنایه از کسی که بسیار بهانه‌گیر است].

**بە حینجەوە لەبەریەتی:** بریتی لە یەکێك کە شتێك بە هەموو لك و لۆ و پەراوێزیەوە بزانێت (جلال محمود. بەرگی۱. ٦٧): [کنایه از کسی که چیزی را با همه شاخ و برگ و حاشیه‌اش می‌داند].

**بە خۆیدا چووەوە:** بریتی لە یەکێك کە بیری لە هەڵسوکەوتی خۆی کردەوە، خۆ هەڵسەنگاند و هەڵەکانی ڕاست کردەوە (جلال محمود. بەرگی۱. ٦٨): [کنایه از کسی که فکر شکست و پیروزی خود را کرده آن را سنجیده و اشتباهاتش را تصحیح کرده است].

**بە خەو نەمدیگە:** واتە بە خەیاڵ و بیر و بۆچوونما نەهاتووە: کنایه از به خیال و تصور نیامدن.

**بە خلەیی بردەسەر:** بە ئازایی و بێباکی ژیانی بردەسەر (شنیخەلا.٣٧): [کنایه از با شجاعت زندگی را سپری کردن].

**بە خوێن خۆی بازی ئەکا:** واتە خۆی خستوەتە مەترسییەوە: کنایه از خود را به مخاطره افکندن، خواهان نابودی خود شدن.

**بە خوێنی سەری تینگە:** [بریتی لە یەکێك کە لە گەڵ ئەودا دژمنایەتی هەیە]: کنایه از کسی که با او سخت دشمن است. (فتاحی قاضی. بەرگی۱. ٥٦)

**بە خێر چی:** [واتە خوا لەگەڵتا بێ]: کنایه از خدا همراه باد. (فتاحی قاضی. بەرگی۱. ٥٦)

**بە خێر و دۆشایی:** [بریتی لە ناساخی]: کنایه از ناسلامتی. (فتاحی قاضی. بەرگی۱. ٥٦)

**بە دۆش دەیژەنێت:** ۱) بە هەموو شتێك قایلە، شلە، دادەمرکێت: ۲) بریتی لە یەکێك کە زۆر گیرۆدەی دەستی هەوەسە (جلال محمود. بەرگی۱. ٧٢): ۱) [کنایه از به همه چیز راضی است، سست است، فروکش می کند] ۲) [کنایه از آدمی که بسیار اسیر شهوت است].

**بە داخ کەسێکەوە سەر نیان:** [برێتی لە مردن]: کنایە از مردن. (حیرت.٨٩)

**بە داروبارە:** [برێتی لە یەکێکی کەڵەگەت]: کنایە از شخص تنومند و درشت هیکل. (فتاحی قاضی. بەرگی٢. ٤٣)

**بە دانەی کشمیش دەمڵ دەرتێری:** [واتە بە بووچکترین ئازار توورە و ئاڵۆز دەبێ]: کنایە از با کمترین آسیب به او ناراحت و عصبانی خواهد شد. (حیرت.٩٠)

**بە دانەی هاڵە سەردی ئەکا:** [برێتی لە زوو ئەرەنجێ و ئەتۆرێ]: کنایە از آدم نازنازی و زودرنج. (حیرت.٩٠)

**بە دەرزی بیر هەڵ دەکەنێت:** ١) دەیەوێت کارێکی گەورە بە توانایەکی کەم بێنێتە ئەنجام: ١) [کنایە از کسی کە کار بزرگی را با توان اندک می‌خواهد انجام دهد] ٢) بە پیاوێکی تێکوشەرو وردبین دەڵێن: ٢) [کنایە از آدم تلاشگر و بادقت] ٣) زۆر خۆگرە (جلال محمود. بەرگی٢. ٢٣) ٣) [کنایە از بسیار صبور].

**بە دەس مەردم مار ئەگرێ** (مریوخ.٤): ١) [برێتی لە یەکێك، کە بە سەر ماڵی خەڵکەوە پیاوەتی بکا]: ١) [کنایە از کسی کە از مال و ثروت دیگران بخشش کند] ٢) [واتە بەم و بەو مەردوم بترسێنێت]: ٢) [کنایە از بە وسیلە این و آن دیگران را بترساند].

**بە دەسێ دوو هەنی (کاڵەك) هەڵ ئەگرێ:** لە توانای خۆی پتر هەوڵ دەدا (جلال محمود. بەرگی٢. ٢٣) [کنایە از با یك دست دو هندوانە یا خربزە برمی‌دارد: بیش از توان خویش زحمت می کشد].

**بە دەست و دڵە:** خێراخوازە، بەخشندە (جلال محمود. بەرگی١. ٦٩) [کنایە از خیرخواە و بخشندە].

**بە دەستە:** دەستی دەڕوات. دەسەڵاتی زۆرە، لە هەر ڕوویەکەوە بێت بەتوانایە (جلال محمود. بەرگی١. ٧٠) [کنایە از تواناست. بسیار قدرتمند است، از هر جهت توانا و قادر است].

**بە دەستداکەوت:** فەوتا، شتێکی بە سەر هات، (دایکەکە دەڵێت: دەترسم کورەکەم بە دەستێکدا بکەوێت) (جلال محمود. بەرگی٢. ٢٣) [کنایە از این کە از بین رفت و دچار صدمەای شد و بلایی بر سرش آمد].

**بە دەستی (سەگدا) دەنووسێ:** ڕقاوی و توورەیە (جلال محمود. بەرگی٢. ٢٣) [کنایە از عصبانی و خشمگین است].

**بە دەستی بەتاڵ گەڕایەوە:** ١) هیچی دەست نەکەوت: ١) [چیزی دستگیرش نشد] ٢) لە کارەکەیدا سەرنەکەوت: ٢) [در کارش پیروز شد] ٣) نائومێد و مایوس بوو (جلال محمود. بەرگی٢. ٢٣) ٣) [ناامید و مأیوس شد].

**بە دەسیەوە موو ئەڕێسێ:** لێی دەترسێ و مەرایی بۆ دەکا (جلال محمود. بەرگی٢. ٢٣) [کنایە از این کە از او می‌ترسد و نسبت بە او چاپلوسی می کند].

**بە دەم ئەوا ئەڕوانێ:** گوێ لەمستبوون، دەست لە فرمان: کنایە از مطیع و فرمانبردار کسی بودن هموارە برای اجرای امر کسی آمادە بودن.

**بە دەم دایناوە:** بە دایك یا باوکێك ئەوترێ کە مناڵەکەی زۆر لە خۆی بچێ: کنایە از پدر و مادری کە فرزندشان شبیە بە خودشان باشد.

**بە دەم کێیا بساووم:** [برێتی لە شتێکی کەم]: کنایە از چیز بسیار کم. (حیرت.٩٢)

**بە دەم و بە دەس تێی وەشیاگە:** واتە زۆر بە گەرمی دەستی داوەتە ئەوکارە: [کنایە از این کە با جدیت بسیار کار را شروع کردە است]. (رخزادی.٨٧)

**بە دەم و پلە:** ١) قسەزانە. لە قسە کردندا گوستاخە:

١) [سخن‌دان است در حرف زدن بی‌شرم است] ٢) دەم هەراشە (جلال محمود. بەرگی٢. ٢٣): ٢) [پرحرف، پرچانە].

**بە دەم یەکدا نقیونەتەوە:** واتە: ئەوەی ئەم دەیلێت ئەویش هەر ئەوە دەڵێتەوە، لە پێشەوە تەگبیریان کردووە (جلال محمود. بەرگی١. ٧١): [کنایە از چیزی کە این می‌گوید او هم همان را می‌گوید یعنی از قبل با هم تدبیر کردە‌اند و بە توافق رسیدە‌اند].

**بە دەمییەوە دا:** جڵەوی بۆ شل کرد. بەرەڵای کرد (جلال محمود. بەرگی١. ٧١): [کنایە از او را آزاد گذاشتە. آزاد و رهایش گذاشت].

**بە دەمیدا دا:** ١) قسەکەی پێ بڕی: ١) [سخنش را قطع کرد] ٢) بە گژیدا چوو بەرپەرچی دایەوە (جلال محمود. بەرگی١. ٧١): ٢) [گلاویزش شد. در میان سخنش آمد].

**بە دەنکە جۆیەك دەزەرێت (دەسەرێنێت):** بە یەکێکی تێنەگەیشتوو و ناتەواو دەوترێت کە زوو لە خۆی بایی بێت بۆ سووکی وای پێ دەگوترێت (جلال محمود. بەرگی١. ٧١): [کنایە از آدم ناآگاە و ناقص کە زود مغرور شود برای رسوایی گفتە می‌شود].

**بە دەوار بێ:** [واتە کلۆڵ و ڕۆژ ڕەش بێت]: کنایە از بدبخت و سیەروز شوی. (فتاحی قاضی. بەرگی١. ٥٨)

**بە دەور خۆیا ئەگەڕێ:** برێتی لە ئاوارەبوون و سەرلێشێویاگی: (جلال محمود. بەرگی٢. ٢٣) [کنایە از آوارە شدن و سرگردانی].

**بە دەور خۆیدا دێت:** دەست بە خۆیدا دێنی و خۆی دەڕازێنێتەوە، بەرگی جوان دەپۆشێت (جلال محمود. بەرگی٢. ٢٣): [کنایە از خود را زیبا می‌کند و لباس زیبا می‌پوشد].

**بە دزی ئیزرائیلەوە ئەگەڕێ:** برێتی لە پیرێکی کەنفت کە وەختی مردنی هاتووە (خال.١١٢): [کنایە از پیرمردی پیر و افتادە و در شرف مرگ].

**بە دڵ ئەو سەما دەکات:** بە حەز و خواستی ئەو هەڵ دەسووڕێت (جلال محمود. بەرگی٢. ٢٣): [کنایە از بنا بە میل او رفتار می‌کند].

**بە دڵ و داو (داونی) بە تاسە و حەز دەڵێن:** بە دڵ و داو کراسێکم کڕی بەڵام بابم نەیهێشت لەبەری بکەم (جلال محمود. بەرگی٢. ٢٣): [کنایە از با علاقە و آرزو پیراهنی خریدم اما پدرم نگذاشت او را بپوشم].

**بە دڵ و دەروون:** ١) بە ڕەحم و بەزەیی. دەڵێن ئەو پیاوە گەلێك چاکە لەگەڵ ئاتاج و موحتاج دەکا، بە ڕاستی پیاوێکی بە دڵ و دەروونە. بە دەست و دڵە: ١) [کنایە از مهربان بودن می‌گویند بسیار نیکی در حق نیازمندان و محتاجان می‌کند در واقع او مردی مهربان و بخشندە است، سخی و سخاوتمند است] ٢) لە باری دەروونییەوە خۆڕاگرە (جلال محمود. بەرگی٢. ٢٣): ٢) [کنایە از لحاظ درونی مقاوم است].

**بە دڵەوە نووسان:** برێتی لە خواردن و خواردنەوەیەك کە لەسەرخۆ و بە حەسانەوە بێ (نانەکەم بەدڵەوە نووسا) (خال.ف.١٤٤): [کنایە از خوردن و آشامیدن آرام و بدون عجلە].

**بە دڵیەوە نووسا:** برێتی لە یەکێك کە خۆشی لە خواردن یا شتێك بێت (جلال محمود. بەرگی١. ٧٢): [کنایە از کسی کە غذایی یا چیز دوست داشتە باشد و باب طبعش باشد].

**بە دڵیدا نایەت:** بیری لێ ناکاتەوە (جلال محمود. بەرگی١.

۷۲): [کنایه از به فکر آن نمی‌افتد و به آن نمی‌اندیشد].

**بە دوو براو کڵاوێکیان هەیە:** بریتی لە دوو کەس کە بە هاوبەشی شتێکیان هەبێت (جلال محمود. بەرگی۱. ۷۲): [کنایه از دو نفر که به شراکت چیزی را دارند و یا در یک چیز سهیم‌اند].

**بە ژێر دەست و پێوە بوو:** ۱) لە ناو چوو: ۱) [کنایه از، از میان رفت و گم شد] ۲) شپرزە و پەرێشان بوو (جلال محمود. بەرگی۱. ۷۸): ۲) [کنایه از پریشان حال شد].

**بە ژێر لێوەوەی کرد:** ۱) شاردیەوە: ۱) [کنایه از مخفیش کرد] ۲) بە تەنگیەوە نەهات: ۲) [کنایه از به کمکش نیامد] ۳) پشت گوێی خست (جلال محمود. بەرگی۱. ۷۸): ۳) [کنایه از پشت گوش انداخت].

**بە ڕۆڵەی گڵ بی:** [بریتی لە ئەوە کە بمریت و تیابچی]: کنایه از بمیرد و نابود شود. (فتاحی قاضی. بەرگی۱. ۵۸)

**بە ڕانی خۆیدا دا:** ۱) دلگرانی و خەفەتی خۆی پێشان دا: ۱) [ناراحتی و غم و غصەی خویش را نشان داد]. ۲) پەشیمان بووەوە (جلال محمود. بەرگی۲. ۲٤): ۲) [پشیمان شد].

**بە زاری خۆی هاوار دەکا:** [واتە زۆر حەز ئەکا]: کنایه از تمایل بسیار. (فتاحی قاضی. بەرگی۲. ٤٤)

**بە زبان شێر ئەکاتە ڕێوی:** واتە زبانی زۆر شیرینە (خال.۱۱۹): [کنایه از آدم خوش‌زبان، کنایه از آدم چرب‌زبان].

**بە زوان پیاگ ئەگەڕێ:** واتە زوانبازە (رخزادی.۹۱): [کنایه از چرب زبان].

**بە زوان خۆی بردگە بەرەوە** (ئەمومن.۲٤۷): [بریتی لە یەکێك کە خۆی لای کسێکی ترەوە شیرین بکا، بە کەسێکی بەدەم و زوان ئەڵێن: کنایه از کسی که پیش کس دیگر چاپلوسی و شیرین زبانی کند، کنایه از شخص ناطق و سخنور].

**بە زوان گەڕیان:** [بۆ وێنە: بە زوان پیاگ ئەگەڕێ: بریتی لە یەکێك کە بە قسەی مرۆڤ ئەکات و قسە ئەژنەوێ]: کنایه از کسی که به میل آدم رفتار می‌کند و آدم حرف‌شنویست. (حیرت.۹٦)

**بە زوان مەل و مور قسە کردن:** [بریتی لە یەکێك کە چەند زوان دەزانێ، بریتی لە یەکێکی چەنەباز و زۆروێژ]: کنایه از آدمی که چند زبان می‌داند، کنایه از آدم پرحرف و پرچانه. (حیرت.۹٦)

**بە زوان مرۆڤ ئەگرێ:** [بریتی لە یەکێکی فێڵباز]: کنایه از شخص مکار و زبان‌باز. (حیرت.۹٦)

**بە ساقە سەری ئەژێت:** [بریتی لە یەکێکی نەدار کە بە یارمەتی مرۆڤی‌تر ئەژێ]: کنایه از کسی که با کمک دیگران زندگی می‌کند. (حیرت.۹۷)

**بە سەر پاوە ناوێسێ:** [(۱) بریتی لە یەکێکی زۆر خۆشحاڵ و بەکەیف]، [(۲) بریتی لە منداڵی هار و هاج]: ۱) کنایه از کسی که از شادی در پوست خود نمی‌گنجد، ۲) کنایه از بچه شلوغ. (حیرت.۹۸)

**بە سەر پاوە دەچم:** [بریتی لە یەکێك کە پەلەی بێ ئەڵێ ئەوەندە ناخایتێ زوو هەڵ ئەگەڕێمەوە]: کنایه از کسی که عجله داشته باشد می‌گوید زود برمی‌گردم. (فتاحی قاضی. بەرگی۲. ٤٥)

**بە سەر گشتمان تێ:** [بریتی لە بەڵا و ڕووداوی ناخۆش و شتێکی خراپ کە گشتییەو بۆ هەموو کەسێك ڕووئەدات وەکوو پیری و بێ هێزی و نەخۆشی]: کنایه از مصیبت و رویدادهای ناخوشایند که برای همه کسی اتفاق می‌افتد مانند پیری و ناتوانی و بیماری. (حیرت.۹۸)

**بە سەر هاتن نە بە پا:** واتە بە تامەزرۆییەوە بەدووی

کارێکدا چوون: کنایه از آماده شدن برای انجام کاری با اشتیاق.

**بە سەرپاوە مردگە** (ئەمومن.٤٧): [برێتی لەیەکێکی لەرولاواز و بێهێز و ناتەوان کنایه از شخص لاغر و مردنی و ناتوان].

**بە سەرگێران:** لە خەریک کردنی یەکێك و سەرلێ تێکدانی (خال.ف.١٦٨): [کنایه از مشغول کردن کسی با حیله و نیرنگ].

**بە سەری دەبات:** ١) بە هەڵەیدا دەبات: ١) [کنایه از او را دچار اشتباه می‌کند] ٢) گومڕای دەکات: ٢) [کنایه از او را به گمراهی می‌اندازد] ٣) ماندووی دەکات (جلال محمود. بەرگی١. ٧٨): ٣) [کنایه از خسته‌اش می‌کند].

**بە سەری کردەوە:** ١) ژماردنی: ١) [کنایه از دوباره آن‌ها را شمرد] ٢) سەری لێ داوە هەواڵی پرسی (جلال محمود. بەرگی١. ٧٩): ٢) [کنایه از به ملاقاتش رفت و احوالی از او پرسید].

**بە سەریەوە نەرۆیشت:** وازی لێ هێنا، چاوپۆشی لێ کرد (جلال محمود. بەرگی١. ٧٩): [کنایه از، از او دست برداشت، و چشم‌پوشی کرد].

**بە سەریدا دەخوێنێت:** بە قسە بۆری پێ داوە و خۆی بە سەریدا بادەدا (جلال محمود. بەرگی٢. ٢٥): [کنایه از او را با سخن گفتن شکست داد و بر او غالب شد].

**بە شا نەیژێ لەلە:** [برێتی لە یەکێك کە گوێ بە کەس نەدا و قسەی هیچ کەسێ بە سەریا نەچێ]: کنایه از کسی که به همه بی‌اعتناست. (حیرت.٩٨)

**بە شا نەیژێ یارۆ:** ١) [برێتی لە یەکێکی تێر و تەسەل کە گوێ بە ماڵی دنیا نادات]، ٢) [برێتی لە یەکێکی بەدەمار و فیزن]: ١) کنایه از شخص ثروتمند و بی‌اعتنا به مال دنیا، ٢) کنایه از آدم ثروتمند و متکبر. (حیرت.٩٩)

**بە شەوا خانمە و بە ڕۆژا کارەکەر:** برێتی لە گزگ: [کنایه از جارو]. (حیرت.٩٩)

**بە شووی دا:** پشتی تێکرد، ١) بەرەڵای کرد تا تووش بێت: ١) [کنایه از به او بی‌اعتنایی کرد تـــا گرفتار شـــود] ٢) داوی بۆ نـــایەوە (جلال محمود. بەرگی١. ٨٠): ٢) [کنایه از دام برایش گذاشت].

**بە شیشە و مەمکی خاڵی ئەیخەفنێ:** برێتی لە فریو دان (جلال محمود. بەرگی٢. ٢٥): [کنایه از فریب دادن].

**بە چاو خواردی:** چاوی لێ نەترووکاندا یا لە حەزدا یان لە ڕقاندا (جلال محمود. بەرگی٢. ٢٢): [کنایه از شدت خشم یا عشق و دوستی چشمانش را بر هم نزد].

**بە چاو شەڕ دەکات:** چاوی زۆر جوانە و چاو پیاو لاس دەدات (جلال محمود. بەرگی٢. ٢٢): [کنایه از این که چشمانش بسیار زیباست و چشم انسان را فریب می‌دهد].

**بە چاو و برۆ قسە ئەکا:** [برێتی لە زۆر وێژ و دەم هەراش] (ئەمومن.٦٦): [کنایه از شخص وراج و پرحرف].

**بە چاوی ئاگرینی تەماشای دەکات:** ١) زۆر بە وردی تەماشای دەکا ٢) زۆر بە ڕقەوە دەڕوانێت (جلال محمود. بەرگی٢. ٢٢): ١) [کنایه از نسبت به آن بسیار دقت می‌کند] ٢) [کنایه از خشمگینانه نگاه می‌کند].

**بە چاویەوە کرد:** گوایە چاوی پیسی کاری تێ کرد، تووش و گرفتاری کرد (جلال محمود. بەرگی٢. ٢٢): [کنایه از چشمان شورش کار خود را کرده و او را دچار مصیبت و گرفتاری کرد].

**بە چەقی نەحلەتدا چوو:** ١) واتە، ڕقی گرت و ملی نەدا: ١) [کنایە از خشمگین شد و راضی نشد] ، ٢) ڕقی هەستاو کارەکەی نەکرد (جلال محمود. بەرگی١. ٦٦). ٢) [بە خشم آمد و کارش را انجام نداد].

**بە چوار براوە کلاویکیان هەس:** [بریتی لە بنەماڵەی هەژار و نەدار]: کنایە از خانوادەی بی‌چیز و فقیر است. (حیرت.٨٨)

**بە چوار پێ دەڕوات:** بە ڕقەوە بە یەکێکی گێڵ دەوترێ (جلال محمود. بەرگی٢. ٢٣). [کنایە از این کە در حالت عصبانی بە فرد ابلە گفتە می‌شود].

**بە چوار ناڵ هات:** واتە خێرا و توند هات: کنایە از سریع آمد.

**بە گەزی خۆی دەپێوێ:** بریتی لە یەکێك کە بە بیروڕای خۆی کاربکا و ڕێز و بایخ بۆ قسەی کەسانیتر دانەنێت: کنایە از کسی کە بە میل خویش کار بکند و ارزش و احترامی برای آرای دیگران قایل نشود.

**بە گورگانخواردووی دا:** ١) هاوڕێ بوون و پشت تێکردن و بەرەڵای کرد کارێکی کرد بووە هۆی گرفتاری ٢) بە فێڵ دووچاری چورتومی کرد (جلال محمود. بەرگی١. ٨٣). ١) [با هم دوست بودن و بە او بی‌اعتنایی کردن و رها ساختن و او را دچار گرفتاری کردن] ٢) [با نیرنگ او را دچار مصیبت کرد].

**بە گوریس تۆ کەفتگە چاڵ:** واتە راوێژ و هەڵەی تۆیە کە ئەوی بەم ڕۆژە گیرۆدە کردووە (رخزادی.٩٧). [کنایە از تدبیر و اشتباە تو او را بە این روز انداختە است].

**بە گون بوون:** بە جەرگ و بە غیرەت بوون، گوندار بوون (نانەوازادە.٤٣٢). [کنایە از شجاع و بی باک بودن].

**بە گوێچکە نان ئەخوا:** شۆفار و کوڵەفتنە: کنایە از جاسوس و آشوبگر.

**بە گوێیە:** گوێ ڕایەڵە و قسە وەردەگرێت (جلال محمود. بەرگی١. ٨٣). [کنایە از حرف‌شنو و گوش بە فرمان است].

**بە گیای بەهارا نافێرپێنێ:** واتە: ناگاتە بەهار، بە یەکێکی پیر و ناخۆش ئەوترێ (خال.١٢٦). [کنایە از آدم بیمار].

**بە قەبری کەر بۆ جاشی:** [بریتی لە مرۆڤی گێل و نەزان]: کنایە از آدم ابلە و نادان. (فتاحی قاضی. بەرگی٢. ٤٧)

**بە قەلانگی گووی ناگاتە دەمی:** [بریتی لە یەکێکی بەفیز و دەمار]: کنایە از خودخواە و متکبر. (فتاحی قاضی. بەرگی١. ٦٣)

**بە قنگ درگایان پێکردوو:** بریتی لە کەسێك کە بە زۆر لە جێگایەك دەریان کرد (رخزادی.٩٥). [کنایە از بە اجبار کسی را بیرون کردن].

**بە قنگ هەناسە ئەدات:** ١) هەناسەی زۆر سوارە: ١) [کنایە از بسیار تنگ نفس است] ٢) زۆر کەشەنگ و ماندووە (جلال محمود. بەرگی١. ٨١). ٢) [کنایە از بسیار خستە و کوفتە است].

**بە قنگاخستن:** بریتی لە دواخستنی کارێك (خال.ف.١٧٠). [کنایە از کاری را پشت گوش انداختن و عقب انداختن].

**بە قنگەوە خستنە کەندەلان:** بریتی لە دەمکوت‌کردنی یەکێك (خال.ف.١٧٠). [کنایە از وادار کردن کسی بە خاموشی].

**بە قنگی نەیژێ مەی تەکما:** بریتی لە یەکێکی بەفیس و دەمار: کنایە از آدم متکبر.

**بە قوڕگی شێردا دەچێت:** زۆر بەجەربەزە و بوێرە (جلال محمود. بەرگی٢. ٢٦). [کنایە از شجاع بودن].

**بە قوونی خۆی ناترِێ:** [بریتی لە یەکێك کە زۆرتر لە

سامان و دەسەڵاتی خۆی هەنگاو هەڵ ئەگرێ]: کنایه از بیشتر از امکانات خودش قدم برمی‌دارد. (فتاحی. قاضی. بەرگی ١. ٦٢)

**بە کاسەهاوسا ژین کردن:** برێتی لە یەکێك کە پشت ئەبەستێ بە خەڵکی تر: کنایه از تکیه داشتن به دیگری.

**بە کاسەیەك دەیکەن و بە کەوچکێك دەیخۆن:** برێتی لە دوو کەس کە زۆر بەیەکەوە تێکەڵ بن (رخزادی.٩٥): [کنایه از روابط دوستانه و صمیمی بین دو نفر].

**بە کام سازت هەڵپەرم:** ١) برێتی لە یەکێك کە هەر جارێ قسەیەك بکات، واتە قسەکانت هیچ بایەخێکی نییە: ١) [کنایه از کسی که هر لحظه سخنی بگوید، حرفهایش ارزشی ندارد]، ٢) بڕوای پێ ناکرێت. جێی متمانە نییە (جلال محمود. بەرگی ٢. ٢٦): ٢) [به او نمی‌شود اعتماد کرد، جای اطمینان نیست].

**بە کەوچکێك ئاو دەکەوێتە مەلە:** ساویلکەیە و زوو دەکەوێتە ژێر داوەوە. خۆش بڕوایە (جلال محمود. بەرگی ٢. ٢٦): [کنایه از آدم ساده‌لوح که زود فریب می‌خورد].

**بە کەیفی ئەو لێ ئەدا:** بە ئارزووی ئەو دەدوێت (شێخەڵە.٣٧): [کنایه از به خواست و فرمان او حرف می‌زند].

**بە کڵاو دەگیرێت:** ١) زۆر بێ دەسەڵاتە و بوودەڵەیە: ١) [کنایه از بسیار ناتوان و تنبل است] ٢) بێ فڕوفێڵ و ساویلکەیە (جلال محمود. بەرگی ١. ٨١): ٢) [کنایه از بسیار ساده‌لوح است].

**بە کلکی ئەخورێ:** برێتی لە یەکێك کە پشتی ئەستوور بێ بە کەسێکی لە خۆ گەورەتر (خال.١٢٤): [کنایه از کسی که پشتیبان قوی و محکم داشته باشد].

**بە کوتەك کاری پێ دەکات:** واتە: زۆری لێ دەکات (جلال محمود. بەرگی ١. ٨٢): [کنایه از به اجبار کسی را وادار به کاری کردن].

**بە کوڵکیەوە کرد:** ١) تووشی بە تووشیەوە کرد. ٢) بە سەریدا سەپاندی و کردی بە بار بە سەریەوە (جلال محمود. بەرگی ١. ٨٢): ١) [کنایه از گرفتارش کرد و بر عهده‌اش نداشت]، ٢) [بر او تحمیل کرد].

**بە کونای دەرزیا ئەچێت:** برێتی لە یەکێکی زۆر لەڕولاواز (رخزادی.٩٦): [کنایه از آدم بسیار لاغر].

**بە کێویدا کرد:** ١) بڕوای بە قسەکەی نەکرد، لای زۆر ستەم بوو: ١) [کنایه از این که به سخنان او اطمینان نکرد، پیش او بسیار دشوار بود]. ٢) ئابڕووی برد (جلال محمود. بەرگی ٢. ٢٦): ٢) [آبرویش را برد].

**بە لێو ئەخورگێ:** برێتی لە خواردەمەنییەکی نەرم (رخزادی.٩٨): [کنایه از خوردن چیزی نرم و لذیذ].

**بە مۆریدا ناڕوانێتەوە:** چاوی پێ ناکەوێتەوە تازە لە دەستی چووە (جلال محمود. بەرگی ٢. ٢٦): [کنایه از دیگر او را نخواهد دید و از دستش رفته].

**بە مەویژ سمێڵی با ئەدات:** [برێتی لە یەکێك کە بە خۆی دڵی خۆش بێ و خۆی بە زۆرزان بەزانێ]: کسی که ادعای دانایی می‌کند و از خود ممنون است. (حیرت.١٠٥)

**بە منەوە نەدووراویت (نەبەستراویت):** واتە چاوەڕێ مەکە کارەکەت بۆ بکەم ڕاپەڕە و کاری خۆت جێ بە جێ بکە (جلال محمود. بەرگی ٢. ٢٦): [کنایه از این که منتظر مباش که من کارت را انجام دهم برخیز و کار خود را انجام بده].

**بە موویەك بەندە:** زۆر لە مەترسیدایە. خەریکە بکەوێت بمرێت لە ناو بچێت (جلال محمود. بەرگی ١. ٨٤): [کنایه از در خطر است، نزدیک است بیفتد، بمیرد و

**پەروپۆ:** بریتی لە ماڵ و سامان: کنایە از دارایی و ثروت.

**پەرهێزگار:** بریتی لە خوا، چونکە هەمیشە بەندەی خۆی ئەپاریزێ، مروڤی پاك (خالن.ف.٢٣٦): [کنایە از خداوند که از بندەاش نگهداری می‌کند، کنایە از انسان باتقوا].

**پەکی بۆی ناکەفێ:** [واتە گوێی ناداتێ و خەم ناخوا]: کنایە از ناراحت نشدن، بی‌خیال بودن. (حیرت.١٢٨)

**پەکی کەفتگە:** [بریتی لە بێ‌هێز بوون]: کنایە از ناتوانی. (حیرت.١٢٨)

**پەل لە هەور ئەکوتێ:** ١) زانایەکی گەورەیە: ١) [کنایە از شخص بزرگ و دانایی است] ٢) لە خۆ بایی و خۆپەرستە: ٢) [کنایە از آدم خودخواه و خودپرست] ٣) یاخییەو سەر دانانەوێنێت: ٣) [متمرد است و تسلیم نمی‌شود] (جلال محمود. بەرگی٢. ٣٥/ حیرت.١٢٨)

**پەلە پیتك ئەوەشێنێ** (مریوخ.٥): [تانە و تەشەر وەشانن: کنایە از طعنە زدن].

**پەلەقاژەیەتی:** ١) لە شپرزەییدا ناتوانێت قسەی دەروونی دەربڕێت بە پەل بە پەنجە ئاماژە (ئیشارت) دەکات: ١) [کنایە از از آشفتگی نمی‌تواند حرف بزند بە انگشت اشارە می‌کند] ٢) تێکەوتووە شپرزەیان کردووە: ٢) [کنایە از دچار کار سختی شدە آشفتەاش کردەاند] ٣) پەلەیە (جلال محمود. بەرگی١. ١٠٨): ٣) [کنایە از این کە برای کارش تعجیل می‌کند].

**پەڵەی داوە:** بریتی لە بارینی تێروتەسەل: کنایە از باران بە اندازەی کافی باریدە است.

**پەلکوتان:** کۆشش و تەقالا: کنایە از جد و جهد. (مەزهەر.١٢٣)

**پەلوپۆ:** دەڵێن لە پەلوپۆی خست. واتە ماندوو و شپرزەی کرد (جلال محمود. بەرگی١. ١٠٧): [کنایە از تاب و توان افتاد یعنی او را خستە و آشفتە کرد].

**پەلوپۆی دەرکردووە:** هاتووە بە خۆیدا (جلال محمود. بەرگی١. ١٠٧): [کنایە از این کە رشد کردە و بزرگ شدە].

**پەنجە بنە دەمی نایگەزێ:** [بریتی لە یەکێکی ساویلکە و بێ‌دەسەڵاتە]: کنایە از آدم سادەلوح. (حیرت.١٤١)

**پەنجە مۆر کردن:** بریتی لە قەبووڵ کردنی شتێك: کنایە از قبول کردن چیزی.

**پەنجەی خۆی ئەکورۆژێ:** [بریتی لە یەکێك کە زۆر رقی هەستابێ]: کنایە از کسی کە زیاد خشمگین شدە باشد. (حیرت.١٤١)

**پەنجەی خۆی برد بە دەما:** [واتە: زۆر پەشیمان بووەوە]: کنایە از این کە پشیمان شدە است. (حیرت.١٤١)

**پەنجەی لە پەنجەی نەکەوتووە:** توخنی نەکەوتووە (جلال محمود. بەرگی٢. ٣٦): [کنایە از نزدیکش نشدە است].

**پەنجەی هەڵپێکاون:** [بریتی لە یەکێك خەم و پەژارە دایگرتبێ]: کنایە از کسی کە غم و غصە او را فرا گرفتە. (حیرت.١٢٨)

**پەی پێ نابەم:** سەرم لێی دەرناچێت (جلال محمود. بەرگی١. ١٠٩): [کنایە از آن سردرنمی‌آوردم].

**پەی پێ ناوا:** [بریتی لە تێنەگەیشتن]: کنایە از کسی کە چیزی یا سخنی را درك نکند. (حیرت.١٢٩)

**پەیمانە پڕ بووگە:** بریتی لە ئەو زوڵمە گەیشتوەتە نیهایەت (رخزادی.١١٥): [کنایە از بە حد نهایت رسیدن ظلم و ستم].

**پەیمانە پڕبوون:** ١) [بریتی لە یەکێك کە مەرگی نزیکەوە بووە]. ٢) [بریتی لە یەکێك کە ئارام و تاقەتی

لە دەس دابێ]: ١) کنایە از کسی کە اجلش فرا رسیدە. ٢) کنایە از کسی کە شکیباییش نماندە. (حیرت.١٢٩)

**پێ ڕاکێشان:** [برێتی لەگەڵ کەسێکا سازیان، بۆ وێنە: دەگەڵی پێ ڕاکێشە: واتە دەگەڵی بسازە]. کنایە از با او بساز. (قناعی قاضی.١٢٧)

**پێ لە بەڕەی خۆی درێژ ناکات:** بە پێی بوونی خۆی خەرج دەکات، بە پێی توانای خۆی پەلامار دەدات (جلال محمود. بەرگی ١. ١١٩): [کنایە از کسی کە بە اندازەی دخل خود خرج می‌کند و بە اندازەی توانایی خویش طلب می‌کند].

**پێ لێ داگرتن:** برێتی لە زۆر کردن لە کەسێك و میچ لەسەرگرتنی بۆ کارێك (خاڵ.ف.٢٥٩): [کنایە از پافشاری و اصرار برای انجام کاری].

**پێ لێ ڕاکێشان:** ١) برێتی لە پشت دانەوە لە کارێك: ١) [کنایە از خودداری از انجام کاری]، ٢) حەسانەوە (خاڵ.ف.٢٦٠): ٢) [کنایە از آرامش یافتن].

**پێ هەڵپڕژان:** لە کێشە تێهاڵاندن و شەڕ پێ فروشتن: کنایە از بهانەجویی. (مەژار.١٣٧)

**پێ هەڵگرە:** واتە خێرا بڕۆ (جلال محمود. بەرگی ١. ١٢٠): [کنایە از سریع برو].

**پیاز پاك کردن:** برێتی لە ڕیایی و تاریفی بەدرۆ: کنایە از تملق و ریا. (مەژار.١٢٧)

**پیاو فرۆش:** برێتی لە ئافرەتی زمان لووسی بەفرووفێڵ (خاڵ.ف.٢٥٠): [کنایە از زن چرب زبان نیرنگ‌باز].

**پیاوخۆر:** برێتی خەڵك ترسێنەر: کنایە از ترسناك. (مەژار.١٢٧)

**پیتا پەریگە:** واتە: شێت بووگی: کنایە از دیوانە شدەای.

**پیتی تێ نەکەفێ:** برێتی لە خواردەمەنیەك کە زۆر بێتەوە: کنایە از غذایی کە زیاد شود.

**پێدا (پیا) گەیشت:** ١) فریای کەوت و یارمەتی دا: ١) [بە فریادش رسید و کمکش کرد] ٢) فریای کەوت و بەشی خۆی برد (جلال محمود. بەرگی ١. ١١٧): ٢) [بە موقع رسید و سهم خود را برد].

**پیرێژنی دۆ ڕژاو:** بە یەکێك ئەوترێ، کە خەمێکی لێ نیشتبێ (خاڵ.٤٢): [کنایە از کسی کە دچار غم و اندوە شدە باشد].

**پێش دەرگی پێگرتن:** بە شەڕ هاتن لە گەڵ کەسێك، شەڕی یەك لایەنە، شەڕی پێفرۆشتن: کنایە از جنگ و دعوا دست کسی دادن.

**پێشاو:** برێتی لە ئاودەست، جێگەی دەست بە ئاو گەیاندن: کنایە از آب دست، دستشویی. (مەژار.١٣٢)

**پێشبین:** برێتی لە مرۆڤی زۆر زانا و بەتوێژینەوە: آدم دانا و متفکر. (مەژار.١٣٣)

**پێشە ڕەش نەکردن** (مریوخ.٥): [هێشتا منالەو خۆی دانەڕشتووە: کنایە از جوان و بی تجربە بودن].

**پێشەی تیاشکانگە:** لەو کارەدا ڕەنجی زۆری کێشاوە (رخزادی.١١٩): [کنایە از شخصی است کە در انجام کاری زحمت زیادی متحمل شدە باشد].

**پێشەی ڕەش نەکردگە (نەکردووە):** بە یەکێك دەوترێ کە هێشتا منداڵە: کنایە از کسی کە هنوز بچە است.

**پێشدەستی کرد (دەستی خۆی وەشاند):** ١) زووتر هاتە دەست و دەستی خۆی پێش خست: ١) [کنایە از دست خود را پیش انداخت] ٢) شتەکەی دەستگیر بوو (جلال محمود. بەرگی ١. ١١٨): ٢) [کنایە از چیزی کە می‌خواست بە دستش رسید].

**پێچ کردن:** برێتی لە یەکێك کە کارێك بە قازانجی نەبێ

و یان لێ نەزانێ خۆی گێل بکا و خۆی لێ بدزێتەوە: کنایە از کسی کە کاری بە سودش نباشد و از آن دوری کند.

**پێنج لێدان:** برێتی لە فێلکردن و قوماربازی (خاڵ.ف.۲۵۳): [کنایە از نیرنگ باز].

**پێچانەوە:** برێتی لە لێ پرسینەوە و بەسەرکردنەوە و کۆ کردنەوەی ماڵ: کنایە از بازپرسی. (مەزهەر.۱۲۹)

**پێچراوە:** برێتی لە هەڵگیراو، ئەنجامنەگرتنی کارێك: کنایە از برچیدە شدە، انجام نشدن کاری. (مەزهەر.۱۲۹)

**پێچی مێزرێکە:** برێتی لە کارێك هێندە نەخایەنێت و ئەوەندە پێچی مێزەرێك ببەستیت هەر هێند دەخایەنێت (جەلال محمود. بەرگی۱. ۱۱۶): [کنایە از کاری کە چندان طول نمی‌کشد و سریع انجام می‌گیرد].

**پێك هاتن:** رێك کەوتن. دروست بوون (جەلال محمود. بەرگی۱. ۱۱۹): [کنایە از بە توافق رسیدن].

**پێکان:** برێتی لە دۆزینەوەی مەبەست لە نووسراوێکی گرانی نادیار (مەعنای شیعرەکەی نالیم پێکا) (خاڵ.ف.۲۵۸): [کنایە از پیدا کردنی معنا و مفهومی در نوشتە یا شعری مشکل و صقیل].

**پێکەوتن:** گونجانی شتێکە لەگەڵ کسێکدا، بۆ شتێکی بە سوود کە یەکێك بیبەخشێت لە رووی مادییەوە. وەك (جلوبەرگی کوردی پێ ئەکەوێ) (جەلال محمود. بەرگی۱. ۱۱۸): [کنایە از سازش و کنار آمدن چیزی با کسی، برای چیزی کە بهرەای مادی برای دیگری داشتە باشد].

**پێکەوەرین:** برێتی لە شەرە جوێن: تبادل دشنام. (مەزهەر.۱۳۵)

**پێڵاوی لێ هەڵکێشا:** برێتی لە ئامادەی رۆیشتن بوو، کارەکەی دەست پێ کرد: کنایە از آمادە حرکت شد، کارش را شروع کرد.

**پیلە پێگرتن:** برێتی لە شەڕ فرۆشتن بە یەکێك: کنایە از شر فروشی و دعوا.

**پێلێنان:** برێتی لە ڕاست وتنی شتێك، پێ نان بە شتێکا (خاڵ.ف.۲٦۰): [کنایە از اعتراف کردن].

**پێم فێر بووگە:** [برێتی لە دەستبەردار نەبوون و وازنەهێنان لە کەسێ]: کنایە از راحت نگذاشتن کسی. (قادر فتاحی. بەرگی۲)

**پینە کردن:** ۱) برێتی لە داپۆشینی هەڵە و عەیب: ۱) کنایە از ماست مالی ۲) برێتی لە بەسەرگرتنەوەی و تارێك بە لادانی بە جۆرێکیتر: (فسیار کەس لە قسەکەی نەریمان دڵگیر بوو بەڵام باش بوو ئەمیش زوو پینەی کرد): ۲) کنایە از ماست‌مالی کردن ۳) پاراستنی ئابرووی کەسێ: ۳) کنایە از حفظ آبرو کردن. (مەزهەر.۱۳٦)

**پینە هەڵ ناگرێ:** برێتی لە یەکێك کە بێ ئابڕوویی بار هێنابێ و بە هیچ جۆری نەتوانێ بیشارێتەوە و داپۆشی: کنایە از کسی کە رسوایی بارآوردە باشد و راهی برای پنهان نمودن و حفظ آبرو نباشد.

**پێنج و مەنگەنەی زۆرە:** ئەوکارە کارێکی دژوار و پرزەحمەتە. دەڵێن ئەو کارە پێچ و مەنگەنەی زۆرە (جەلال محمود. بەرگی۲. ۳۸): [کنایە از این کە آن کار سادە و آسان نیست].

**پێوە تلیام:** ۱) برێتی لە یەکێك بێ ئەوە بزانێ تووشی رووداوێك یان کارەساتێك بێت. ۲) برێتی لە یەکێك کە بە زۆر تێکەڵی کارێك بێ: ۱) کنایە از کسی کە غیر عمد گرفتار واقعە یا حادثەای شود. ۲) کنایە از بە اجبار داخل کاری یا جایی شدن.

**پێوە سووتاوە:** زۆر بە تەنگیەوە دێت، دڵسۆزانە یاری ئەدات (جەلال محمود. بەرگی۱. ۱۱۹): [کنایە از در تنگنا بە یاریش می‌شتابد و بە او مهربانی می‌کند].

**پێوە کردن:** برێتی لە دووچارکردنی یەکێك بە چورتمێکەوە (چاك فسیار کەس پێوە بوو) (خاڵ.ف.٢٦٢): [کنایە از کسی کە دچار مصیبتی شود].

**پێوەبوون:** برێتی لە تووشبونی شتی ناخۆش: کنایە از گرفتار شدن. (مەزبر.١٣٦)

**پێهەڵگرتن:** برێتی لە خێرا رۆیین (خاڵ.ف.٢٦٣): [کنایە از شخصی کە در راه رفتن شتاب داشتە باشد].

**پێی بە پۆلوانەوە سووتاوە:** [برێتی لە ژێربوونی یەکێك]: کنایە از عبرت گرفتن. (ترسیدن و تنبیە شدن). (فتاحی قاضی.١٧٧)

**پێی بە زەوییەوە وشك بووە:** زۆر دەستەپاچە بووە، هۆشی لە بەر براوە لە بارێکی دەروونیی ترسناکدایە (جلال محمود. بەرگی٢. ٣٩): [کنایە از بسیار سراسیمە شدە است، هوشی برایش نماندە و از لحاظ روحی وضع خوبی ندارد].

**پێی خرە:** ١) برێتی لە یەکێك سەرپێچی کردووە، لەرێ لای داوە: ١) [کنایە از کسی تمرد کردە است و از راه راست برگشتە] ٢) خراپەی کردووە (جلال محمود. بەرگی١. ١٢٠): ٢) [کنایە از بد عمل کردە].

**پێی دەزانێت:** برێتی لە یەکێك کە چاکەی لەبەر چاوە و ئەمەکی دەداتەوە (جلال محمود. بەرگی١. ١٢٠): [کنایە از کسی کە نیکی را پیش چشم دارد و جبرانش می‌کند].

**پێی کرایەوە:** برێتی دەستی کرد بە هامشۆی ئەو ماڵە، ئەو کەسەیان ئەو شوێنە. رێگەی هاتوچۆی بۆ کرایەوە (جلال محمود. بەرگی١. ١٢١): [کنایە از کسی کە شروع بە رفت و آمد بە منزلی یا کسی یا جایی بکند و راه رفت و آمد برروی او باز شدە باشد].

**پێی لە جەرگی خۆی نا:** بە ناچاری کارێکی کرد. کردنی ئەو کارە یان مەترسی هەبوو، یان پێی ناخۆش بوو (جلال محمود. بەرگی١. ١٢١): [کنایە از کسی کە از روی اجبار کاری را انجام دهد کە انجام آن کار خطرناك باشد یا از نظر او ناخوشایند باشد].

**پێی لە زەوی ناکەوێ:** برێتی لە کەیفخۆشی (خاڵ.ف.٢٥٩): [کنایە از خوشحال بودن].

**پێی لە کلکی ناوە:** واتە لە خۆی وروژاندووە و لێی تاڵوز بووە، رقی لێ هەستاوە (جلال محمود. بەرگی٢. ٣٨): [کنایە از او را تحریک کردە و از او عصبانی شدە، از او خشمگین شدە].

**پێی لێ خستن:** برێتی لە چاو قووچاندن لە شتێك و لە سەر نەڕۆینی (خاڵ.ف.٢٥٩): [کنایە از چشم پوشی کردن از چیزی یا کاری].

**پێی لێ داگرت:** ١) برێتی بۆ کڕین یان فرۆشتنی شتێك داوای نرخێکی گرانی کرد: ١) [کنایە از این کە در خرید و فروش تقاضای نرخ بالایی کرد] ٢) لە بەشوودانداا داوای شتی زۆر و گرانبەهای کرد (جلال محمود. بەرگی١. ١٢١): ٢) [کنایە از کسی کە کە در شوهر دادن دختر تقاضای چیزهای بسیار گرانبها کرد].

**پێی لێ راکێشا:** ١) بە بەشی خۆی قانع بوو: ١) [کنایە از این کە بە سهم خود قانع بود] ٢) ملی‌نا: ٢) [تسلیم شد و قبول کرد] ٣) وازی هێنا (جلال محمود. بەرگی١. ١٢٢): ٣) [دست برداشت] ٤) پشووی دا: ٤) [استراحت کرد].

**پێی لێ هەڵبڕی:** ١) زێدەڕۆیی کرد: ١) [کنایە از زیادەروی می‌کند] ٢) داوای شتی زۆری کرد (جلال محمود. بەرگی١. ١٢١): ٢) [کنایە از تقاضای چیزهای بسیاری کرد].

**پێی لێ هەڵگرد:** ١) خێرا ڕۆی: ١) [کنایە از سریع رفت] ٢) ڕای کرد: ٢) [فرار کرد] ٣) پشتی تێ کرد (جلال محمود. بەرگی١. ١٢٢): ٣) [پشت کرد و دور شد].

**پێی نازانێت:** برێتی لە یەکێك کە سپڵەیە. بەدغەکە و چاکەی خەڵك فەرامۆش دەکات (جلال محمود. بەرگی١. ١٢١): [کنایە از کسی بی‌وفا و ناسپاس کە خوبی دیگران را فراموش می کند].

**پێی ناکەوێتە سەر زەوی:** برێتی لە یەکێك کە هێندە دڵی خۆشە وەختە بفڕێت و باڵ بگرێتەوە (جلال محمود. بەرگی١. ١٢٢): [کنایە از شخص بسیار خوشحال و شاد کە نزدیک است بە پرواز درآید].

**پێیاهێنان:** برێتی لە خەلاس کردن، دستێکی بە ماڵەکەدا هێنا: کنایە از تمام کردن. (معزو.١٢٨)

**پێیەوبووە:** برێتی لە کەسێکی قەڵەو: کنایە از آدم چاق.

**پێیەوبووگ:** برێتی لە یەکیك کە تووشی ڕووداوێك یا کارەساتێك ببێ: کنایە از کسی کە بە مصیبتی یا بلایی گرفتار شود.

## ت

**تا خوێن ها له ڕەگما:** بریتی له ئەوەی که تا گیانم له لەشدا بێت دەستبەردار نابم (جلال محمود. بەرگی۲. ٤٠): [کنایه از تا جان در بدن دارم دست‌بردار نیستم].

**تا دەروازە** (ئەمومن.١١٦): [بریتی له چاخ و قەڵەو بووگ: کنایه از آدم چاق].

**تا سەر نایخوا:** بریتی لەم حاڵەتەدا که بۆی ڕەخساوە بەردەوام نابێ (رخزادی.١٢٤): [کنایه از همیشه وضع بدین منوال نمی‌ماند].

**تاتەبەخبەخێ (تەتەپەخێ):** بریتی له سەروبنی کارێك هاوردنەیەك بێ وردبینی و لێکۆڵینەوە، له مل کردنەوەی کارێك: کنایه از این که کاری را ماست‌مالی کردن و از سر واکردن.

**تار و مار:** پرش و بڵاو بووە. فەوتا (جلال محمود. بەرگی۱. ١٢٥): [کنایه از پخش و پلا بودن، از میان رفتن].

**تازە ئەو باوکەی مرد:** واتە: لەمەولا ئیتر وەك جاران بۆی نالوێت و بۆی ناچەڵێت (جلال محمود. بەرگی۱. ١٢٥): [کنایه از این که از این به بعد دیگر مثل سابق برایش امکان نخواهد داشت].

**تازە به تازە:** بریتی له تەوەزلێ که درەنگ و خۆکەوتووە (کابرا تازە به تازە هاتگە ئێژێ چ بکەم؟): کنایه از تأخیر و درنگ. (مەزبر.١٤١)

**تازە برین:** بریتی له کەسێ تازە توشی بەڵایەك بووە: کنایه از کسی که تازە به مصیبتی گرفتار شده باشد. (مەزبر.١٤٠)

**تازە برینە:** بریتی له یەکێك که تازە تووشی بەڵایەك بوویێت یان کۆستێکی کەوتبێ یان تووشی گاشیەکی گەورەی جەرگبڕ بووبێ (جلال محمود. بەرگی۲. ٤٠): [کنایه از کسی که گرفتار مصیبتی شده باشد یا عزیزی را از دست داده یا گرفتار آشوب و بلای دردناکی شده است].

**تازە پیاکەفتگ:** [به یەکێك دەوترێ که له پێشا نەدار و دەستکورت بوویێت و ئێستا دەوڵەمەندەوە بووە]: کنایه از آدم نو کیسه. (حیرت.١٢٨)

**تازە پێیاکەوتووە:** بریتی له تازە دەوڵەمەنێك که ڕەوشت و کرداری دەوڵەمەنانە نەزانێت (جلال محمود. بەرگی۱. ١٢٥): [کنایه از تازە ثروتمندی که رفتار و کردار و فرهنگ ثروتمندی را نمی‌داند].

**تازە قنگی داوە به زەویندا:** واتە کەمێکە دانیشتووە: کنایه از تازە نشسته است.

**تاس بردیەوە:** ۱) سەرسام بوو: [سردرد و بی حالی بر او چیره شد] ۲) حەپەسا (جلال محمود. بەرگی۱. ١٢٦): [بهت‌زده شد و غم بر او چیره گشت].

**تاك و ترا:** واتە یەکە یەکە و ناو به ناو، تاك تاك (جلال محمود. بەرگی۲. ٤٠): [کنایه از یکی یکی].

**تاڵ و سوێری دنیای چەشتگە:** بریتی له یەکێك که له ژیانیدا پوختە بووە (رخزادی.١٢٦): [کنایه از کسی که تجربه زیادی را از زندگیش گرفته].

**تاڵان و بڕۆیە:** ۱) ئاژاوەیە: ۱) [کنایه از آشوب و ناامنی است] ۲) دەست به سەر ماڵی ئەم و ئەو داگرتن و دزین و بردنی (جلال محمود. بەرگی۲. ٤٠): ۲) [کنایه از ضبط کردن و دزدیدن و بردن مال دیگران].

**تاڵاو:** بریتی له خەم و خەفەت: ئەگەر نەخۆیت (تاڵاو) ئەکەم بەدەمتا (خال.ف.٢٧٤): [کنایه از غم و اندوه بسیار].

**تاڵبوون:** بریتی له تووڕەبوون له یەکێك (خال.ف.٢٧٤):

[کنایه از عصبانی شدن].

**تاڵی و سوێلی نەچەشتگە:** [بڕێتی لە یەکێك کە تەنگوچەڵەمەی ڕۆژگار نەهاتووەتە ڕێی و تاقی نەکراوەتەوە]: کنایه از کسی که با سختی‌های روزگار آشنا نیست و تجربه نیاموخته است. (حیرت.١٤١)

**تاڵی و سوێری زۆری چەشتووە:** بڕێتی لە یەکێك کە خاوەنئەزموون و لە ڕەوشتی ژیان ئاگادارە (جلال محمود. بەرگی١. ١٢٧) [کنایه از انسان باتجربه که به مسایل زندگی کاملاً آشناست].

**تاڵی و شیرینی:** خۆشی و ناخۆشی ژیان (جلال محمود. بەرگی٢. ٤٠) [کنایه از لذایذ و مصایب زندگی].

**تان دەرکەوتن:** بڕێتی لە زوو کۆنە بوونی جل و پەڵاس. بڕێتی لە عەیب و عار: ١) کنایه از زود کهنه شدن لباس ٢) کنایه از عیب و ننگ. (مەزبور.١٤٤)

**تانوپۆ ئاوریشم:** بڕێتی لە نەجیب زادە: کنایه از نجیب زاده.(مەزبور.١٤٤)

**تاوتوێ:** بڕێتی لە لێکدانەوە و بیر لێ کردنەوە. (دەڵێن بارەکانی تاوتوێ کرد). واتە: لێکی دایەوە (جلال محمود. بەرگی١. ١٢٨) [کنایه از بررسی و تجزیه و تحلیل].

**تڕ لەیلێ:** بڕێتی لە مەردومی بێ غوودی هیچ و پووچ (خاڵ.ف.٠ ٢٨) [کنایه از بینمود و بی‌ارزش].

**تڕ لێدان:** بڕێتی لە خۆ هەڵکێشان: کنایه از لاف و گزاف گویی. (مەزبور.١٤٧)

**تڕ و فیز:** لە خۆبایی و لووت بەرز (جلال محمود. بەرگی٢. ٤٢) [کنایه از تکبر].

**تڕ:** بڕێتی لە خۆ هەڵکێشانی بە درۆ: کنایه از لاف و گزاف گفتن. (مەزبور.١٤٥)

**تڕاندن:** بڕێتی لە پرزەبڕین و تەمێ کردن: کنایه از تنبیه کردن. (مەزبور.١٤٥)

**تڕاندی:** ١) پەکی خست، شپرزەی کرد: ١) [کنایه از: ازکار افتاده و پریشان حال شده] ٢) بۆڕی دا (جلال محمود. بەرگی١. ١٢٧) ٢) [کنایه از شکستش داد].

**تڕزل:** بڕێتی لە پیاوی بەفیز و لووت بەرز: کنایه از آدم متکبر. (مەزبور.١٤٦)

**ترش و تاڵ:** بڕێتی لە پیاوی رووگرژ و ڕەزاگران: آدم بدخو و اخمو. (مەزبور.١٤٦)

**تڕن:** بڕێتی لە بێکارەی خوێڕی: کنایه از بیکاره و تنبل. (مەزبور.١٤٧)

**تڕنە:** واتە: هیچی لە باردا نیە، بێ هێزە. هێشتا منداڵە (جلال محمود. بەرگی١. ١٢٨) [کنایه از چیزی بارش نیست، ناتوان است. هنوز بچه است].

**تڕوزز:** بڕێتی لە فیز و دەعیە و لەخۆبایی بوون: کنایه از تکبر و خودپسندی. (مەزبور.١٤٧)

**تروقاندن:** بڕێتی لە ڕەتاندن و کاری زۆر کردن: کنایه از دواندن و کار بسیار انجام دادن.

**تڕی بڕی:** ١) پەکی خست، بەری لێ گرت: ١) [کنایه از این که از کار افتاده و جلوش را گرفت] ٢) بەسەریدا زاڵ بوو، بۆڕی دا (جلال محمود. بەرگی١. ١٢٨) ٢) [کنایه از بر او چیره شد، و شکستش داد].

**تڕی پێچ کەوتووە:** ١) بڕێتی لە یەکێك کە بە درۆ خۆی نەخۆش خستبێ، ٢) کاری تەواوە (خاڵ. ١٥٨) ١) [کنایه از کسی که به دروغ خود را به بیماری زده] ٢) [کارش تمام است].

**تڕی گوزەڵە شکێنە:** بە دەعیەو فیزە: کنایه از متکبر.

**تڕی گەورە لێ ئەدات:** بڕێتی لە یەکێك کە خۆی بە زل بزانێت و داوای شتی گەورە و گران بەکات (جلال محمود. بەرگی١. ١٢٨) [کنایه از کسی که خود را بزرگ جلوه دهد و خواستار چیزهای بزرگ و گرانبها باشد].

**تریشتەی دا لە پای خۆی (چێوی دا لە بەر پای خۆی):** [برێتی لە یەکێك کە کارێکی خراپ بکات و بە هۆی ئەو کارەوە زیانی پێ بگەیێ]: کنایە از کسی کە کار بدی را انجام دادە باشد و بە علت آن آسیب و ضرری متوجە او شود. (حیرت.١٤٥)

**تریفە تێکەوتن:** برێتی لە زۆر تینوو بوون (خال.ف.٢٨٤). [کنایە از بسیار تشنە بودن].

**تساندی:** بۆرەی پێ دا. فسی پێدایەوە شکستیدا. بەزاندی (جلال محمود. بەرگی٢. ٤٣). [کنایە از شکستش داد].

**تسدانەوە:** برێتی لە سەرنەکەوتنی یەکێك لە ئەنجامی کارێکا و دەست لێ هەڵگرتنی (خال.ف.٢٨٤). [کنایە از کسی کە در انجام کاری موفق نباشد و از انجام دادن آن پشیمان شود].

**تسن:** برێتی لە مەردومی تەمەڵی تەوەزل (خال.ف.٢٨٥). [کنایە از شخص تنبل].

**تسی ژێری با نایبات:** تەمەڵ و تەوزەلە دەبانگە، هەمیشە دانیشتووە و بێکاریە (جلال محمود. بەرگی٢. ٤٣). [کنایە از شخص تنبل و همیشە نشستە و بیکار].

**تف لە دەم وشك بوون:** برێتی لە قسەییەك یا کارێك کە سەرت لی سوور بمێنی هیچت پێ نەوێژری (رخزادی١٣٣). [کنایە از سخنی یا کاری کە از آن متعجب شوی و نتوانی چیزی بگویی].

**تف لە دەمیا وشك بوو:** [واتە: سەری سوڕ ما و زۆر دڵخۆر و خەفەتبار بوو]: کنایە از تعجب کرد و غمگین شد. (حیرت.١٤٥)

**تفەنگ بە تاریکیەوە دەنێت:** ١) ناشارەزایە و بە گۆترە قسە دەکات: ١) [کنایە از شخص ناآگاهی کە سنجیدە سخن نمی‌گوید] ٢) بڕیار ئەدات: ٢) [کنایە از شرط و قرار می‌گذارد] ٣) خەڵك گوناهبار دەکات (جلال محمود. بەرگی١. ١٢٩). ٣) [مردم را گناهکار جلوە می‌دهد].

**تفکردنە ناو دەم یەك:** برێتی لە دووکەس یا زیاتر کە لە قسەیەکا هەموویان وەك یەك وابن: کنایە از دو یا چند نفر کە بر سر یک حرف هم عقیدە باشند.

**تفکردنە ناودەم:** برێتی لە دەرس دادانی یەکێك واتە فێری ڕەوەشتی خۆی کردن (خال.ف.٢٨٥). [کنایە از درس دادن بە کسی و آموزش اخلاق و روش خویش بە او].

**تك:** برێتی لە ئەندازەیەکی کەم لە شت (خال.ف.٢٨٦). [کنایە از اندازەی کم چیزی].

**تکا لە تکاخانەی بڕا:** [هەرچی لی پاڕانیەوە بە قوڵمانی نەکردو بە قسەمان گوی نەدا]: کنایە از هر چە خواهش کردیم زیر بار نرفت و بە حرف ما گوش نکرد. (فتاحی قاضی. بەرگی٢.)

**تۆراغان:** برێتی لە مرۆی زگ زل: کنایە از آدم شکم گندە. (مەژار.١٥٣)

**تۆز ئەکا:** ١) [بە یەکێکی تووڕە دەڵێن]: ١) کنایە از آدم عصبانی و خشمگین. ٢) [بە یەکێك گێل دەڵێن کە پرش و بڵاو قسە دەکا]: ٢) کنایە از آدم ابلە و نادان کە پرت‌وپلا سخن می‌گوید. (حیرت.١٤٧)

**تۆز دەتەکێنێت:** واتە بە درۆ لە کەسێك بدەی (جلال محمود. بەرگی٢. ٤٤). [کنایە از دروغی، کسی را زدن].

**تۆز کردن:** برێتی لە ئاژاوەنانەوە (خال.ف.٢٩٢). [کنایە از آشوب بە پا کردن].

**تۆز لە قوڕ هەستاو:** برێتی لە ئەگەر بتوانێ شتێکی کەمیش لە ئینسانی ڕژد و چرووك بە دەست بێنی قازانجت کردووە (جلال محمود. بەرگی٢. ٤٤). [کنایە از چیزی

را از دست خسیس گرفتن غنیمت است].

**تۆز لێ هەڵنەسان:** برێتی لە چرووکی و ڕژدی: کنایە از خست. (مەژار.١٥٤)

**تۆزی لێ نابێتەوە (لێ هەڵ ناسێت):** واتە زۆر چرووکە (جلال محمود. بەرگی١. ١٤١): [کنایە از بسیار خسیس است].

**تۆزێکی لێ بوومو:** چتێکی لێ هەڵ وەرا، نەختە خێرێکی لێ بەدەس هات.(رخزادی.١٢٤): [کنایە از چیز کمی را بدست آوردن].

**تۆشەی ئاوە:** [بە یەکێك دەوترێ کە بێ پشتیوانە]: کنایە از آدم بی‌پشتیبان. (حیرت.١٤٧)

**تۆڵبڕ:** برێتی لە کەسێك کە بە ڕواڵەت بەشتێکەوە خەریك بێ و کەچی بە دڵ گوێ بۆ شتێکی تر هەڵخستبێ (خاڵ.ف.٢٩٨): [کنایە از وجود حاضر غایب شنیدن کنایە از کسی کە ظاهراً مشغول کاری باشد ولی حواسش بە چیز دیگر مشغول باشد].

**تۆم کۆنە لە دڵیا وەشیاگە:** ڕقی زووتری لە دڵدایە (رخزادی.١٣٥/پ.١٤٨): [کنایە از کسی کە کینەی قبلی در دل دارد].

**تورمز بڕین:** برێتی لە ئیختیار لە دەستدان: کنایە از از دست دادن اختیار.

**توندە:** برێتی لە چێشتی قوبوولی و پڵاو (خاڵ.ف.٢٩٤): [کنایە از غذای جشن قبولی کسی].

**توورەکەی گدای‌دا بە دەستیەوە:** هەژار بوو. کەفتە دەرۆزە کردن: کنایە از فقیر و بی‌چیز شد.

**تووشبون:** برێتی لە تووشیاربوون بە چورتمێك (خاڵ.ف.٢٩٧): [کنایە از دچار شدن کسی بە مصیبتی].

**تووشی داو بووە:** ١) تووشی گرفتاری و زیان و زەحمەت بووە: ١) [کنایە از گرفتار شدە و دچار ضرر و زیان و مشکل گردیدە] ٢) پیلانیان بۆ گێڕاوە و فێڵ و بوختانیان بۆ کردووە (جلال محمود. بەرگی١. ١٤١): ٢) [کنایە از برای او توطئەچینی کردەاند و او را گول زدە و بە او تهمت زدەاند].

**تووك روونی:** برێتی لە کەیف سازی و خۆش ڕابواردن: کنایە از خوش گذرانی. (مەژار.١٥٥)

**تووکەی (یان بسکەی) سمێڵی دێ:** برێتی لە یەکێك کە زۆر شادە (جلال محمود. بەرگی٢. ٤٤): [کنایە از آدم بسیار خوشحال].

**تووکی بکێشە رۆنی دەرتێ** (نەمومن.١١٦): [برێتی لە چاخ بوون: کنایە از آدم چاق].

**تووکی تڕ دەگرێتەوە:** لە ڕووی سووکیەوە دەوترێت واتە هەژارە (جلال محمود. بەرگی٢. ٤٤): [کنایە از فقیر].

**تووکی تسی سەگ دەگرێتەوە:** لە ڕووی سووکیەوە دەوترێت واتە ڕژدە (جلال محمود. بەرگی٢. ٤٤): [کنایە از شخص خسیس].

**تووکی سەریشی قەرزە:** برێتی لە یەکێك کە زۆر قەرزارە (جلال محمود. بەرگی٢. ٤٤): [کنایە از شخص بسیار مقروض].

**تووڵبڕ:** برێتی لە خۆگێلکردن و خۆدزینەوە: کنایە از خود را بە کوچە علی چپ زدن. (مەژار.١٥٥)

**تووی چنیاوە:** ١) [ئیتر پەیا نابێ]. ٢) [برێتی لە یەکێك یان بنەماڵەیەك کە ڕەچەڵەکیان تێیا چووبێ]: ١) کنایە از دیگر بدست نمی‌آید. ٢) کنایە از کسی یا خانوادەای کە نسلشان از میان رفتە باشد. (حیرت.١٥٠)

**تەپە تڕە:** برێتی لە ساوای تازە پێ‌گرتوو کە دەکەوێ و هەڵدەسێتەوە: کنایە از نوپای افتان و خیزان. (مەژار.١٥٩/جلال محمود. بەرگی١. ١٣٠)

**تەپەی سەری تێ (تەقەی سەری دێ):** [نەفام و ناحاڵی]: کنایە از آدم نفهم. (حیرت.١٥١)

**تەپڵ بێعاری کوتاگە (کوتیاگە):** دەرەوەستی هیچێ نەبوون: کنایە از لاقید. (حیرت.١٥٠/ جلال محمود. بەرگی٢. ٤١)

**تەپلی ئەمانی لێ دا:** سەری شۆڕ کرد و خۆی بەدەستەوەدا. بەزی (جلال محمود. بەرگی٢. ٤١): [کنایە از با خجالت و شرمساری خود را تسلیم کرد. شکست خورد].

**تەپلی زڕیاگە:** برێتی لە کەسێك کە عەیبێکی بووبێ و ئێستا ئەو عەیبەی دەرکەوتبێ (رخزادی.١٣٧): [کنایە از کسی کە عیبی یا مشکلی داشته و تاکنون آشکار نشده باشد].

**تەپی لێ ناکوتێ:** [واتە هیچی لێ نازانێت]: کنایە از آدم بی‌اطلاع کە چیزی را نمی‌داند. (حیرت.١٥١)

**تەخت بوون:** برێتی لە تێك رووخاندنی تەواو: کنایە از ویران شدن بە کلی. (مەژار.١٦٠)

**تەخت و بەخت:** برێتی لە خۆشی و کەیف: کنایە از شادی.

**تەختەیەکی کەمە:** برێتی لە یەکێك کە تەواو نەبێت، هەڵسوکەوتی نیمچە شێتانە بێت (جلال محمود. بەرگی٢. ٤١): [کنایە از آدم ناقص‌العقل کە نشست و برخاستش همچون دیوانگان باشد].

**تەخشان و پەخشانی کرد:** بێدەربەسانە بەم و بەوی بەخشی، بڵاوی کردەوە (جلال محمود. بەرگی٢. ٤١): [کنایە از این کە بدون علاقه آنرا بە این و آن بخشید، پخشش کرد].

**تەڕ بوونەوە:** برێتی لەو کەسانەی بە پیری ژن دێنن یان شوودەکن: کنایە از کسی کە در پیری همسر گیرد. (مەژار.١٦١)

**تەڕ و وشك بە یەکەوە نەسووتن:** گوناهبار و بێ گوناه بە یەکەوە گرفتار دەبن (جلال محمود. بەرگی٢. ٤١): [کنایە از این کە گناهکار و بیگناه با هم گرفتار می‌شوند].

**تەڕبوون:** برێتی لە عارنان و پەند وەرگرتن (خال.ف.٢٠٧): [کنایە از تنبیه شدن و پند گرفتن].

**تەڕەتۆڵەکە:** برێتی لە شتی هەرزان (خال.ف.٢٠٧): [کنایە از چیز ارزان].

**تەڕەماش:** برێتی لە شتی نەهێژاو و بێ نرخ: کنایە از چیزی بی‌ارزش. (مەژار.١٦٢)

**تەڕەماشی بۆ کردووە:** واتە هیچی بۆ نەکردووە. بە تەوسەوە، یا گەمەوە دەوترێت چونکە تەڕەماش ماشی ڕەش بە کەڵکی چێشت نایەت (جلال محمود. بەرگی١. ١٣٢): [کنایە از هیچ کاری برایش انجام نداده بە طعنه یا از روی شوخی گفته می‌شود].

**تەڕپۆشە:** برێتی لە یەکێك کە بەرگی ئاڵ و واڵا و جوان لە خۆ دەکات (جلال محمود. بەرگی١. ١٣٢): [کنایە از کسی کە اشتیاق بە پوشیدن لباس تازە دارد، شیک‌پوش].

**تەڕپۆش:** برێتی لە یەکێکی بە ساڵاچوو کە جلوبەرگ و کاڵای جوان لەبەر بکا (خال.ف.٢٠٧): [کنایە از شخص مسن کە شیک‌پوش باشد].

**تەڕدەستە:** ١) زۆر شارەزایە: کنایە از آگاه و دانا ٢) لە کاردا چالاکە: کنایە از این کە در کار کردن زرنگ و چابک است.

**تەڕدەستی:** برێتی لە چالاکی لە ئیش و کار (خال.ف.٢٠٧): [کنایە از زبر و زرنگ بودن در انجام کاری یا امری].

**تەڕدەم:** برێتی لە مەردومی قسەزان و قسەڕەوان (خال.ف.٢٠٧): [کنایە از مردم نکته‌دان و فصیح].

**تەرزەکوت:** برێتی لە سەرزەنشت و ئامۆژگاری لەسەر یەك (خال.ف.٢٠٩): [کنایە از سرزنش و نصیحت کردن

پشت سرهم].

**تەرزمانە (تەرِدەمە):** زمان لووس، قسەزانە، قسەخۆشە، قسەرِەوانە (جلال محمود. بەرگی۱. ۱۳۲): [کنایە از سخندان و خوش گفتار].

**تەرك:** برێتی لە (...): کنایە از آلت مرد.

**تەرِوتووشی:** برێتی لە باران و بەفر و لێزمە. دەڵێن بەم تەرِ و تووشییە بۆ کوێ دەچێت (جلال محمود. بەرگی۱. ۱۳۱): [کنایە از فصل بارش باران و برف و سرما].

**تەرووشك کردن:** برێتی لە دەرمان کردن: کنایە از تیمار کردن. (کریمپور.۱۱۷۷)

**تەزاندن:** برێتی لە ئازاردان و دلگیر کردنی یەکێك بە جورێك کە چاو ترسێن ببێ (خاڵ.ف.۳۱۰): [کنایە از رنجاندن و دل تنگ کردن کسی بە طوری کە مایە عبرت گرفتن او شود].

**تەزاندی:** ۱) سری کرد: ۱) [بی‌حسش کرد] ۲) زۆری لێ داوە تەمێی کرد، ترساندی: ۲) [کنایە از بسیار او را زد و تنبیە کرد، او را ترساند] ۳) زیانی پێ گەیاند (جلال محمود. بەرگی۲. ٤١): ۳) [کنایە از بە او آسیب رساند].

**تەسلیم:** برێتی لە گیان دەرچوون: کنایە از جان سپردن. (مەزبور.۱٦۳)

**تەشتم لە بان کەوتە خوارەوە:** ریسوای عالەم بووم (جلال محمود. بەرگی۲. ٤١): [کنایە از رسوا و بی‌آبروی عالم شدم].

**تەشتی زرِیا:** رسوا بوون: کنایە از رسوا شدن.

**تەشی ترِین:** برێتی لە مەردومی زۆر خۆر: کنایە از آدم پرخور.

**تەشیرِستن:** برێتی لە مێچکە مێچکە کردن بۆ یەکێك (خاڵ.ف.۳۱۲): [کنایە از تملق و چرب زبانی برای کسی].

**تەفروتوونا بوو:** ۱) پرش و بڵاو بووەوە: ۱) [کنایە از پراکندە و پخش شد] ۲) لە ناو چوو (جلال محمود. بەرگی۲. ٤١): ۲) [از بین رفت].

**تەقاندیەوە:** ۱) برێتی لە باسەکەی کردو بوو بە هەرا: ۱) [کنایە از این کە بە محض این کە بحث کرد آشوب و هنگامە بە پا کرد] ۲) نهێنیەکەی ئاشکرا کرد: ۲) [کنایە از راز را آشکار ساخت] ۳) رەتاندی و کاری زۆری کرد. دەڵێن: کرێکارەکەی زۆر تەقاندەوە (جلال محمود. بەرگی۱. ۱۳٤): ۳) [کنایە از این کە او را دواند بە وسیلە او کار بسیاری انجام داد].

**تەقانی:** [برێتی لە یەکێك کە کارێ خراپی کردبێ و رسوای ناو کۆمەڵ بێت]: کنایە از کسی کە رسوایی بیار آوردە باشد. (حیرت.۱٥۳)

**تەقە تێکەوتن:** برێتی لە چۆڵبوونی شوێنێك لە مەردوم بەرە بەرە (خاڵ.ف.۳۱٤): [کنایە از جایی کە از کم کم و بە تدریج مردم خالی شود].

**تەقە داکەوتن:** برێتی لە پەیدابوونی قسەی رِەق لە ناو چەند کەسێکا (خاڵ.ف.۳۱٤): [کنایە از بە وجود آمدن سخنان زشت در میان چند نفر].

**تەقە:** برێتی لە شەرِە تفەنگ: کنایە از تیراندازی. (مەزبور.۱٦٥)

**تەقەی بەرزبو بوو:** ناوبانگی زرِا، کەم و کورِیی دەرکەوت (جلال محمود. بەرگی۲. ٤۲): [کنایە از کسی کە بدیش بر سر زبانها افتاد و عیب‌هایش آشکار شد].

**تەقەی سەری تێ:** برێتی کە یەکێك کە هیچی لێ حاڵی نەبووە (رخزادی.۱۲۸): [کنایە از شخص ناآگاه و بی‌سواد کە از همە چیز بی‌خبر است].

**تەقەی لێ هەڵسا:** [برێتی لە کەسێك کە کاری خراپی

کردبیّ]: کنایه از کسی که کار بدی را انجام داده باشد. (قناحی قاضی.۲۸۲)

**تەقکردن:** بریتی له زۆر گریان و ماندوو بوونی منالّی ساوا (خال.ف.۳۱٤): [کنایه از بسیار گریه کردن نوزاد و خسته شدن او].

**تەڵه به قنگ نەتەقێنی:** بریتی له مەردومی فێڵباز (خال.١٦٦): [کنایه از مکار و نیرنگ‌باز].

**تەڵەتەقێن:** بریتی له مەردومی فێڵباز (خال.ف.۳۱۷): [کنایه از مردم نیرنگ باز].

**تەڵەکەبازە:** بریتی له یەکێکی کەڵەکبازە که بەپێچ و پەنا و ناڕاست بێت، بۆ ئەم و ئەو هەر خەریکی کەڵەك نانەوەیە (جلال محمود. بەرگی۱. ۱۲۰): [کنایه از فرد حقه‌باز و نادرست که برای این و آن مشغول دام گذاشتن و دسیسه باشد].

**تەڵەکەی مشکی کرتووە:** [بریتی له ژنی دووگیان]: کنایه از حامله شدن. (حیرت.١٥٤)

**تەڵەنانەوە:** بریتی له گزی کردن بۆ فریو دان: کنایه از مکر کردن. (مەزۆر.١٦٧)

**تەم:** بریتی له خەم و کەسەر: کنایه از غم و غصه. (مەزۆر.١٦٧)

**تەماشای دەمی تۆ دەکات:** ١) بە ڕاوێژ و تەگبیری تۆ دەڕوات، له قسەت دەرناچێت: ١) [با تو مشورت و به گفته‌ی تو عمل می‌کند، به حرف تو عمل می‌کند] ٢) چاوەڕێی ڕازی بوونی تۆیە (جلال محمود. بەرگی۲. ٤٢): ٢) [منتظر راضی بودن توست].

**تەنگ پێ هەڵچنین:** گوشارهێنان لەسەر کەسێ: کنایه از فشار آوردن و در تنگنا گذاشتن کسی.

**تەنگەگرتن:** بریتی له دلگیربوونی یەکێك له وتار یا کرداری یەکێکی‌تر (خال.ف.۳۲۱): [کنایه از رنجیدن کسی از حرف و عملکرد شخصی دیگر].

**تەنگدەستی:** بریتی له نەداری (خال.ف.۳۲۱): [کنایه از فقر].

**تەنگی پێ هەڵچنیگە:** بریتی له زۆری بۆ هێناوە و دەس و پای له زەوی بڕیگە (رخزادی.۱۳۹): [کنایه از فشار بر کسی آوردن و او را در تنگنا قرار دادن].

**تەنوور داخستن:** بریتی له کۆبوونەوەی چەن کەسێك و باسی یەکێك کردنیان بە خراپە (خال.ف.۳۲۲): [کنایه از اجتماع چند نفر و بدگویی و غیبت از دیگران].

**تەنووریان بۆ داخستووە:** واتە: بە گەرم باسی خراپەی دەکەن و پشتەمل ناوی دەبەن، کۆڕیان بۆ گرتووە و بە نهێنی پیلانیان بۆ کردووە (جلال محمود. بەرگی۱. ۱۳٦): [کنایه از غیبت کردن از کسی و دستجمعی دسیسه برایش چیده‌اند].

**تەنیا باڵ:** بریتی له کەسێك که بێ یارمەتیدەر بێ (خال.ف.۳۲۲): [کنایه از کسی که بی‌یار و یاور باشد].

**تەواوی کرد:** [بریتی له مردن]: کنایه از مردن. (حیرت.١٥٦)

**تەوقی سەریشی هەرچاوە:** زۆر وریایە. هیچی لێ ون نابێت (جلال محمود. بەرگی۲. ٤٢): [کنایه از بسیار هوشیار است. چیزی را فراموش نمی‌کند].

**تەونی بۆ نەنێتەو:** [بریتی له سەرگەرم کردنی کەسێك بە شتێك یان کارێکەوە]: کنایه از سر کار گذاشتن و سرگرم کردن کسی به کاری. (حیرت.١٥٦)

**تەونی بێ تان و پۆ هەڵ مەخە:** هەموو کارێ خۆ ئامادە کردنێکی دەوێ: کنایه از انجام هر کاری آمادگی لازم را می‌خواهد

**تەونی داگەسە دەس خۆیەو:** بریتی له یەکێك که بە دەستی خۆی گێرەوکێشە بۆ خۆی دروست بکا (جلال

محمود. بەرگی ٢. ٤٢): [کنایه از کسی که با دست خود دردسر برای خود ایجاد کند].

**تێدا کول و کافر بووم:** ١) واتە زۆرم لە گەڵ وت و زۆرم لێ کرد کەڵکی نەبوو و ملی نەدا و نەهاتە سەر ڕێ: ١) [کنایه از این که بسیار به او گفتم و فشار به او آوردم فایده نداشت تسلیم نشد]: ٢) نائومید بوون (جلال محمود. بەرگی٢. ٤٥): ٢) [کنایه از ناامید شدن].

**تێژ کردن:** برێتی لە هاندانی یەکێك لە سەرکردنی کارێك: کنایه از تحریک کردن کسی برای انجام کاری.

**تیر دەهاوێژێ و کەوانی دەشارێتەوە:** برێتی لە یەکێك دوژمنەکانی خۆی بە نهێنی دەفەوتێنێ، دوژمنایەتی خۆی بە نهێنی دەکا (جلال محمود. بەرگی٢. ٤٥): [کنایه از کسی که دشمنانش را مخفیانه از میان بردارد و مخفیانه دشمنی می کند].

**تیر لە تیردانیا نەماگە:** لە پیاوتی هیچی پێ نەماوە چ لە ڕووی ماڵەوە چ لە ڕووی بیر و زانینەوە (جلال محمود. بەرگی٢. ٤٥): [کنایه از نیروی مردانگی برایش نمانده و ناتوان است، از لحاظ مادیات یا از لحاظ فکر و اندیشه].

**تیر لە کەوان دەرچوو، ناگەڕێتەوە:** برێتی لە قسەیەك کە کرا گفتێك کە درا ناگەڕێتەوە (جلال محمود. بەرگی٢. ٤٥): [کنایه از سخنی که گفته شد اصلاح نمی‌شود و برگشت‌پذیر نیست].

**تێشوو کردن:** برێتی لە چێشت خواردن: کنایه از صبحانه خوردن. (مەزبور.١٧٥)

**تێچاندن:** ١) برێتی لە خراپە گوتن بۆ وێنە: (دەترسم بچێ لەوێ برێکمان بۆ تێبچێنێ): ١) [کنایه از ترس از بدگویی]. ٢) برێتی لە قسەی خراپکردن دەربارەی یەکێك لای گەورەیەك (خاڵ.ف.٣٢٧): ٢) [کنایه از بدگویی کردن پیش بزرگی].

**تێگیران:** ١) برێتی لە زۆرهاتن بۆ یەکێك، ٢) برێتی لە دەمقاڵێ دووکەس (خاڵ.ف.٣٣٣): ١) [کنایه از تحت فشار قرارگرفتن کسی] ٢) [کنایه از جدال لفظی بین دو نفر].

**تێغی چاك لە کالانیدا ناوەستێ:** پیاوی لێهاتوو و بە توانا، بەهرە و توانای خۆی دنوێنێ یان شێری میسری لە کالاندا خۆی ناگرێت (جلال محمود. بەرگی٢. ٤٥): [کنایه از شخص شایسته و توانا، بهره و توانایی خود را نشان می‌دهد].

**تێقوپان:** برێتی لە لاوازبوون و بەناواچوونی گیاندار (خاڵ.ف.٣٣٠): [کنایه از لاغری شدید].

**تێك ئاڵان:** ١) بەگژ یەکدا چوون: ١) [کنایه از با هم گلاویز شدن] ٢) باوەشیان بەیەکدا کرد و یەکیان گرت (جلال محمود. بەرگی٢. ٤٥): ٢) [کنایه از همدیگر را در آغوش گرفتند].

**تێکەڵی:** برێتی لە دۆستایەتی و خزمایەتی: کنایه از خویشاوندی. (مەزبور.١٧٦)

**تیکەی چەوری گیر هاتگە:** [برێتی لە وەدستهێنانی شتێك، کارێك یان کەسێکی بایخدار]: کنایه از به دست آوردن چیز، کار یا فردی باارزش. (حیرت.١٥٨)

**تێلاکێشانن:** برێتی لە شەڕکردن: کنایه از جنگ کردن. (کریمپور.١١٧٧)

**تێلای توون** (نەمومن.١١٥): [برێتی لە لەڕولاواز بوون: کنایه از شخص لاغر].

**تینی تیا نییە:** [بە یەکێکی لەڕولاواز دەوترێ]: کنایه از شخص ضعیف. (حیرت.١٥٩)

**تێی گیراوە:** ١) تەگەرە هاتۆتە ڕێی کارەکەی، چورتومێ هاتۆتە ڕێی: ١) کنایه از کارش به مانع

برخورده، حادثه و مصیبتی برایش پیش آمده ۲) تووش بووه پەکی کەوتووە: ۲) کنایه از این که گرفتار شده.

**تێیان کردووە بۆی:** لە پشتەسەریەوە خراپەیان وتوورە: کنایه از پش سر کسی بد گفتن.

# ج

**جاجم ئەنێتەوە** (ئەمومن.٣.٥٢): [برێتی لە یەکێك کە زۆر هاتوچوو بکات: کنایه از آدمی که زیاد آمدوشد داشته باشد].

**جادە دەپێوێت:** برێتی لە کەسێکی بە تاڵ و بێکار و کاسبی (جلال محمود. بەرگی٢. ٤٦): [کنایه از شخص بیکار و علاف].

**جارجار لچی تەڕ ئەکا:** برێتی لە یەکێك کە جارجارێك مەی دەخوات: کنایه از کسی که گاهی مشروب می‌نوشد. (حیرت.١٦٠/ جلال محمود. بەرگی٢. ٤٦)

**جافر تێی ڕیا:** واتە کارکەی تێك دا (جلال محمود. بەرگی٢. ٤٦): [کنایه از این که جعفر کار را بهم زد و خرابش کرد].

**جام باز:** برێتی لە مەردومی فێڵباز (خال.ف.٢٤١): [کنایه از آدم نیرنگباز].

**جامێ ئاوی خواردومەتەوە منی لە ئاویا دیگە:** واتە زۆر دژمە و ڕقی لێمە (جلال محمود. بەرگی٢. ٤٦): [کنایه از این که او با من بسیار دشمنی می‌کند و از من کینه به دل دارد].

**جامی زڕیا:** [واتە بێ ئابروویی بار هێنا]: کنایه از رسوایی ببار آورد. (حیرت.١٦٠)

**جانتاکەی خاڵییە:** ١) بێ‌مایەیە: ١) [کنایه از شخص بی‌سرمایه] ٢) هیچی لێ نازانێ (جلال محمود. بەرگی٢. ٤٦): ٢) [کنایه از چیزی نمی‌داند].

**جانتای خاڵیەو بووە:** واتە دەستمایەکەی تەواو بووە و قسەیەکی بۆ وتن نییە یان ئاگاداریەکی وای نییە: کنایه از مایه‌اش تمام شده و حرفی برای گفتن ندارد.

**جانتای خاڵییە:** [برێتی لە یەکێك کە شتێکی پێ نەبێ و زانیارییێکی وای نییە]: کنایه از آدم بی‌مایه و کم‌سواد. (حیرت.١٦٠)

**جانماز ئاو ئەکێشێ:** برێتی لە کەسێك دووڕەنگی و دووڕلی ماستاو و مەرایی دەکا، کلکە لە قێیەتی (جلال محمود. بەرگی٢. ٤٦): [کنایه از تملق و چاپلوسی].

**جانماز بە ئاوا کشان:** برێتی لە یەکێك کە خۆی بە پاك داوێن و بێ سووچ پیشان بدا: کنایه از شخصی که خود را پاک دامن و پرهیزگار جلوه دهد.

**جاونیانەوە:** بە یەکێك ئەڵێن کە زۆر بێت و بچێ (خال.٤٤): [کنایه از کسی که زیاد رفت و آمد داشته باشد].

**جرجاڵ (جەجاڵ) هەستاوە:** واتە زۆر قەرەباڵغ و جڕو جەنجاڵە (جلال محمود. بەرگی٢. ٤٧): [کنایه از بسیار شلوغ بودن].

**جرنگە هاتن:** برێتی لە بوڵەبوڵ و خۆتەخۆتی یەکێك: کنایه از کسی که پیش خود از شدت ناراحتی زمزمه کند.

**جگەر خۆی ئەخواتەو:** برێتی لە یەکێك کە خەفەتێکی فرەی هەیە (جلال محمود. بەرگی٢. ٤٧): [کنایه از آدمی که غم و غصەی زیادی دارد].

**جگەرسۆز:** برێتی لە یەکێك کە بە تەنگتەوە بێ و دڵی پێت بسووتێ (خال.ف.٣٤٦): [کنایه از شخصی که در موقع تنگنا به یاریت بشتابد و برایت دلسوزی بکند].

**جگەر سووتان:** برێتی لە مردنی ڕۆڵەی جگەرگۆشە (خال.ف.٣٤٦): [کنایه از مردن فرزند بسیار عزیز است].

**جگەر سووتاو:** برێتی لە کەسێك کە ڕۆڵەی مردبێ (خال.ف.٣٤٦): [کنایه از کسی که فرزندش مرده باشد].

**جگەرگۆشە:** برێتی لە ڕۆڵە: کنایه از فرزند. (مەزور.١٨٣)

**جڵەو هەڵتەکاندن:** بریتی لە جڵەو گرتنی یەکێك (خال.ف.٣٤٧): [کنایه از ممانعت کردن از انجام کاری].

**جڵەوشلکردن:** بریتی لە بەرەڵا کردنی منداڵ و بەردەست و گوێ نەدانیان (خال.ف.٣٤٧): [کنایه از رها کردن بچه و جلوگیری نکردن از آنها].

**جلێکی پیا دە:** واتە بێدەنگ بە (معروف.٣٨): [کنایه از ساکت باش].

**جمەی دێت:** زۆرچڕە، خەڵکێکی زۆری تێدایە (جلال محمود. بەرگی١. ١٤٩): [کنایه از جایی بسیار شلوغ است، مردم بسیاری در آن وجود دارد].

**جن پێچی داگە:** بریتی لە یەکێکی زۆر لاواز، بێ تاوان (جلال محمود. بەرگی٢. ٤٨): [کنایه از شخص بسیار لاغر، بی گناه].

**جن دەسی لێ وەشانگە:** بریتی لە یەکێك کە هەڵسوکەوتی شێتانە بێ (جلال محمود. بەرگی٢. ٤٨): [کنایه از کسی که نشست و برخاست دیوانەوار داشته باشد].

**جۆ ئەوا بە دیوارا:** بریتی لە مرۆڤی زیرەك و کارزان: کنایه از شخص زیرک و کاردان.

**جۆ بە دیوارا هەڵ ئەگێڕێ:** [بریتی لە ڕاپەڕاندنی کاری زۆر سەخت و دژوار]: کنایه از انجام کار بسیار سخت و دشوار. (حیرت.١٦٨)

**جۆی خواردگە:** [بریتی لە عەربەدەکێشان و دەنگ زلەو کردن]: کنایه از عربده کش. (حیرت.١٦٥)

**جۆی دیگە کا ناخوا:** بۆ سووکی بە یەکێ دەوترێ کە پارووێەکی چەوری دەست کەوت هەڵدەگرێتەوە، واز لە کاری پێشووی دێنێ (جلال محمود. بەرگی٢. ٤٩): [کنایه از کسی که کار بهتری را گیر آورده باشد و از کار قبلی پشیمان شود].

**جۆی لێ بڕی:** پەکی خست، دەستەوسانی کرد (جلال محمود. بەرگی١. ١٤٩): [کنایه از او را از کار انداخت، و ناچارش کرد].

**جنۆکە پێچی داگە** (نەمومن.٥٣): [بریتی کە یەکێکی لەڕولاواز: کنایه از شخص لاغر و ضعیف].

**جنۆکە گووشاگیە:** بریتی لە مرۆڤی لەڕولاواز: کنایه از شخص لاغر.

**جنۆکە:** بریتی لە یەکێکی زۆر زیرەك و فێڵباز: کنایه از شخص زرنگ و نیرنگباز.

**جنەکان دۆعایان هاوردگەسەو:** [بریتی لە یەکێکی بێ ئاوەز کە هاتبێتە سەر عەقڵ و ژیر بووبێت]: کنایه از کسی که سر عقل آمده. (حیرت.١٦٢)

**جنێو فرۆش:** بریتی لە یەکێك کە زۆر جنێو بدا (خال.ف.٣٤٨): [کنایه از کسی که زیاد فحش و ناسزا می گوید].

**جوڕە بە حەواوە ناڵ دەکا:** بریتی لە یەکێکی زۆر زرنگ و زیرەکە (جلال محمود. بەرگی٢. ٤٨): [کنایه از شخص بسیار زرنگ].

**جوست و جۆ:** هەوڵ و تەقالادان (جلال محمود. بەرگی١. ١٥٠): [کنایه از تلاش و کوشش].

**جۆشدان:** بریتی لە زۆر بەتین کردنی سۆبە: کنایه از بسیار گرم کردن بخاری. (مەزەر.١٨٦)

**جووتەی سەران:** بریتی لە دوو هەواڵی هەمیشە پێکەوە: کنایه از دو دوست که همیشه با هم هستند. (مەزەر.١٨٥)

**جووچکە لەقێ:** بریتی لە مەرایی و زمان لووسی کردن: کنایه از چاپلوسی. (مەزەر.١٨٦)

**جووچکەی کەنیا:** [بریتی لە سووك بوون و بێبایەخ بوون]: کنایه از خوار و خفیف شدن. (حیرت.١٦٥)

**جووکە برین:** برێتی لە خەفەکردنی یەکێك: کنایە از وادار کردن کسی به سکوت.

**جەرِەبایەی داوە:** تەنگی پێ هەڵچنیوە، هەناسەی لە بەر بریوە. ڕێی دەرفەتی بریوە (جلال محمود. بەرگی۲. ٤٦): [کنایه از فشار بر او آورده، خفه‌اش کرده. راه نجاتی برایش نگذاشته].

**جەرِەنال:** برێتی لە چاخ بوون: کنایه از شخص چاق.

**جەرگ و دڵی نییە:** ۱) ترسەنۆکە: ۱) [کنایه از ترسوست] ۲) پرکێشی نییە (جلال محمود. بەرگی۲. ٤٧): ۲) [اصراری ندارد].

**جەرگ و دڵی نییە:** [برێتی لە ترسەنۆك]: کنایه از آدم ترسو. (حیرت.١٦٦)

**جەرگم جەرگ نەخوات:** [برێتی لە زۆر توورەبوون لە کەسێك]: کنایه از کسی که از دستش سخت ناراحت و عصبی باشید. (حیرت.١٦٥)

**جەرگی بۆ هیچ کارێك نییە:** برێتی لە یەکێك ناوێرێت خۆی لە هیچ کارێك بدات (جلال محمود. بەرگی۱. ١٤٧): [کنایه از کسی که جرأت دست زدن به هیچ کاری را ندارد].

**جەرگی برِیاگە:** [بە یەکێك دەوترێ کە خۆشەویستێکی لە دەس دابێ]: کنایه از کسی که عزیزی را از دست داده باشد. (حیرت.١٦٦)

**جەرگی خۆی نەخواتەوە:** [برێتی لە یەکێك کە خەم و کەسەری ببێ]: کنایه از کسی که غم و اندوه دارد. (حیرت.١٦١)

**جەرگی سووتاوە:** [برێتی لە یەکێك کە منداڵێکی مردبێت]: کنایه از کسی که فرزندش را از دست داده باشد. (حیرت.١٦٦)

**جەرگی چووزاندەوە (تووزاندەوە):** ۱) داخ و خەفەتی پێ دا: ۱) [کنایه از او را دچار غم و غصه کرد]، ۲) ژانی بردە دڵیەوە (جلال محمود. بەرگی۱. ١٤٧): ۲) [درد به دلش کرد].

**جەفتاو:** برێتی لە چاییەك کە زۆر کوڵابێ: کنایه از چایی که زیاد جوشیده باشد. (کریمپور.٢٤٢)

**جەنگ بان لیفە شرِەس:** بە گۆبەندێکی بێ‌مانا دەوترێ کە ماوەیەکی زۆر بخایێنێ (جلال محمود. بەرگی۲. ٤٧): [کنایه از آشوبی بیهوده که مدت بسیار زیادی طول بکشد].

**جەنگ زەرگەرِییە:** [بە شەرِ و ئاژاوەی نێوانی ژن و شوو دەڵێن کە فرە وەخت زوو کۆتایی دێت]: کنایه از دعوای میان زن و شوهر که زود خاتمه می‌یابد. (حیرت.١٦٦)

**جەحانمی لێ پرِ:** [بێ تاوان بوون]: کنایه از بی گناهی. (حیرت.١٦٥)

**جەواهێر لە دەوری دەبارێت:** بە هەرکەسێ قسەی خۆش بێ، یان قسەی خێر بکا (جلال محمود. بەرگی۲. ٤٧): [کنایه از آدم خوش سخن و خوش‌زبان، که خیرخواه باشد].

**جێ پێ لەقبوون:** برێتی لە کەموکورتی هێنان لە پایە و مایەدا: کنایه از کم آوردن در پول یا مقام. (مەزهەر.١٩١)

**جێ پێ لێژ کردن:** برێتی لە دەرپەرِاندنی یەکێك لە شوێنێك بە زۆر: (خال.ف.٣٦١) [کنایه از با اجبار کسی را از جایی راندن].

**جێ پێ لێژ بوون:** [برێتی لە نەتوانینی مانەوەی کەسێك لە شوێنێك بە هۆی شتێکەوە]: کنایه از کسی که به دلایلی دیگر نتواند در جایی بماند. (فتاحی قاضی. بەرگی۱. ١١٠)

**جێگە پایەك دانە:** واتە:۱) [یادگارێك یان شوێنێك لە خۆت بە جێ بێڵا]. ۲) [سەبارەت بە کارێك قەولێکیان

لێ بستێنە]: ١) کنایە از اثری از خود بر جای بگذار یا یادگاری داشتە باش ٢) راجع بە کاری تعهد از آنها بگیر. (حیرت.١٦٧)

**جێگە خۆشکردن:** برێتی لە نیازی مانەوەی یەکێك لە شوێنێك (خال.ف.٣٦٢): [کنایە از کسی کە می‌خواهد در جایی بماند].

**جێگە خاڵیکردن:** برێتی لە دەس‌کێشان و چوونە دواوە لە کارێك یا ئیشێك: کنایە از دست کشیدن و پشیمان شدن از انجام کاری.

**جێگەی بۆ داخستنگە:** [واتە: تووشی بەڵای کردووە بەم زووانە نەجاتی نابێ]: کنایە از کسیٰ را بە مصیبتی یا حادثەای دچار کردن بە طوری کە دیر از آن نجات پیدا کند. (حیرت.١٦٨)

**جێگەی خۆی لە دڵیا کردۆتەوە:** برێتی لە جێ پەسەندی بووە: در دلش جا گرفتە.

**جێگەی خۆی لێژ نەکات:** [برێتی لە یەکێك کە بە ئاکار و قسەی ناڕاست و نەگونجاو خۆی دەخاتە مەترسییەوە]: کنایە از کسی کە با رفتار و گفتار نامناسب موقعیت خود را بە خطر بیندازد. (حیرت.١٦٨)

**جێگەی شوکری هەیە:** برێتی لە زۆر زیانمەند نەبووە: کنایە از کسی کە در معاملە یا تصادف زیاد آسیب ندیدە باشد.

**جیقی دەرهێنا:** ١) پلیشاندیەوە، کوشتی: ١) [کنایە از لهش کرد، او را کشت] ٢) وای لێ کرد لە تاوا هاوار بکات (جلال محمود. بەرگی١. ١٥٠): ٢) [کنایە از این کە از شدت فشار او را وادار بە داد و فریاد کرد].

**جیوە تێکراو:** بە یەکێکی زۆر بزێو ئەڵێن: کنایە از آدم بسیار ناآرام.

**جیوەی تێ کریاگە:** برێتی لە یەکێك کە ئارامی نییە و ناسرەوێ لە جێگایەکا و هەرجووڵەی دێ: کنایە از شخص ناآرام و بی‌طاقت.

**جیومیان تێ کردووە:** [بە یەکێك دەوترێ کە جم و جووڵی فرە بێت و لە شوێنێکا سەقام نەگرێ]: کنایە از کسی کە زیاد می‌جنبد و در جایی آرام و قرار ندارد. (حیرت.١٦٩)

**جێی باوەڕە:** سەر ڕاستە، متمانەی پێ دەکرێت (جلال محمود. بەرگی١. ١٥١): [کنایە از درستکار و امین است].

**جێی خۆی خۆش دەکات:** برێتی لە یەکێك کە بە زمانی شیرین و کردەوە خۆی دامەرزێنێت و خۆی بنجبەست بکات (جلال محمود. بەرگی١. ١٥١): [کنایە از کسی کە با خوش‌زبانی یا چرب‌زبانی بە هدفش برسد].

**جێی کلۆ بەردە (کوچکە)** (ئەمومن.٥٣): [کاردانەوەی کارێك: جای کلوخ سنگ است، هر عملی را عکس‌العملی است].

**جێیەك خورەی ئاوی لێ بێ، خۆی لێ نادا:** برێتی لە یەکێك کە زۆر بەپارێزە و خۆی لە دەردیسەر دوور ئەخات (جلال محمود. بەرگی٢. ٤٩): [کنایە از کسی کە خود را از خطر دور نگاه می‌دارد].

## چ

**چاپی مەکە:** [واتە درۆ مەکە]: کنایە از دروغ نگو. (حیرت.۱۷۰)

**چارەڕەش:** برێتی لە مەردومی کوڵۆڵی بەدبەخت (خال.ف.۹): [کنایە از مردم سیە روز و بیچارە].

**چاچۆڵە باز:** برێتی لە فێڵباز: کنایە از حیلە باز و نیرنگ باز.

**چاکگردن:** ئەسپ خستنە سەرمایین (خال.ف.۱۰): [کنایە از جفتگیری اسب].

**چاڵی بۆ هەڵ دەکەنێت:** ۱) پیلانی گەورەی لێ دەگێڕێت: ۱) [توطئەی بزرگی را برایش چیدە] ۲) دوو زمانی دەکات. بوختانی پێ دەکات (جلال محمود. بەرگی۲. ۵۰): ۲) [کنایە از منافقی و دورویی، بهتان زدن].

**چاوباز:** ژنی چاو جوان: کنایە از زن زیبا چشم. (مەژار.۱۹۸)

**چاو بە درگاس** (ئەمومن.۵۳): [برێتی لە چاوەڕوانی یەکێك: کنایە از منتظر کسی بودن].

**چاو بە دواس:** ۱) برێتی لە یەکێك کە لە کاتی سەرەمەرگدا چاوەڕێی خۆشەویستێکی بکات: ۱) [کنایە از کسی کە در آخرین لحظات مرگش چشم انتظار عزیزش باشد] ۲) ناتوانێت دڵ لە دنیا بکەنێت (جلال محمود. بەرگی۲. ۵۰): ۲) [نمی‌تواند دل از دنیا بکند].

**چاو بە دواس:** [چاوەڕوانە]: چشم انتظار است. (حیرت.۱۷۱)

**چاو بە ڕێگەس** (ئەمومن. ۵۳): [برێتی لە چاوەڕوانی یەکێك بەکێشیت کە بگاتە بەرەوە. کنایە از منتظر کسی بودن کە از راە برسد].

**چاو بە ڕێگەوە بوون:** [برێتی لە یەکێك کە چاوەڕێ کەسێ بێت]: کنایە از کسی کە چشم بە راە دیگری باشد. (حیرت.۱۷۱)

**چاو بەستی لێ کرد:** فێڵی لێ کرد، کەڵەکی لێ دا (جلال محمود. بەرگی۱. ۱۵۲): [کنایە از با او فریبکاری کرد].

**چاو بقووچێنە:** [برێتی لە چاوپۆشی کردن لە کارێك یان شتێك]: کنایە از چشم‌پوشی یا چشمت را درویش کن. (حیرت.۱۷۱)

**چاو بکەرەوە:** [بە یەکێك دەڵێن کە لە ئیش و کارا وردبین بێت]: کنایە از دقیق بودن در کار. (حیرت.۱۷۱)

**چاو ترسێن:** ۱) برێتی لە گەورەیەك کە لە ماڵا لێی بترسن: ۱) [کنایە از بزرگی کە در خانە از او حساب ببرند] ، ۲) برێتی لە یەکێکی پەند وەرگرتوو و تەنبێ بوو (خال.ف.۱۲): ۲) [کنایە از شخصی کە درس عبرت گرفتە].

**چاو پێ سپی کردن:** برێتی لە تیابردن و تەمێ کردنی یەکێك: کنایە از کسی را نابود و تنبیە کردن.

**چاو پێ هەڵنەهاتن:** برێتی لە شەرم لێ کردن: کنایە از شرم کردن. (مەژار.۱۹۹)

**چاو پێ هەڵێنان:** برێتی لە بە چاوەوە کردن: کنایە از چشم زخم زدن. (مەژار.۱۹۹)

**چاو جن دەرتێرێ** (ئەمومن.۵۳): [برێتی لە یەکێکی زۆر بزیو و زیرەك: کنایە از شخصی کە بسیار زرنگ و آگاە].

**چاو جن دەرهاوردن** (مریوخ.۷): [برێتی لە یەکێکی زیرەك و جەربەزەدار: کنایە از شخص زیرک و ناآرام].

**چاو داخستن:** برێتی لە شەرمەزاربوونی یەکێك (خال.ف.۱۳): [کنایە از شرمندە شدن کسی].

**چاو دەرپەڕاندن:** بڕیتی لە تووڕەبوون (خاڵ.ف.١٣): [کنایە از خشمگین بودن کسی].

**چاو دەلەومرێنێت:** بڕیتی لە یەکێك کە زۆر چاو بۆ ئافرەتان دگێڕێت (جلال محمود. بەرگی٢. ٥١): [کنایە از کسی کە زیاد بە زنان مینگرد].

**چاو دوژمن کوێرەوکەر:** [بڕیتی لە وەدستهێنانی شتێك یا سەرکەوتووییەك کە کەسانیتر یا دوژمن پێیان ناخۆش بێت]: بە دست آوردن چیز یا موفقیتی کە دیگران یا دشمنان از آن ناخشنود باشند. (حیرت.١٧٢)

**چاو راو دەکات:** فێڵ و تەڵەکەبازی دەکات (جلال محمود. بەرگی١. ١٥٣): [کنایە از این کە نیرنگ و حقەبازی می کند].

**چاو رۆشن کەرە:** بڕیتی لە شتێك کە هۆی چاوەڕوونی بێ (چاو رۆشنی) (خاڵ.ف.١٣): [کنایە از دیدن چیزی یا کسی کە آرزوی دیدار او را داشتن و موجب خوشحالی شود].

**چاو چاو ناوینێ:** [تاریك یا تەماویە]: کنایە از شدت باد و توفان و مه یا تاریکی کە کسی در آن دیدە نمیشود. (حیرت.١٧١)

**چاو چەپەڵ** (نەمومن.٥٣): [بڕیتی لە چاوچڵە: کنایە از چشم شور].

**چاو چەرمگ:** لە یەکێکی بێشەرم: کنایە از شخص بی شرم و آبرو.

**چاو چنۆك:** بڕیتی لە ڕژد و بەرچاوتەنگ: کنایە از آزمند و حسود. (مەژار.١٩٩)

**چاو قایم:** نەترس، بەغیرەت: کنایە از نترس و دلیر.

**چاو لێ پۆشی:** لێی خۆش بوو، لە کەموکۆڕی و هەڵەی بورد (جلال محمود. بەرگی١. ١٥٧): [کنایە از گناه او را بخشید].

**چاو مار دەرتێری:** ١) [بڕیتی لە یەکێکی ئازا و چالاك]. ٢) [بڕیتی لە یەکێکی چالاك و بە دەستەو برد]: کنایە از چابک و زرنگ، کنایە از تیرانداز ماهر. (حیرت.١٧٢)

**چاو مار دەرتێری** (مەریوخ.٧): [بڕیتی کە یەکێکی زۆر بزیو و فێڵباز: کنایە از شخص زیرک و نیرنگ باز].

**چاو مار دەردەهێنێت:** بڕیتی لە تیرەندازێکی کارامە (جلال محمود. بەرگی١. ١٥٦): [کنایە از تیرانداز ماهر].

**چاو مەنە یەکا:** [واتە چاوپۆشی مەکە]: کنایە از نادیدە نگیر و چشمپوشی و اغماض مکن. (حیرت.١٧٢)

**چاو و راوە:** بڕیتی لە قاوداکەوتن و بڵاوەو بوون: کنایە از شایعە.

**چاو یاری بکێشە:** بڕیتی لە یەکێك کە وریای بیت و چاوی لێ بڕی کە چی دەکات: کنایە از ناظر بر اعمال کسی بودن.

**چاوبەرەژێر:** بڕیتی لە مەردومی تەریق بەرامبەر بە یەکێك (خاڵ.ف.١١): [کنایە از شخص شرمندە و خجل شدە در برابر کسی].

**چاوبەست:** ١) واتە هەڵخلەتێنەر، فریودەر: ١) [کنایە از فریب‌کار]. ٢) بڕیتی لە مەردومی دەستبڕ (خاڵ.ف.١٢): ٢) [کنایە از شخص کلاهبردار].

**چاوبرسی:** بڕیتی لە کەسێك کە بەرچاوی تەنگ بێ لەشت خواردنا (خاڵ.ف.١١): [کنایە از شخص خسیس].

**چاوت بکەرەوە:** ١) هوشیار بەو ئاگات لە خۆت بێت و بیربکەرەوە: [کنایە از هوشیار و مواظب باش و فکر کن] ٢) بۆ هەڕەشەیە واتە بزانە ئەنجامی کردەوەو و قسەکانت خراپ دەبێت و خراپیشت بەسەر دێت (جلال محمود. بەرگی٢. ٥٠): [یعنی بە پایان اعمالت بیندیش].

**چاوت پێیەوە بێت:** برێتی لە یەکێك کە چاودێر و وریای شتێك یا کەسێك بێت: کنایه از کسی که از دور ناظر به اعمالش باشید.

**چاوت داخە:** [واتە مەڕوانە]: کنایه از چشمت را درویش کن. (حیرت.172)

**چاوت ڕۆشن:** واتە: دلت شاد، دەڵێن: (چاوت ڕۆشن کوڕەکەت لە شار هاتەوە): کنایه از آرزوی شادمانی بیشتر برای کسی: کنایه از چشمت روشن پسرت از شهر برگشت.

**چاوە ڕوان:** برێتی لە زۆر چاوەڕوانی کردنی کەسێك بۆ شتێك (خاڵ.ف.13): [انتظار کشیدن زیاد کسی برای چیزی].

**چاوە چاویە:** [بە یەکێك دەوترێ کە چاوەڕوانی یەکێك یا شتێك بێت]: کنایه از کسی که منتظر کسی یا چیزی باشد. (حیرت.173)

**چاوە قووڵەی گرتکە:** (ئەمومن.53): [برێتی لەڕولاوازبوونی یەکێك بە بۆنەی نەخۆشینێکەوە. کنایه از کسی که به علت بیماری بسیار ضعیف شده باشد].

**چاوت نەفرێ:** [واتە: نوقلانەی خراپ مەدە]: کنایه از فال بد نزن. (حیرت.171)

**چاو تاریك بوون:** برێتی لە رق هەڵستانی زۆر: کنایه از خشم شدید. (مەزەر.199)

**چاوتاریك:** کەسێ کە دوارۆژ بە خراب دەزانێ و بە هیچێ دڵخۆش نییە: کنایه از شخص بدبین. (مەزەر.199)

**چاوەڕوانە:** برێتی لە یەکێك کە لە دواین سات و ئاکامی مەرگدا بێت: کنایه از کسی در حال مرگ که آخرین لحظات زندگیش را می گذراند.

**چاوحیز:** 1) برێتی لە یەکێك کە بە خەیانەتەوە بۆ ژنی خەڵك بڕوانێ: 1) کنایه از آدم نظر حرام 2) برێتی لە یەکێك لە ڕووی نەیەت چاو هەڵبڕێ: 2) سر به زیر انداختن از شرم. (حیرت.171/خاڵ.ف.13)

**چاوسوور:** کەسێکی سێرە تاڵ، خوێن ڕێژ، شەڕانی: شخص مستبد و خونریز. (مەزەر.200)

**چاوسوورکردنەوە:** برێتی لە هەڕەشەکردن لە یەکێك (خاڵ.ف.13): [کنایه از تهدید کردن کسی].

**چاوچلکن:** [برێتی لە یەکێك کە چاونە]: کنایه از آدم بدچشم. (حیرت.171)

**چاوگەرمکردن:** برێتی لە سەرخەوشکاندن، سووکە خەوکردن (خاڵ.ف.14): [کنایه از چرت زدن].

**چاوفڕین:** برێتی لە مێوان هاتن (چاوم ئەفڕێ: میوانمان بۆ تێ): کنایه از آمدن مهمان، پلك زدن نشانەی آمدن مهمان است.

**چاوقووچاندن:** برێتی لە چاو پۆشین لە کارێ: کنایه از چشم پوشی کردن. (مەزەر.200)

**چاوقووچیاگ:** برێتی لە یەکێکی ڕژد و چنوك: کنایه از شخص خسیس. (مەزەر.200)

**چاوکردنەوە:** 1) برێتی لە ئاگاداربوون لە دنیا و ناسینی خەڵك: 1) کنایه از اطراف خود را شناختن 2) برێتی لە شارەزابوون و بەڵەدبوونی یەکێك: 2) کنایه از آگاه شدن کسی. (مەزەر.200)/(خاڵ.ف.14)

**چاولێدان:** برێتی لە بە چاوەوە کردن: کنایه از چشم زخم زدن.

**چاولێکەری:** برێتی لە لاسایی کردنەوە: کنایه از تقلید کورکورانه کردن.

**چاولێکنان:** برێتی لە نووستن یا مردنی یەکێك (خاڵ.ف.14): [کنایه از خوابیدن و مردن کسی].

**چاوم ئاو ناخواتەوە:** 1) برێتی لە بڕوا نەکردن بە شتێك یا کەسێك: 1) کنایه از اعتماد نداشتن به چیزی

یا کسی ۲) دەست شۆردن لە ماڵ یا شتێك: ۲) کنایە از نامید شدن از چیزی.

**چاوم لار بوو:** [برێتی لە چاوەڕوان کەسێ یان شتێك بوون]: منتظر دیدن کسی یا چیزی بودن. (حیرت.۱۷۳)

**چاومان بە دەس تۆیە:** چاوەچاوی یارمەتی تۆین (جلال محمود. بەرگی۲. ٥١): [کنایە از منتظر کمک و یاری تو هستیم].

**چاومان ها بە دەس تۆوە:** [چاوەڕوانی یارمەتی تۆوین]: کنایە از انتظار کمك و یاری تو هستیم. (حیرت.۱۷۲)

**چاونەترس:** دلێرە، لە هیچ سڵ ناکاتەوە (جلال محمود. بەرگی۱. ١٥٤): [کنایە از آدم شجاع کە از هیچ چیزی پروا ندارد].

**چاوو پێیەوە بێ:** [واتە وریا بە شتێك نەدزی]: کنایە از مواظب باش چیزی ندزدد. (حیرت.۱۷۳)

**چاوی بە ڕۆشنایی کەفتگە:** بە سامان و دراو گەیشتووە (جلال محمود. بەرگی۲. ٥١): [کنایە از کسی کە بە ثروت و پول رسیدە است].

**چاوی بەر پای خۆی نابینێ:** برێتی لە یەکێکی زۆر بەدەمار (رخزادی.۱٥٠): [کنایە از شخص متکبر].

**چاوی بەرایی نادات برای خۆی بوینێ:** [برێتی لە لەچەر و ئێرەییبەر]: کنایە از آدم حسود. (حیرت.۱۷۳)

**چاوی تێ بڕیوە:** ۱) نیازی خواردنی هەیە: ۱) کنایە از این کە نیاز بە خوردن دارد ۲) نیازی داگیر کردن و دەست بەسەردا گرتنی هەیە: ۲) کنایە از احتیاج بە غصب کردن و ضبط کردن چیزی را دارد.

**چاوی پەڕیە تەوق سەری:** [برێتی لە سەرسووڕمان]: کنایە از شگفتی و تعجب. (حیرت.۱۷۳)

**چاوی پەڕییە پشتی سەری:** زۆر تووڕە بووە (جلال محمود. بەرگی۱. ١٥٥): [کنایە از بسیار خشمگین شدە].

**چاوی پێدا خشاند:** تەماشایەکی گورجی کرد (جلال محمود. بەرگی۱. ١٥٥): [کنایە از نگاە سریعی بە او انداخت].

**چاوی خستووەتە سەری:** [برێتی لە یەکێك کە شتێکی لە بەر چاو گرتبێ]: کنایە از کسی کە چیزی را مدنظر گرفتە باشد. (حیرت.۱۷٤)

**چاوی داچەقاندگە:** [برێتی لە یەکێك کە چاوەڕێ گەین شتێك یان ڕووداوێك بێت]: کنایە از کسی منتظر رسیدن چیزی یا پیش‌آمدی یا حادثەای باشد. (حیرت.۱۷٤)

**چاوی ڕەشی کاڵ بووە:** برێتی لە یەکێك کە هیوای نەمابێ (خال.۱۷۷): [کنایە از کسی کە امیدش بە یأس تبدیل شدە].

**چاوی سوور بووە:** برێتی لە یەکێك کە یاخی و مل هوڕ بووبێ (خال.۱۷۷): [کنایە از سرکش و یاغی شدە است].

**چاوی سوورمە:** زۆر خۆشەویستە و ڕووناکیی چاومە (جلال محمود. بەرگی۲. ٥١): [کنایە از کسی کە بسیار عزیز است و نور چشم من است].

**چاوی شۆڕە:** ۱) شەرمەزارە: ۱) [کنایە از شرمسار است] ۲) ناپاکە: ۲) [نادرست است] ۳) سووکە: ۳) [بی‌آبروست] ٤) خۆی بە گوناهبار دەزانێت (جلال محمود. بەرگی۱. ١٥٦): ٤) [خودش را گناهکار می‌داند].

**چاوی چەرمگ بوو:** [واتە: ئەوەندە چاوەڕوانی کێشا تا کوێر بوو]: کنایە از انتظار بیش از حد، تا حد کوری انتظار کشیدن. (حیرت.۱۷٤)

**چاوی چەرمگە و بووگە:** برێتی لە یەکێك لە خەریکە ئەمرێ (رخزادی.۱٥٠): [کنایە از شخص در حال مرگ].

**چاوی قووچاند:** خۆی لە کەموکۆڕییەکەی گێل کرد.

وەك نەیدیبێت (جلال محمود. بەرگی۲. ٥١): [کنایه از این که خود را به نادانی زده مثل این که نمی‌بیندش].

**چاوی کردووەتە چوار:** [واتە: زۆر بە وردی ئەڕوانیێ]: کنایه از بادقت می‌نگرد. (حیرت.١٧٤)

**چاوی لە خوێن پڕە:** برێتی لە یەکێکی پیاوکوژ کە کۆ لە خوێنڕشتن ناکات: کنایه از آدم قاتل که از خونریزی ترسی ندارد.

**چاوی لێ داگرە:** برێتی لە یەکێك کە وریای بیت و بزانێ چی دەکات: کنایه از مواظبت و مراقبت.

**چاوی لێ داناخا:** [زۆر چاوەدێری کردن]: کنایه از بسیار مراقب بودن. (حیرت.١٧٥)

**چاوی لێ دەرپەڕاند:** هەڕەشەی لێ کرد، لێی تووڕە بوو (جلال محمود. بەرگی۱. ١٥٧): [کنایه از او را تهدید کرد و از او خشمگین شد].

**چاوی لێ دەکات:** لاسایی دەکاتەوە. وەك ئەو دەکات (جلال محمود. بەرگی۱. ١٥٧): [کنایه از این که از او تقلید می‌کند و مثل او رفتار می‌کند].

**چاوی لێ قووچاند:** ۱) بە دەربەسەوە نەهات: ۱) [کنایه از مقید نشد] ۲) حەرام بوو خواردی و گوێی نەدایە: ۲) [کنایه از حرام بود و خوردش و بی‌خیالش شد]. ۳) پشتی تێ کرد: ۳) [از او دست برداشت] ٤) چاوی پۆشی و لێی‌بورد (جلال محمود. بەرگی۱. ١٥٧): ٤) [از او چشم پوشید و گذشت].

**چاوی لێ ناترووکێنێت:** ۱) بەگەرم چاو دێری دەکات، یان لە خۆشەویستیدا یان بۆ مەبەستێك: ۱) [کنایه از خوب مواظبت از کسی کردن یا از روی محبت یا برای نیتی خاص] ۲) بێ سڵ و ترس و شەرم ئەو کارە دەکات (جلال محمود. بەرگی۱. ١٥٧): ۲) [کنایه از بدون ترس و شرم آن کار را انجام می‌دهد].

**چاوی لێ ناقووچێنێت:** برێتی لە یەکێکی حەراخۆرە و دەربەس نییە کە ماڵی ئەم و ئەو بخوات: کنایه از آدم حرام‌خوار که ترسی از خوردن مال دیگران ندارد.

**چاوی لێ هەڵ مەگرە:** برێتی لە چاوەدێری کردنی یەکێك: کنایه از مواظب و مراقب بودن.

**چاوی نییە تواشای کا:** برێتی لە یەکێك کە لە ڕژدی و بەرچاوتەنگیدا چاوی بڕوا نادا خاسی یا سامانی یەکێك ببینێ: کنایه از شخص خسیس که چشم ترقی دیگران را ندارد.

**چاوی ها بە دەستیەوە:** برێتی لە بە هیوای شتێك بوون لە کەسێك: کنایه از انتظار چیزی از کسی داشتن.

**چاوی ها بە دواوا:** ۱) [برێتی لە چاوەڕوان]. ۲) [برێتی لە مردووێك کە هاتبێتە خەوی کەسێك و داوای چاکە بکات کە قەوم و خزمانی لە دنیادا بۆی بکەن]: ۱) کنایه از چشم‌انتظار. ۲) کنایه از مرده‌ای که به خواب کسی آمده باشد و چشم‌انتظار خوبی و اعمال نیک باشد که از طرف نزدیکانش برایش انجام دهند. (حیرت.١٧٥)

**چای بێوەژن بۆ دیان باشە :** [برێتی لە یەکێکی ڕژد و بەرچاوتەنگ]: کنایه از آدم خسیس. (حیرت.١٧٥)

**چرا سەوز:** برێتی لە حەز کردن، ئیزنردان: کنایه از تمایل داشتن، اجازه دادن.

**چرا سوور:** برێتی لە حەز نەکردن، ئیزنندان: کنایه از عدم تمایل، اجازه ندادن.

**چرات ڕۆشن:** برێتی لە هەوەڵی شەو: کنایه از اول شب.

**چراکوژرانەوە:** [برێتی لە تەواوبوونی بەختەوری و بەختیاری یەکێك]: کنایه از پایان یافتن خوشبختی کسی. (فتاحی قاضی. بەرگی۱. ١١٨)

**چرای تەمەنی کوژیاوە:** [برێتی لە مردن]: کنایه از مردن. (حیرت.۱۷۸)

**چرای دزان:** [برێتی لە چرای کەم سوو و زۆر کز]: کنایه از چراغ کم نور.(فتاحی قاضی. بەرگی۱ .۱۱۸)

**چرای کەس تا ڕۆژ ناگرێ:** واتە هیچ کەس تا سەر بەختی یار نابێ: کنایه از هیچ‌کس تا ابد خوشبخت نخواهد ماند.

**چرای ماڵەکەی ئەگرێ:** [برێتی لە یەکێك کە کوڕی بێ و کوڕەکەی فەرمانبەری بێ]: کنایه از کسی که فرزند پسر فرمانبردار و مطیع داشته باشد. (حیرت.۱۷۸)

**چرای ماڵەکەی کوژیاوە:** [کاتێکە گەورەی ماڵ بمرێ]: کنایه از بزرگ و سرپرست خانواده فوت کند. (حیرت.۱۷۸)

**چرای ماڵێ:** [برێتی لە پیاوی ماڵ]: کنایه از مرد خانه. (فتاحی قاضی. بەرگی۱ .۱۱۸)

**چرای نابووتی هەڵ کردووە:** ۱) برێتی لە یەکێك کە بڕیاری نابوتی خۆی داوە: ۱) [کنایه از کسی که تصمیم بر نابودی خویش گرفته] ۲) خۆی وا پیشان دەدات کە هیچی نییە. بە تەوەسیشەوە دەوترێت (جلال محمود. بەرگی۱. ۱۶۱): ۲) [کنایه از این که خودش را طوری جلوه می‌دهد که چیزی ندارد برای طعنه و سرزنش است].

**چروچاو:** برێتی لە روخسار (جلال محمود. بەرگی۱. ۱۶۱): [کنایه از صورت].

**چزە لێ هەستان:** برێتی لە ئازار یا زیانێکی کوتوپڕی بە یەکێك (خاڵ.ف.۱۸): [کنایه از بلای ناگهانی].

**چزە لێ هەستانلن:** برێتی لە پێوەدانی چز و وداربە گیاندارەوە (خاڵ.ف.۱۸): [کنایه از نیش زدن].

**چزێکمان لێ ئەدەن:** [شتێك بەسەرمانا دێنن، دزمان لێ ئەکەن]: کنایه از به ما دستبرد می‌زنند. (حیرت.۱۷۹)

**چڵ ئەوەشێنێ:** [ئێشی دیان و برین]: کنایه از درد شدید دندان یا زخم، تیر کشیدن. (حیرت.۱۷۹)

**چلەی چاوی تێ:** [برێتی لە یەکێك کە هێشتا نەخەوتووە و چاوی لە یەك نەناوە]: کنایه از کسی که هنوز بیدار است. (حیرت.۱۸۰)

**چلەی چاوی دێ:** برێتی لە یەکێك بێدار بێ و کەمخەو بێ (خاڵ.۱۷۹/ جلال محمود. بەرگی۱. ۱۶۰): [کنایه از شخص بیدار و کم‌خواب].

**چلکاو خۆر:** برێتی لە مەردومی پاشماوە خۆر: کنایه از خوشه‌چین و بیچاره.(مەزهەر.۲۰۵)

**چلکن دەوڵەمەن:** [برێتی لە بەسامانی ڕژد]: کنایه از ثروتمند گداصفت. (حیرت.۱۷۹)

**چما بارە شاری تێتەوە:** [بە یەکێکی زۆر خۆشحال و بەکەیف دەڵێن]: کنایه از بسیار خوشحال بودن. (حیرت.۱۸۰)

**چما مووی هەڵ ئەکزێنێ:** برێتی لە یەکێك کە زوو لە جێگایەکا حازر بێ: کنایه از کسی که زود در هر جایی حاضر شود.

**چنار بەر ماڵەکەیان ناوینێ:** [برێتی لە یەکێکی فیزن و دەماراوی]: کنایه از متکبر. (حیرت.۱۸۱)

**چناکە شکیاگ:** برێتی لە زۆروێژی چەقەسرۆ: کنایه از وراج. (مەزهەر.۲۰۷/ حیرت.۱۸۱)

**چناکە کوتان:** برێتی لە گیانەلاو، ئاویلکە دان: کنایه از حالت نزع.

**چناکە لێدان:** [واتە: قسەی زۆر کردن]: کنایه از حرف زیاد زدن. (حیرت.۱۸۱)

**چناکەی ورد بووە:** [واتە: ژیریان کردووە]: کنایه از آدمی که ادب شده است. (حیرت.۱۸۱)

**چنگ ئاسنینە:** برێتی لە یەکێك کە دەستی زبر و درشتی بێ: کنایە از کسی کە دستهای زمخت و خشن داشتە باشد.

**چنگ پان کردنەوە:** برێتی لە سواڵ کردن (خاڵ.ف.٢٢): [کنایە از گدایی کردن].

**چنگ نادا لە دڵ:** [واتە زۆر زەریف نییە]: کنایە از زیبا و تو دل برو نیستِ. (حیرت.١٨١)

**چنگە پرووکێ:** [برێتی لە یەکێك کە زۆر لەگەڵیا گەمەو گاڵتە و دەسبازی کرابێ و بە لەشیا زۆر دەس هێنرابێ]: کنایە از جنس مؤنثی کە زیاد بە بدنش دست زدە باشند. (حیرت.١٨١)

**چنگی بە سەر داگرت:** داگیری کرد (جلال محمود. بەرگی١. ١٦٢): [کنایە از غضبش کرد].

**چنگی لێ گیر کرد:** پێی گەیشت، دەستی کەوت و دەستی لێ قایم کرد (جلال محمود. بەرگی١. ١٦٢): [کنایە از دستگیرش شد].

**چوار باڵ کردن:** برێتی لە بریندار بوونی هەردوو قۆڵ بە گوللە: کنایە از تیر خوردن هر دو بازو. (مەژار.٢٠٨)

**چوار پەلی بەستراوەتەوە:** برێتی لە یەکێك کە دەسەڵاتی براوە. هیچی پێ ناکرێت (جلال محمود. بەرگی١. ١٦٢): [کنایە از کسی کە قدرت و توانایی برایش نماندە و نمی‌تواند کاری انجام دهد].

**چوار پەلی شکاوە:** ١) زۆر ماندووە: ١) [بسیار خستە است] ٢) زۆر نەخۆشە و خەریکە دەمرێت: ٢) [کنایە از بسیار مریض است و مرگش نزدیک است] ٣) ورەی بەرداوە (جلال محمود. بەرگی١. ١٦٢): ٣) [کنایە از روحیەاش را از دست دادە].

**چوار خاڵ کێشان:** برێتی لە ڕووڕەش کردن و ئابڕووبردن: کنایە از رسوا کردن. (مەژار.٢٠٩)

**چوار دیواری:** برێتی لە ماڵ: کنایە از خانە.

**چوار چاو کردن:** برێتی لە سەرلێ شێواندنی یەکێك (خاڵ.ف.٢٤): [کنایە از پریشان و سر گردان کردن کسی].

**چوار مێخکێشیان:** برێتی لە یەکێك کە بێ دەسەڵاتیان کردووە، جووڵەیان لێ بڕیوە (جلال محمود. بەرگی٢. ٥٤): [کنایە از این کە او را از قدرت و حرکت انداختند].

**چوارچاو:** ١) برێتی لە پیاوێك دوو ژنی ببێ: ١) [کنایە از مرد دو زنە] ٢) برێتی لە چاویلکە لە چاو (خاڵ.ف.٢٤) ٢) [کنایە از عینکی].

**چوارچاوبوون:** برێتی لە سەرلێ شێوان (خاڵ.ف.٢٤): [کنایە از پریشان و سر گردان].

**چوارمێخەی کێشاوا:** [برێتی لە وەڵام دانەوەی توند بە دوژمن و ئارادانەوەی چاو لێ نەکراو گرتن و ویل کردن و بەستن]: کنایە از جواب دندان‌شکن دادن بە دشمن، اسیر و بستن کسی. (حیرت.١٨٢)

**چوگە ناو خۆیا:** کەوتنە نێو فکر و خەم و خەیاڵ: کنایە از در اندیشە شدن، درهم و پیچیدە شدن، خودخوری کردن.

**چوکلە چزێ:** برێتی لە ئازار و ئێشی زۆر (خاڵ.ف.١٩): [کنایە از درد و رنج فراوان].

**چوکلەشکێن:** برێتی لە یەکێك کە چەڵتووك بخاتە کار و باری ئەم و ئەوەوە: کنایە از کسی کە در کار دیگران کارشکنی کند. (مەژار.٢١٢)

**چوکلەی تێ‌ئەخات:** [برێتی لە یەکێك کە بە کردەوەیان قسە نێوان خەڵك بشوێنێ و شەیتانی بکا و کاریان تێك بدا و بێ ئابڕوویی و ئاژاوگێری بکات]: کنایە از کسی کە با بر هم زدن میانەی دیگران کارشکنی و دو بە هم زنی کند. (حیرت.١٨١)

**چۆخەڕەش:** برێتی لە چێشتی ماشی ڕەش: کنایە از

آش ماش سیاه.

**چۆك دادان:** بەزین و مل شۆڕ کردن: کنایه از شکست خوردن و تسلیم شدن.

**چۆکدان:** برێتی لە خواردنی شتێك بە تەواوی و نەهێشتنی: کنایه از تمام خوردن چیزی.

**چۆکی دادا:** ١) بەزی، ملی شۆڕ کرد: ١) [کنایه از شکست خورد و تسلیم شد] ٢) وازی هێنا (جلال محمود. بەرگی١. ١٦٤): ٢) [کنایه از دست کشید].

**چۆلك:** برێتی لە ئاودەست، پێشاو: کنایه از مستراح. (مەزبر.٢٠٩)

**چاپەزی گەورەکان:** [برێتی لە یەکیك چالێنەر کە هەوەڵێن جار بۆ خۆی چای داکا لە دواییدا بۆ کەسانی تر]: کنایه از شخص چایی‌پز یا آبدارچی که اولین بار برای خویش چای بریزد بعد برای دیگران. (فتاحی قاضی. بەرگی١ .١١٢)

**چووە بە چەقی لەعنەتا:** برێتی لە یەکێك کە لە قینا کارێك نەکا (خاڵ.١٨١): [کنایه از کسی که از روی لجبازی کاری انجام ندهد].

**چووە پاڵی:** واتە پشتی گرت، لەسەری کردەوە. لایەنگری لێ کرد (جلال محمود. بەرگی١ .١٦٣): [کنایه از او را کمک کرد و طرفداری نمود].

**چووە کەوانی:** [واتە چووە مەیانی و لەگەڵیدا رووبەڕوو بوو]: کنایه از به میدانش رفت و به مقابله‌اش پرداخت. (حیرت.١٨٢)

**چوومتە سەر داری، نایەتە خواری:** [بە یەکێك ئەوترێ کە لە سەر قسەیەك ڕق بگرێ و دەستی لێ هەڵنەگرێ] (خاڵ.١٧٩) کنایه از کسی که از سخنی کینه به دل بگیرد و از آن دست‌بردار نباشد.

**چووگە قەبری باوکیا:** برێتی لە ڕۆیشتن و لە ملمو بوونەوەی یەکێکی شەڕئاشۆ و بی‌حەیا: کنایه از، از بین رفتن فرد آشوبگر.

**چوومە زەوینا:** برێتی لە زۆر خەجاڵەت بوون: کنایه از بسیار شرمنده شدن.

**چوونە بن (ژێر) باڵی کەسێك:** خۆ دانە بەر پەناو پشتیوانی کەسێك: کنایه از در پناه کسی بودن.

**چوونە سەر:** برێتی لە سەرگرتنی کارێك و بڕانەوەی بە ئێجگاری (خاڵ.ف.٣١): [کنایه از انجام گرفتن کاری به تمامی].

**چوونە لا:** برێتی لە دروستبوونی لەگەڵ ژنیا (خاڵ.ف.٣١): [کنایه از همبستر شدن مرد با زنش].

**چەت تێخستن:** برێتی لە کار تێکدان (کارەکەم چەتی تێ کموت): کنایه از چوب لای چرخ گذاشتن. (مەزبر.٢١٤)

**چەترهەڵدان:** برێتی لە خۆ گیڤکردنی بوقەلەموون و تاووس (خاڵ.ف.٣٤): [کنایه از خودآراستن و زیبا نمودن بوقلمون و طاووس].

**چە پۆکە سەرێ دریاگە:** [برێتی لە یەکێك کە لە ژیانی‌دا جەزرە بەو ئازاری زۆری کێشابێ]: کنایه از آدمی که زیاد سختی کشیده باشد. (حیرت.١٨٢)

**چە پاڵە:** برێتی لە زۆر و سزای زۆردار (خاڵ.ف.٣٢): [کنایه از مجازات و ظلم و ستم ظالم].

**چە پەرەنەدان:** برێتی لە وێستانی چەن کەسێکی زۆر بە دەوری شتێکا بە جۆرێك کە وەك تووڵ چەپەر بە تەنشت یەکەوە بن (خاڵ.ف.٣٣): [کنایه از ایستادن تعداد زیادی از مردم به دور چیزی یا کسی].

**چە پەڵی:** برێتی لە بەدفەڕی و بێ ئاکاری: کنایه از رذالت و پستی. (مەزبر.٢١٤)

**چە پگەڕ:** برێتی لە زەمانە: کنایه از زمان. (مەزبر.٢١٣)

**چەپگەرد:** برێتی لە ڕۆژگاری ناهەموار (خال.ف.٣٢): [کنایه از روزگار نامناسب].

**چەپلە قوزێ:** برێتی لە دەرکردنی یەکێك لە شوێنێك بە سووکی و بە قاڵەی دەم (خال.ف.٣٣): [کنایه از بیرون کردنی کسی با بی‌آبرویی و جنجال و هیاهو].

**چەپلە لێکوتان:** برێتی لە بەدناو و ڕسواکردنی یەکێك (خال.ف.٣٢): [کنایه از بدنام و بی‌آبرو کردن شخصی].

**چەرخ لە چەمبەردان:** برێتی لە ئازاردان: کنایه از آزار دادن. (مەزیر.٢١٥)

**چەرخ لە چەمەرکێشان:** بریتی لە بێ دەست کردن و سزادانی یەکێك (خال.ف.٣٤): [کنایه از ناتوان کردن و مجازات کسی].

**چەرختان لە چەمەر ئەکێشم:** [واتە ئاو چاوتان ئەستێنم و هەموتان ژێر دەکەم]: کنایه از آب چشمتان را می‌گیرم و همه را ادب می‌کنم. (حیرت.١٨٣)

**چەرم چاوی ڕەق ئەکەم:** واتە ئەو شتەی نادەمێ و ئەیتەزێنم: کنایه از آن چیز را به او نمی‌دهم حسابش را می‌رسم.

**چەرمەڕەقە** (ئەمومن.١١٥): [برێتی لە یەکێکی لەڕولاواز: کنایه از شخص لاغر و نحیف].

**چەرمەسەری:** [برێتی لە دەرد و ئازار و ڕەنجی زۆر دیین]: کنایه از آزار و رنج دیدن. (حیرت.١٨٣)

**چەرمەسەرێیاندا:** سزایان دا و هێنایان و بردیان و ماندوویان کرد (جلال محمود. بەرگی٢. ٥١): [کنایه از این که او را رنج و آزار و تحت فشار زیاد قرار دادند و خسته کردند].

**چەرمگ خوێندن و ڕەش بە جێ هێشتن:** [بە یەکێکی نەخوێندەوار دەڵێن]: کنایه از شخص بی‌سواد. (حیرت.١٨٣)

**چەرمی ئاوسوو:** [برێتی لە یەکێکی بێ شەرم و ئابڕوو]: کنایه از آدم بی شرم و حیا. (فتاحی قاضی. بەرگی٢. ٨٧)

**چەشتە خورە بووگە:** [واتە دەستهەڵنەگرتن لە شتێ بە هۆی چێژ وەرگرتن لەو شتە]: کنایه از طعمش را چشیده و از آن دست‌بردار نیست. (حیرت.١٨٤)

**چەقۆی بۆ تیژ کردووە:** برێتی لە دەردیسەر بۆ کەسێك دروس کردن و تووشی گێرەوکێشەکردنی: کنایه از دردسر درست کردن و به دام انداختن کسی.

**چەقاڵ و بەقاڵ:** برێتی لە مەردومی هەرزەی بازاڕی (خال.ف.٣٧): [کنایه از مردم بی ارزش بازاری].

**چەکەنەس:** [لە وەڵامدانەوەی نابەجێ ئەڵێن، بۆ وێنە «چەس؟ چەکمەس!» واتە هیچ پەیوەندیەکی بە تۆوە نییە]: کنایه از در پاسخ گفته می‌شود. کنایه از هیچ ربطی به تو ندارد. (حیرت.١٨٤)

**چەکەی ملی دێ:** برێتی لە لەرزینی مل (هەر چەکەی ملی دێت): کنایه از لرزش سر و گردن.

**چەکمەبوون:** برێتی لە زۆر سووتانی شوێنێك لە ئەندام و داماڵینی پێستەکەی (خال.ف.٣٨): [کنایه از سوختن قسمتی زیادی از بدن و کنده شدن پوست آن].

**چەکمەڕەق:** برێتی لە یەکێکی زۆر وێژ (خان، ئاغەی دێهات): کنایه از شخص ظالم و زورگو (خان، آقا، بیگ).

**چەکمەس!:** [لە وەڵامدانەوەی نابەجێ ئەڵێن، بۆ وێنە «چەس؟ چەکمەس!» واتە هیچ پەیوەندیەکی بە تۆوە نییە]: کنایه از در پاسخ گفته می‌شود. کنایه از هیچ ربطی به تو ندارد. (حیرت.١٨٤)

**چەڵتە چەڵت کردن:** [برێتی لە یەکێك کە قسەی بێ‌کەڵك و بێ سوود بکا]: کنایه از حرف بیهوده زدن. (فتاحی قاضی. بەرگی١. ١٢١)

**چەن مەردە هەلاجە:** [واتە: تا چە رادەیەك دەسەڵاتی هەیە و ئەتوانێ کار بکا]: کنایە از تا چە حد قدرت دارد. (حیرت.١٨٥)

**چەناگە درێژ:** برێتی لە چەنەباز (خاڵ.ف.٤٠): [کنایە از وراج و پرگو].

**چەناگە کوتی:** برێتی لە گیاندان (خاڵ.ف.٤٠): [کنایە از جانسپردن].

**چەناکەدان:** برێتی لە زۆر قسە کردن: کنایە از وراج و پرگو.

**چەنەبەچەنەکردن:** برێتی لە شەڕەقسە لەگەڵ یەکێکدا کردن و بەرپەرچدانەوەی قسەی یەکێك (جلال محمود. بەرگی١. ١٦٠): [کنایە از دعوای لفظی با هم کردن و در میان سخن کسی آمدن و با او مقابلە کردن].

**چەوری بەرچاوی گرتووە:** برێتی لە یەکێك کە لە خۆی گۆڕابێت و بایی هوا بوویێت و روو لە خەڵك لادات و چاوی خەڵك نابینێت (جلال محمود. بەرگی١. ١٦١): [کنایە از کسی کە مغرور و متکبر شدە باشد و از مردم روی برگرداند].

**چێخکردن:** برێتی لە وێستانی مەردوم بە گردی شتێکا بە زۆری: کنایە از ایستادن اجباری مردم در اطراف چیزی.

**چێو سوالی ئەداتە دەسمانەوە:** [واتە هەموو شتێکمان ئەفەوتێنێ]: کنایە از ما را ورشکست و بی‌چیز خواهد کرد. (حیرت.١٨٦)

**چێو لە تاریکی ئەکوتی:** برێتی لە، خوڕا قسە ئەکا و ئاگای لە کارەکە نییە (رخزادی.١٥٧): [کنایە از کسی کە ناآگاهانە و بی حساب اقدام بە قضاوت بکند].

**چێوشەقەکەی حەبیب نەجار** (مەمومن.١١٥): [برێتی لە یەکێکی لەڕولاواز: کنایە از شخص لاغر و نحیف].

**چێوکاری کردن:** برێتی لە بە شاخ و باڵیێ کەسێکا هاتن: کنایە از تمجید کردن از کسی.

**چێوی ئەخوەی:** [واتە بە سزای کردارت ئەگەیی بێ خەبەر مەبە]: کنایە از، از مکافات عمل غافل مباش. (حیرت.١٨٧)

**چێوی تیا ناگەڕێ:** [برێتی لە شەڕ و داوا و قەرباڵغی زۆر کە کەس بە کەس نەبێ]: کنایە از جنگ و دعوا و بلوا. (حیرت.١٨٧)

# ح

**حالگیران:** [برێتی لە یەکێکی پەشێو و خەمبار]: کنایە از افسردە و ملول شدن. (فتاحی قاضی. بەرگی ۱. ۱۲٤)

**حاڵی شەڕە:** ١) واتە پەریشانبوون بە هۆی هەژاری، نەخۆشی یان هەر شتێکیتر: ١) [کنایە از پریشانی بە علت فقیری، بیماری، درد شدید یا هر چیز دیگری کە باشد] ٢) لە سەرە مەرگ دایە (جلال محمود. بەرگی ۲. ٥٥): ٢) [در آخرین لحظات مرگش است].

**حاڵی شەقە:** برێتی لە یەکێك کە باری گوزەرانی ژیان و تەندروستی زۆر خراپە. شپرزەیە (جلال محمود. بەرگی ۲. ٥٥): [کنایە از نابسامانی وضعیت زندگی و سلامتی کسی].

**حەزی لە خۆی کردووە:** برێتی لە یەکێك کە زۆر بە خۆیدا بێت و خەریکی خۆی بێت هەمیشە لەبەر ئاوێنە بێت (جلال محمود. بەرگی ۱. ١٦٧): [کنایە از کسی کە بسیار بە خود بپردازد و همیشە جلو آینە مشغول خود باشد].

**حەساو بردن:** برێتی لە ترسیان و بە گوێ یەکێك کردن: کنایە از فرمانبرداری و گوش بە فرمان بودن.

**حەسیرەمەیدان:** برێتی لە دارکاری کردنی یەکێك: کنایە از کتک کاری. (مەژار. ۲۲۹)

**حەچەی ناو ڕانە:** [بە یەکێکی بێ ئاوەز دەڵێن]: کنایە از آدم بی‌شعور. (حیرت. ۱۸۹)

**حەفت ڕۆح:** برێتی لە زیندەوەرێ کە درەنگ گیان بە دەستەوە بدا: کنایە از جاندار سخت‌جان.

**حەفت کەفەنی زەرد کرد:** واتە ترسیا یان لە شەرما تێکچوو: کنایە از ترسید یا خجالت کشید و رنگ بە رنگ شد.

**حەفت مانگە هاتگە دنیا** (ئەمومن. ٥٤): [برێتی لە مرۆڤی پەلە پەل کەر: کنایە از شخص عجول].

**حەفت هۆمەی خەسرەوانی:** [برێتی لە پارەی زۆر و نەخت]: کنایە از نقدینەی بسیار. (حیرت. ۱۹۱)

**حەفتەبیجار:** [برێتی لە تورشیەك کە هەموو شتێکی تێدایە و تایبەتی ناوچەی بیجارە و زۆریش بەتام و چێژە، برێتی لە جلوبەرگێك کە لە چەن ڕەنگ پێکهاتبێ کە تێکەڵاییەکی ناجۆری بێت]: کنایە از نوعی ترشی مخلوط از همە چیز است کە خاص منطقەی بیجار است، کنایە از لباسی کە از چند رنگ درست شدە باشد و ترکیبی ناخوشایند داشتە باشد. (حیرت. ۱۹۱)

**حەفتی بمرێ لە باوان/ کلە نابرێ لە چاوان:** [برێتی لە ژنێکی دڵتەڕ و هەوەسباز کە بۆ هیچکەس پەکی نەکەوێ]: کنایە از زن هوسران و خوشگذران. (حیرت. ۱۹۱)

**حەفتی ها لە گەرمو هەشتا** (ئەمومن. ٥٤): [کنایە از شخص فقیر].

**حەفی ها لە سکیا** (ئەمومن. ٥٤): [برێتی لە مرۆڤی فرەخۆر: کنایە از شخص پرخور].

**حەقی نیا ژێر پا:** [برێتی لە یەکێك کە ڕاس بە درۆ بخاتەوە]: انکار حقیقت کرد. (حیرت. ۱۹۲)

**حەکایەتی بۆ ئەکا:** دەیەوێت بیخافڵێنێ: کنایە از این کە می‌خواهد فریبش دهد.

**حەڵاڵ زادە:** برێتی لە مرۆڤی زۆر بە پیاوەتی و دەمار و ڕاستگۆ: کنایە از آدم جوانمرد و درستکار. (مەژار. ۹۸٤)

**حەڵاڵ:** برێتی لە ژنی ڕەوا و شەرعی: (هەڵاڵ خۆمە): کنایە از همسر. (مەژار. ۹۸٤)

**حەڵقە بە گوێ:** برێتی لە بەندە: کنایە از غلام و بردە.

**حەمامی ژنان:** [برێتی لە جێگەیەکی پڕ لە هەراو جەنجاڵ]: کنایه از جای شلوغ و پر سر و صدا. (فتاحی قاضی. بەرگی١. ٢٥)

**حەمە حەفت کڵاو:** برێتی لە یەکێکی فێڵباز و کەڵەکباز: کنایه از آدم شیّاد و مکار.

**حەمەرەمزێ:** [برێتی لە شەڕە قسە و دەمەقرێ کردن]: کنایه از دعوای لفظی. (حیرت.١٩٣)

**حەمەکەی لچ چەمەکە** (ئەمومن.١٩): [برێتی لە کەسێك کە لە گشت کارێکا دوودڵی ئەکا و بە عەینەکی بەدبینیەوە تواشای ژیان دەکات: کنایه از شخص مردد و شکاك که با عینك بدبینی به زندگی می‌نگرد].

**حەوت پاوشای لە خەوا دیوە:** برێتی لە یەکێك کە زۆر بخەوێ و خەوی خۆشی ببینێ: کنایه از فرو رفتن به خواب عمیق و خوابهای خوش دیدن.

**حەوت گیانی هەس:** برێتی لە یەکێکی گیانسەخت کە دێر گیان بە دەستەوە بدات: کنایه از سخت جان بودن، کسی که به راحتی نمی‌میرد.

**حەوت کونای هەیە:** برێتی لە جێگایەکی نهێنی کە دوور بێ لە مەترسی: کنایه از مخفیگاه دور از خطر.

**حەوزەکە ئاوی هاتێیا:** [لە وەڵامی لەچەر و ئێرەیبەردا ئەڵێن، واتە: زۆر قینت دێ قنگ بخە ناو ئاوی ساردی حەوزەك]: در پاسخ حسود گفته می‌شود، اگر زیاد ناراحتی باسنت را در آب سرد بگذار. (حیرت.١٩٤)

**حەوشەکەی خوارە (لارە):** بە تەوسەوە دەوترێت، واتە بیانووەکەی نابەجێیە (جلال محمود. بەرگی١. ١٦٨): [از روی طعنه به کسی گفته می‌شود، که بهانه‌ای نابجا بگیرد].

**حەوێنجی:** برێتی لە گون: کنایه از بیضه. (مەزهەر.٢٢٢)

**حەیا باری کردوووە:** واتە بەرەڵایی و بێشەرمییێکە کە ئەو سەری دیار نەبێت، لە کاتێکدا ئەمە دەوترێت کە شتێکی نابەجێ و شەرمنانە بکرێت (جلال محمود. بەرگی١. ١٦٨): [کنایه از بی بند و بار و بی‌شرمی بیش از اندازه در مواقعی گفته می‌شود که حادثه و رویدادی ننگین رخ دهد].

**حەیای پێوە نەماگە:** [واتە شەرم ناکا و ڕووی داماڵیاگە]: کنایه از کسی شرم و حیایش از بین رفته. (حیرت.١٩٥)

**حەیای داماڵیاگە:** [برێتی لە یەکێکی بێ شەرم و بەرەڵا]: کنایه از آدم بی‌حیا و افسار گسیخته. (حیرت.١٩٥)

**حەیچە حەیچ کەر:** [برێتی لە یەکێکی بێشەرم و وڕێنەکەر]: کنایه از آدم گستاخ و یاوه گو. (حیرت.١٩٥)

**حکایەتم بۆ ئەکا:** خەڵافاندن: کنایه از مرا سرگرم می‌کند و فریبم می‌دهد. (حیرت.١٩٢)

**حول حولی مەزەب:** [برێتی لە یەکێك کە بیر و بڕوای دروسی نییە]: کنایه از کسی که عقیده درستی ندارد و بر عقیده‌ی ثابتی نیست. (فتاحی قاضی. بەرگی١. ١٢٥)

**حولی:** برێتی لە زمان لوس و هەڵخەڵەتێن: کنایه از چرب‌زبان. (مەزهەر.٢٢٧)

**حیزەی کردگە:** [کەوتووەتە تەقەفێڕکە و زووزوو ئەچێ بۆ کناراو]: کنایه از اسهال. (حیرت.١٩٥)

**حیزی حیزانگاو:** برێتی لە کەسێك لە بەردەستی حیزیشا زەبوون بێ (خاڵ.ف.٥٦): [کسی که در زیر دست زبون هم زبون باشد].

# خ

**خاس چاو بکەرەوە:** [واتە لە ئیش و کارا وردبین بە]: کنایه در کار کردن دقیق باش. (حیرت.١٩٦)

**خاس لە ئاو دەرهات:** [بریتی لە یەکێکی شیاو و لێهاتوو، بریتی لە شتێکی پەسەندکراو و تاقیکراو]: ١) کنایه از آدم لایق. ٢) کنایه از چیز دلپسند و آزمایش شده. (حیرت.١٩٦)

**خاك بە توورەکە کێشان:** بریتی لە وێرانکردنی و لە بەینبردن شتێك یا شوێنێك (خال.ف.٥٨): [کنایه از ویران کردن جایی].

**خاك مردگ لێ پاشین:** بریتی لە کەسێکی بێدەنگ و هێمن: کنایه از آدم ساکت و آرام.

**خاکسار:** بریتی لە مەردومی هەژاری بێ نەوا (خال.ف.٥٨): [کنایه از مردم فقیر و بینوا].

**خاکی:** بریتی لە مەردومی بێ فیز و دەمار (خال.ف.٥٩): [کنایه از شخص فروتن و متواضع].

**خامە هێشتا:** بریتی لە یەکێك کە لە ژیان شارەزا نەبێت و چەرمەسەرێی ژیانی نەدیبێت و ساویلکە بێت (جلال محمود. بەرگی١. ١٧١): [کنایه از آدم سادەلوح و نادان].

**خانەگومان:** بریتی لە ژن و پیاوێك کە لە یەك دوودڵ و بەشك بن، دڵپیس: کنایه از زن و شوهری که به هم بدگمان و ظنین باشند. (حیرت.٢٠٠/ خال.ف.٦١)

**خاو و خلیچك:** بریتی لە یەکێکی سست و دەستەپاچەیە (جلال محمود. بەرگی١. ١٧٢): [کنایه از آدم سست و سراسیمه].

**خاوبووەوە:** واتە ساردو هێمن بووەوە. تووڕەییەکەی نیشتەوە (جلال محمود. بەرگی١. ١٧٢): [کنایه از کسی که آرام شده باشد و خشمش فرو نشسته باشد].

**خاوەن سایەیە:** خێرخوازە. خەڵك لە پاڵیدا دەحەوێتەوە (جلال محمود. بەرگی٢. ٥٧): [کنایه از آدم خیرخواه که مردم در پناه او آسایش دارند].

**خاوەنی قسە خۆی نییە:** درۆزنە، دەمدەمییە: کنایه از آدم دروغگو و متردد.

**خاوەنی قسەی خۆیەتی:** ڕاستگۆیە. گفت و بەڵێنی دا دەیباتە سەر هەقەوە: کنایه از آدم راستگو به عهد و پیمان.

**خاوەی پێ کرد:** واتە دیقداری مرد، هێلکەی پێ کرد (جلال محمود. بەرگی٢. ٥٧): [کنایه از غم و غصەی زیادی به او داد].

**خایەومایە:** بریتی لە سەروماڵ (خال.ف.٦٢): [کنایه از همه چیز].

**خپکردن:** بریتی لە کوشتن، دارێکم کێشا بە مارەکەدا (خپم کرد) (خال.ف.٦٣): [کنایه از کشتن].

**خزمەتی داری پەڵگ دەکا:** واتە خۆ بە شتی بێ کەڵك خەریك کردن (شێخەڵا.٤٥): [کنایه از خود را به چیز بیهوده مشغول کردن].

**خستنە شۆن کەسێك:** بریتی لە هەوڵ بۆ بێئابڕوو کردنی کەسێك: کنایه از تلاش برای بی‌آبرو کردن کسی.

**خستنە شۆن کەسێك:** هەوڵ بۆ بێئابڕووکردنی کەسێك: کنایه از تلاش برای بی‌آبرو کردن کسی.

**خستیە پشت گوێ:** لە بیر خۆی بردەوە، بەتەنگیەوە نەهات و پشتی تێ کرد (جلال محمود. بەرگی٢. ٥٨): [کنایه از فراموشش کرد، به یاریش نیامد و حمایتش نکرد].

**خستیە ژێر باڵی خۆی:** هەتیوەکانی خستە ژێر باڵی

خۆی چەند خێزانی خستۆتە ژێر باڵی خۆی. واتە دەیانژینێت، بە تەنگیانەوە دێت و کەموکوڕیان ناهێڵێ (جلال محمود. بەرگی۲. ٥٩): [کنایە از کسی کە چند نفر را تحت سرپرستی خویش درآوردە و مخارج زندگی آنها را تأمین می کند].

**خستیە سەر ڕێ:** ١) فێری کرد: ١) [کنایە از آموزشش داد] ٢) گومڕا بوو، هەڵەکانی خستە بەرچاوی و ڕانومایی کرد ڕاستی کردەوە، لە خراپە دووری خستەوە (جلال محمود. بەرگی۱. ١٧٨): ٢) [کنایە از گمراه شد، اشتباهاتش را بە او نشان داد و راهنمایش کرد، او را بە راە راست راهنمایی کرد].

**خشت مەردم مەشکێنە:** [واتە کردەوەی کەسانیتر مەفەوتێنە]: کنایە از دسترنج دیگران را تباە مکن. (حیرت.۲۰۱)

**خشکەی هەیە:** واتە کەموکوڕی هەیە (شێخەڵۆ.٤٥): [کنایە از ناتمامی و نقص داشتن].

**خنجەرەکەی ڕۆژی تەنگ:** برێتی لە یەکێك لە کاتی پێویستا لە شتێك کەڵك وەرنەگرێ: کنایە از شخصی کە در مواقع لازم و ضروری از چیزی بهرە نگیرد.

**خوا بە سەرەوە بەزموییەدا بدات:** سەرنگرێ و سەرنگوونی بکات و سەری نەخات (جلال محمود. بەرگی۲. ٦١): [کنایە از این کە خداوند او را سرنگون سازد و پیروزش نگرداند].

**خوا پێ بە مار نەدات:** برێتی لە یەکێکی زۆر خراپ، واتە: خوا دەستی پێ نەدات، ئەگینا بەدکارییەکەی لە ئەندازە بە دەر دەبێت (جلال محمود. بەرگی۱. ١٧٩): [کنایە از آدم شرور بدکار، خداوند توانایی بە او ندهد، وگرنە بدیش بیش از اندازە خواهد شد].

**خوا پێ داون:** [برێتی لە یەکێك کە گەیشتبێتە ئەو پەڕی بەختەوەری]: کنایە از کسی کە بە انتهای سعادت و خوشبختی رسیدە باشد. (فتاحی قاضی. بەرگی۲. ١٠٢)

**خوا ڕۆژ نیشانی ماری سڕ نەدات:** خوا ڕۆژ لە زۆرداری بارکەوتوو نەکاتەوە و دەسەڵاتی نەبێت ئەگینا دەورووپشتی بەدبەخت و پەرێشان دەکات (جلال محمود. بەرگی۱. ١٧٩): [کنایە از خداوند بە ظالم بدبخت و شکست‌خوردە قدرت ندهد وگرنە اطرافیانش را آزار خواهد داد].

**خوا ڕاگیری بکات:** هەمیشە سەرکەوتوو و بەهێز و بەتوانا بێت (جلال محمود. بەرگی۲. ٦١): [کنایە از کسی کە همیشە پیروز و توانا باشد].

**خوا گەورەس:** [واتە هیوادار بوون]: کنایە از امیدوار بودن. (حیرت.۲۱۳)

**خوا و پێغەمبەری هێنایە تکا:** سوێندێکی زۆری دا و تکایەکی زۆری لێ کرد. پاڕایەوە: کنایە از این کە او را بسیار سوگند داد و خواهش و التماس بسیاری از او کرد.

**خۆ بە ئاودا دان:** ئەنجام دانی کارێکی دژوار و نەپرینگانەوە لە هیچ مەترسییەك: کنایە از انجام کاری و توجە نکردن بە هیچ خطری.

**خۆ بەردان:** ١) برێتی لە دەس بڵاوی و ماڵ بە فێڕودان: ١) کنایە از اسراف و ولخرجی ٢) برێتی لە زیادە خەرج کردنێك کە لەوەپێش نەتکردبێ: ١) کنایە از اسراف زیاد کە قبلاً سابقە آن را نداشتەاید. (هەژار.٢٤٩)/(خاڵ.ف.٧٢)

**خۆ بردنە پێشەوە:** برێتی لە خۆشەویست کردن بە کردن یان وتنی شتێك بە دڵی یەکێك (خاڵ.ف.٧٢): [کنایە از خود را مطرح کردن و جلو بردن].

**خۆ بڕین:** برێتی لە، لە خۆدان (خاڵ.ف.٧٢): [کنایە از بە

خود زدن].

**خۆ تێگرتن:** برێتی لە خۆهاوێشتنە شتێکەوە بۆ پچڕینی سوودێك (خال.ف.۷۳): [کنایە از همراهی یا شریکی کردن با کسی برای بە دست آوردن بهرە و سودی].

**خۆ خواردنەوە:** برێتی لە پێش خواردنەوە لە خەم و خەفەتان: کنایە از نفس حبس کردن از خشم و غم و غصە. (هەژار.۲۵۰)

**خۆ خوراندن:** برێتی لە خۆ ئامادەکردن بۆ بەخشینی شتێك (خال.ف.۷۳): [کنایە از آمادگی برای بخشیدن چیزی بە دیگران].

**خۆ داکوتان:** برێتی لە خۆدامەزراندن (خال.ف.۷۳): [کنایە از جایگیر شدن و ماندن در جایی].

**خۆ شیرین کردن:** برێتی لە وتن و کردنی شتێك لای یەکێك بە ڕەنگێك کە پێی بچێتە پێشەوە (خال.ف.۷۹): [کنایە از خود شیرینی].

**خۆ کوشتن:** برێتی لە: لەخۆ دان (خال.ف.۷۹): [کنایە از خودزنی].

**خۆ لێ خۆش کردن:** برێتی لە یەکێك کە چاوی بە دوای شتێکەوە بێت و ئارەزووی داگیرکردنی بکات: کنایە از کسی کە چشمش بە دنبال چیزی باشد و آرزوی غصب کردن آن را داشتە باشد.

**خۆ نواندن:** برێتی لە خۆ دەرخستنی مەردوم بە کردنی شتی باش (خال.ف.۸۲): [کنایە از آشکار و مشهور شدن کسی بە انجام دادن کاری نیک].

**خۆ هەڵتراندن:** برێتی لە خۆهەڵکێشانی یەکێك بۆ شتێك کە لێی نەوەشێتەوە (خال.ف.۸۳): [کنایە از بلوف زدن].

**خۆ هەڵکێشان:** برێتی لە مەدح کردنی یەکێك بۆ خۆی (خال.ف.۸۳): [کنایە از خودستایی].

**خۆخۆر:** برێتی لە کەسێك کە زیانی بۆ ناوخۆ ببێ (خال.ف.۷۳): [کنایە از کسی کە برای نزدیکانش ضرر داشتە باشد].

**خۆدانان:** برێتی لە سەر بەخت کردن لە کارێکا (خال.ف.۷۴): [کنایە از جانباختن در راه عقیدە یا کاری].

**خۆرمتاو لێ کەلکە پاسارە:** برێتی لە پیری پەککەوتوو کە مردنی نزیکە: کنایە از پیر ناتوان کە مرگش نزدیک است.

**خۆش سەندن:** برێتی لە گەرمبوونی کۆڕی بەزم و مۆسیقا: کنایە از گرم شدن مجلس رامشگران. (هەژار.۱۸۷)

**خۆش گلەیی:** برێتی لە یەکێك کە زوو تووڕە بێت: کنایە از انسان زودرنج.

**خۆشەبوون:** برێتی لە دەرهاتن و قاڵبوونی کەسێك لە فرمانێکا (خال.ف.۷۸): [کنایە از شخص باتجربە و کارآزمودە].

**خۆشەچین:** برێتی لە یەکێك کە لە یەکێکیترەوە بەهرەمەندبێ (من (خۆشەچین)ی زانینی تۆم) (خال.ف.۷۸): [کنایە از کسی کە از دیگری بهرە و سود بگیرد، خوشەچین].

**خۆشەکردن:** برێتی لە قاڵکردن و پوختەکردنی یەکێك لە فرمانێکا (خال.ف.۷۹): [کنایە از کارآزمودە و با تجربە کردن کسی در کاری].

**خۆشی داگیە لە دڵی:** واتە لەقە ئەدا لە بەختی خۆی و چارەی خۆی ڕەش دەکات: کنایە از لگد بە بخت خود می‌زند.

**خۆم شێوان:** کنایە از انتشار و شنیدن دروغی کە بە دور از عقل و اندیشە باشد.

**خۆمانە خۆمانە:** برێتی لە ماڵ جیایی کردنی یەکێك لە گەڵ یەکێکی تردا (خاڵ.ف.٨١): [کنایه از جدا شدن دو نفر از همدیگر].

**خۆمی لێ شێواوە:** سەرگەردان بووە، دنیای لێ تێك چووە (جلال محمود. بەرگی٢. ٦١): [کنایه از کسی که سرگردان و آشفته شده باشد].

**خۆناسین:** برێتی لە ناسینی مەردوم بە ئەندازە و پایەی خۆی (خاڵ.ف.٨١): [کنایه از شناختن مردم در حد و اندازەی خویش].

**خۆی (کەر) گێل کرد:** ١) برێتی لە یەکێك کە بانگی بکەن، پرسیاری لێ بکەن وەڵام نەداتەوە: ١) [کنایه از کسی که خود را به غفلت بزند].٢) کردەوەیەکی نابەجێ یان ناشیرین بکات (جلال محمود. بەرگی٢. ١٨٦): ٢) [کنایه از کسی که رفتار نامناسب و زشت انجام دهد].

**خۆی بە ئاو و ئاگردا ئەدات:** خۆی ئەخاتە نێو ڕەنج و ئازار: کنایه از خود را به زحمت و سختی انداختن.

**خۆی بە دار و بەردیدا دەدا:** ١) خەریکی ماڵی دنیایە: ١) [کنایه از مشغول مال دنیاست] ٢) گینگڵ دەدات و دەگری سا بۆ هەر شتێك بێت بەتایبەتی منداڵ وا دەکا (جلال محمود. بەرگی٢. ٦٢): ٢) [کنایه از تلاش می‌کند و می‌گرید برای هر چیزی که باشد مخصوصاً بچه بیشتر این گونه است].

**خۆی بە زەویدا دا:** ١) نووست: کنایه از خوابید ٢) مانگرتن: کنایه از اعتصاب کردن.

**خۆی بە سەریدا ساخ کردەوە:** ١) خوێنی خۆی کردە ئەستۆی ئەو: ١) کنایه از خون خویش را به عهدەی او گذاشت ٢) بە ئافرەتێك دەڵێن کە خۆی بکاتە ملی پیاوێك و ناچاری بکات بیهێنێت: ٢) کنایه از زنی که خود را به زور گردن کسی بکند و ناچارش کند که او را بگیرد.

**خۆی بە کەس ناگۆڕێتەوە:** برێتی لە یەکێك کە خۆی لە گشت کەسێ بەتواناتر، جوانتر و تەواوتر دەزانێت (جلال محمود. بەرگی١. ١٨٣): [کنایه از کسی که خود را از همه برتر و تواناتر ببیند].

**خۆی بە مەڵەوانی شەت دەزانێ:** خۆی زۆر لا بە شیاو و توانا دەزانێت. کارێك کە بە دەستی خەڵك نەکرێت، بە دەستی ئەم دەکرێت (جلال محمود. بەرگی٢. ٦٢): [کنایه از کسی که خود را شایسته و توانا می‌داند و کاری که با دست مردم انجام نمی‌گیرد، به دست او انجام خواهد گرفت].

**خۆی بە ملیەوە کرد:** واتە خۆی بەسەریدا سەپاند، بە ئافرەتێك دەڵێن کە بە فێڵ خۆ بداتە شوو، لاسی بدات کە بیهێنێت (جلال محمود. بەرگی٢. ٦٣): [کنایه از زنی که با فریب و اجبار خود را شوهر دهد].

**خۆی بەرداوە:** بە تەوس یان گاڵتەوە بە کەسێك دەڵێن کە پارەی چاك ببەخشێت لە کاتێکدا چاوەڕێی ئەوەی لێ نەکرابێت و سروشتی وەها نەبێت (جلال محمود. بەرگی٢. ٦٢): [برای طعنه و شوخی به کسی گفته می‌شود که پول خوب ببخشد در حالی که این انتظار از او نمی‌رفت و خوی و خصلتش این گونه باشد].

**خۆی بردە پێشەوە:** خۆی خۆشەویست کرد، وەکوو دۆستێك خۆی نزیك کردەوە (جلال محمود. بەرگی١. ١٨٢): [کنایه از کسی که طرح دوستی ریخت و خود را نزدیک نمود].

**خۆی بێتام کردووە:** ڕەزا و ئێسکی خۆی لای خەڵك قورس و تاڵ کردووە (جلال محمود. بەرگی٢. ٦٢): [کنایه از کسی که سیما و قوارەی خود را پیش مردم عبوس و دوست نداشتنی کرده است].

**خۆی تاڵ کردووە:** برێتی لە یەکێك کە بە هۆی کردەوەی خراپی، خەڵك خۆشی ناوێت (جلال محمود. بەرگی١. ١٨٤): [کنایه از کسی که به علت اعمال بدش چهرەی خود را نزد مردم بد کرده باشد].

**خۆی تێ وشاند:** برێتی لە بەرتیلدان، پارەی دا بۆ رزگاربوونی لە گرفتارییەکدا. یان جێبەجێ کردنی کارێك بە رێگەیەکی نهێنی و نائاسایی (جلال محمود. بەرگی١. ١٨٤): [کنایه از رشوه دادن تا این که از گرفتاری نجات پیدا کند، انجام دادن کاری به طور مخفیانه و غیرعادی].

**خۆی تێ هەڵسوو:** لێی نزیك بووەوە، خۆی کرد بە دۆستی و مەرایی بۆ کرد (جلال محمود. بەرگی١. ١٨٤): [کنایه از به او نزدیک شد و خود را دوست او نشان داد و چاپلوسی کرد].

**خۆی پیس کردووە:** ١) خۆی بەدناو کردووە و سووك و ریسوای ناو خەڵك بووە: ١) [کنایه از کسی که خود را پیش مردم بی‌آبرو کرده است] ٢) تێشکاوە. بە گاڵتەوە دەوترێت: ٢) [شکست خورد، به عنوان مسخره و تشر گفته می‌شود] ٣) زۆر ترساوە (جلال محمود. بەرگی٢. ٦٢): ٣) [بسیار ترسیده است].

**خۆی خواردەوە:** داخەکەی پەچنییەوە دڵیەوە پیشی خواردەوە قسەی نەکرد (جلال محمود. بەرگی١. ١٨٤): [کنایه از کسی که دلش انباشته از غم و غصه باشد و بغض کرده باشد].

**خۆی خوراند:** پارەی دا، سا شاباش بێت یان بەرتیل یان یارمەتی و یان... (جلال محمود. بەرگی٢. ٦٣): [کنایه از این که پول داد چه بعنوان شادباش باشد یا رشوه، یا کمک کردن یا ... ].

**خۆی داکوتا:** خۆی دامەرزاند، جێی بۆ خۆی کردەوە و لە نان خواردنا، لە شاییدا یان ... (جلال محمود. بەرگی١. ١٨٥): [کنایه از کسی که خود را جایگیر و تثبیت کرده باشد چه برای غذا خوردن یا مجلس شادی یا...].

**خۆی دانا:** خۆی فەوتاند، خۆی بە کوشتندا (جلال محمود. بەرگی٢. ١٨٥): [کنایه از کسی که خود را به کشتن بدهد].

**خۆی داوە لە گوڵ هەناری:** برێتی لە یەکێك کە بە جل و بەرگی جوان خۆی رازاندبێتەوە: کنایه از کسی که خود را آراسته و جامەی نو و تمیز پوشیده باشد.

**خۆی رشتووە:** بە ئافرەتێکی خرِوخۆڵ و جوانکیلە دەڵێن کە پێگەیشتبێ (معروف.٤٤): [کنایه از دختر زیبا و دلپسندی که تازه به سن جوانی رسیده باشد].

**خۆی کرد بە رێوی تۆپیو:** لە رووی سووکییەوە بە یەکێك دەوترێت کە بە فێڵ و فرِ خۆی نەخۆش خستبێت و لێی کەوتبێت (جلال محمود. بەرگی٢. ٦٣): [کنایه از کسی که از روی بی‌آبرویی و با حیله و نیرنگ خود را به مریضی زده باشد].

**خۆی کێشایەوە:** واتە مرد (جلال محمود. بەرگی٢. ٦٢): [کنایه از مردن].

**خۆی لە قەرەی نادا:** واتە ئەترسێ لێ و حیسابی لێ ئەبات: کنایه از، از او می‌ترسد و حساب می‌برد.

**خۆی لێ کردووین بە هەناری شیرین:** برێتی لە یەکێك کە بە زۆر خۆی خۆشەویست کردووە. (جلال محمود. بەرگی٢. ١٨٧)

**خۆی نیاگە بان لیفە:** خۆی بۆ کارێکی گەورە ئامادە کردووە (جلال محمود. بەرگی٢. ٦٢): [کنایه از این که خودش را برای کار بزرگی آماده کرده است].

**خۆی هەڵخراند:** برێتی لە یەکێك کە خۆی بۆ کارێك ئامادە کا، چووە پێشەوە و خۆی نواند (جلال محمود.

بەرگی ۱. ۱۸۸): [کنایه از کسی که خود را برای کاری آماده کند].

**خۆی یەك چاوه کردووه:** کارەکانی تری واز لێ هێناوه و خۆی بو یەك کار و یەك ئامانج تەرخان کرد (جلال محمود. بەرگی ۲. ٦۳): [کنایه از کسی که کارهای دیگرش را رها کرد و وقت خود را به یک کار یا هدفی اختصاص داد].

**خۆت فێر مەکە:** [واته خۆ گرتن به شتێ]: کنایه از عادت مده. (حیرت.۲۱٦)

**خۆت هەڵمەکێشه:** [برێتی له کەسێك له خۆی تاریف ئەکات خۆ به زلزانه]: کنایه از خود تعریف کردن . (حیرت.۲۱۷)

**خۆتی بۆ شل مەکە:** [واته له بەرانبەری ناخۆشی و هەر تەنگوچەڵەمەیەکدا خۆڕاگر به و سەر دامەنوێنه]: کنایه از مقاومت و تسلیم‌ناپذیری. (حیرت.۲۱۷)

**خۆتی تێ مەگەیەنه:** واته لەبەر چاوی مەگرە و وای دابنه که هەر نەتدیوه: کنایه از نادیده بگیر.

**خودا لێی گۆڕیوه:** [برێتی له یەکێك که ڕەفتار و ئاکاری به پێچەوانەی ڕاستی و خێر بێت]: کنایه از کسی که رفتارش خلاف مصلحت و عقل و منطق باشد. (فتاحی قاضی. بەرگی ۲. ۱۰۲)

**خورپه کەفته دڵم:** [برێتی دڵەڕاوکێ و نیگەرانی]: کنایه از اضطراب و نگرانی. (حیرت.۲۰۳)

**خۆری گەییگە خۆراوا:** [واته پیروپەك‌کەوته بووه]: کنایه از پیر و فرتوت شده. (حیرت.۲۱۸)

**خوسرەوی خاوەر:** برێتی له خۆر: کنایه از آفتاب.

**خوم شێویاگه:** [برێتی له بارودۆخی ئاڵۆز و شپرزەیه]: کنایه از اوضاع آشفته. (حیرت.۲۰٤)

خوویسان: برێتی له دڵ نەرم بوونی کەسێك بەرامبەر به یەکێك بۆ شتێك (خاڵ.ف.۸۲): [کنایه از راضی شدن].

**خۆی ئەپژنی له برینیا:** واته ئێش و ئازاری کەسێك به قسەیەك یان کردوەیەك تازه بکەیتەوە: درد کسی را با سخنی و عملی تازه کردن.

**خۆی ئەدا به ئاو و ئاگرا:** [برێتی له مرۆڤی بوێر و تێکۆشەر له هەر بوارێکدا، برێتی له یەکێکی که هەوڵ و تەقالا بدا بۆ ژیان]: کنایه از آدم شجاع و تلاشگر در هر زمینه‌ای. (حیرت.۲۲۰)

**خۆی داوه له دەق:** [واته خۆی ڕازاندووەتەوە]: کنایه از خود را مرتب و آراسته کرده. (حیرت.۲۲۰)

**خۆی چەپەڵ کرد:** [واته ترسیا]: کنایه از ترسید. (حیرت.۲۲۰)

**خۆی کێشاوه:** [برێتی له مردن]: کنایه از مردن. (حیرت.۲۲۱)

**خۆی نیاگه بان لێفەوه:** [برێتی له یەکێك که خۆی بۆ دەزگیرانی تر ئامادە کردووه]: کنایه از کسی که خود را برای نامزدی کسی آماده کرده باشد. (حیرت.۲۲۲)

**خۆی نیاگه ڕێگەی من:** واته خۆی کردووه قوربانی من: کنایه از کسی که جان خود را در راه من نهاده است.

**خوێدار:** برێتی له شتی جوانی دڵچەسپ (خاڵ.ف.۸۳): [کنایه از چیز جوان دلفریب].

**خوێن ئەهات سەری ئەبرد:** برێتی له کوشتوکوشتاری زۆر: کنایه از کشت و کشتار بسیار.

**خوێن بەرچاوی گرتووه:** برێتی له زۆر تووڕەبوونی یەکێك که لەوانەیه دەست به کوشتنی یەکێکەوه بدا: کنایه از بسیار خشمگین بودن کسی به حدّی که ممکن است دست به جنایت بزند.

**خوێن تاڵه:** [برێتی له یەکێکی ڕەزاگران و ئێسك قورس]: کنایه از گرانجان و بداخم. (حیرت.۲۲۳)

**خوێن جمان:** برێتی له تووڕەبوون، وەرزی بەهار: کنایه

از عصبانی شدن، فصل بهار. (مەژار.٢٦٠)

**خوێن خۆی لە خوا سەند:** [بە یەکێك دەڵێن کە زۆر بگیرێ]: کنایه از گریه و زاری زیاد. (حیرت.٢٢٣)

**خوێن ڕژاندن:** برێتی لە پیاو کوشتن: کنایه از آدم کشی. (مەژار.٢٦٠)

**خوێن ڕێژ:** برێتی لە بکوژ: کنایه از قاتل.

**خوێن گرتی:** چاوی بە خوێنەکە کەوت و حەپەسا، سام گرتی و قەڵەمەی ئەژنۆی شکا، نەیتوانی بڕوات، وڕەی بەردا (جلال محمود. بەرگی١. ١٨٩): [کنایه از کسی که چشمش به خون کسی بیفتد بترسد و روحیه و توان خویش را از دست بدهد].

**خوێن کردنە کاسەوە:** برێتی لە سزا دان و زۆر بۆ هێنان (خال.ف.٢٦): [کنایه از اذیت و آزار کسی].

**خوێن لە جەستەیدا نەماوە:** ١) لاواز و بێهێز بووە: ١) [کنایه از لاغر و ناتوان] ٢) واتە ترساوە (جلال محمود. بەرگی١. ١٩٠): ٢) [کنایه از ترسیده است].

**خوێن لە دڵی دەتکێت:** داخێکی زۆری هەیە، بە هۆی ڕووداوێك یان هەر شتێکیتر. مەراق کوشتوویەتی (جلال محمود. بەرگی١. ١٩٠): [کنایه از کسی که غم و غصەی بسیاری دارد، به علت حادثه، رویداد یا هر چیز دیگر].

**خوێنتاڵ:** برێتی لە مەردومی ئێسکقورس (خال.ف.٨٤): [کنایه از بداخم].

**خوێنخوار:** برێتی لە دوژمنێکی وا کە بە خوێنی سەرت تینوو بێ، ستەمکار (خال.ف.٨٤): [کنایه از دشمنی که به خونت تشنه باشد، ستمکار].

**خوێنڕژتن:** برێتی لە خوێنڕژانن: کنایه از آدم کشی. (مەژار.٢٦٠)

**خوێنسارد:** برێتی لە یەکێك کە درەنگ ڕقی هەستێ: کنایه از آدم صبور و پرتحمل که دیر عصبانی شود، خونسرد. (مەژار.٨٥)

**خوێنشیرین:** برێتی لە مەردومی ئێسکسووك (خال.ف.٨٥): [کنایه از سبک روح و دوست داشتنی].

**خوێنگەرم:** برێتی لە خوێن شیرین (خال.ف.٨٥): [کنایه از سبک روح بودن].

**خوێنگەرمی:** برێتی لە خوێن شیرینی (خال.ف.٨٥): [کنایه از آدم تو دل برو].

**خوێنکردن:** برێتی لە کوشتنی مەردوم (خال.ف.٨٥): [کنایه از کشتن مردم].

**خوێنکردنە کاسە:** برێتی لە ڕەشکردنی یەکێك لای یەکێکی تر بە جۆرێکی زۆر خراپ (خال.ف.٨٥): [کنایه از بدگویی کردن از کسی پیش شخص دیگر].

**خوێنکوژاندنەوە:** برێتی لە ئاشتی خستنە ناو کۆمەڵێکی تۆڵەسێن و خوێنخوار (خال.ف.٨٥): [کنایه از صلح و آشتی دو خون خواه].

**خوێنمژ:** لە زۆرداری و ستەمکاری (خال.ف.٨٥): [کنایه از خونخواری و ظالمی].

**خوێنمژە:** خەڵك دەچەوسێنێتەوە و ڕەنجی ئەم و ئەو بۆ خۆی دەبات و ستەمکارە، وەك زەروو وایە (جلال محمود. بەرگی١. ١٨٨): [کنایه از شخص ظالم و خونخوار همچون زالو که از دسترنج دیگران استفاده می‌کند].

**خوێنی ئەکا شیشە:** برێتی لە گران فرۆشی و باج زۆر سەندن: کنایه از گران فروختن، خراج بسیار گرفتن.

**خوێنی پێ دەکوژێتەوە:** برێتی لە مرۆڤێکی ژیر و بەڕێز و بەتوانایە و لە ناو کۆمەڵدا پایەدارە و ڕێز و خۆشەویستی هەیە و قسەی ڕەوایە: کنایه از آدم عاقل و مورد اعتماد و با نفوذ در جامعه.

**خوێنی دڵ خواردن:** ڕەنج و ئازاری زۆر کێشان: کنایه از

رنج و مشقت بسيار بر خود هموار كردن.

**خوێنی کردە کاسەوە:** واتە زۆر قسەی خراپی لەبارەیەوە کرد (خال.٢٠٣): [كنايه از پشت سر كسى بدگويى كردن].

**خەت و خاڵی ڕشتووە:** بریتی لە کچێك کە خۆی خەملاندووە و جوان بووە، وەك چۆن بەچکەی هەندێك باڵندە کە گەورە دەبێت و خاڵ و میلی لێ پەیدا دەبێت (جلال محمود. بەرگی١. ١٧١): [كنايه از دخترى نوجوان كه چشمانش را سرمه كشيده و خود را آراسته و زيبا نموده است].

**خەتدان:** بریتی لە دەرهاتنی مووی ریش و سمێڵ (خال.ف.٨٦): [كنايه از برآمدن موى ريش و سبيل بر صورت نوجوان].

**خەتی بۆ کێشا:** واتە ڕەنگی بۆ ڕشت، ڕاوێژی بۆ کرد کە بەو جۆرە بکات (جلال محمود. بەرگی١. ١٧٣): [كنايه از طرح و برنامه‌ريزى كردن براى كسى].

**خەتی لێ کێشا:** واتە نوقلانەی دوارۆژی بۆ لێدا کە چی، بەسەردێت (جلال محمود. بەرگی١. ١٧٣): [كنايه از آينده را برايش ترسيم كرد كه چه خواهد شد و چه بر سر او خواهد آمد].

**خەرەك دەڕێسێت:** خەرەك: ئامێری ڕستن و بادانەوەی ڕێسراوەیە بە ڕقەوە بە یەکێك دەوترێت کە زۆر بلێت و درێژە بە قسە بدات (جلال محمود. بەرگی١. ١٧٣): [كنايه از آدم پرگو و وراج].

**خەرگەلە:** بریتی لە پیاوی پیس و بۆخڵ و کۆنەپۆش: كنايه از آدم كثيف و بخيل.

**خەرمان دڕك:** [بریتی لە یەکێکی ئازاردەر]: كنايه از آدم مزاحم و موى دماغ. (حيرت.٢٢٥)

**خەرمانەی داگە:** بە ئافرەتێکی جوانی نەرم و شل دەوترێ کە خۆی نەخشاندبێت پێ‌گەییبێت (جلال محمود. بەرگی٢. ٥٧): [كنايه از دختر زيبا و رعنا كه خود را آراسته كرده باشد].

**خەساندوویانە:** ١) لە هەڕە و گیف و گوڕیان خستووە: ١) [كنايه از تاب و توان انداختن] ٢) لە پیاوەتییان خستووە: ٢) [كنايه از مردى انداختن] ٣) دەسەڵاتیان بڕیوە ناوێرێ قسە بکات، ترساندوویانە (جلال محمود. بەرگی١. ١٧٤): ٣) [كنايه از اين كه او را از قدرت انداختند و جرئت حرف زدن را ندارد].

**خەفە کردن:** بریتی لە کوشتن و سەرنگوون کردنی یەکێك (خال.ف.٩٠): [كنايه از كشتن و نابود كردن كسى].

**خەلۆل:** بریتی لە زەلامی ناقولا: كنايه از آدم ناهموار و ناهنجار. (مەزبر.٢٦٦)

**خەلات:** بریتی لە کفن: كنايه از كفن. (مەزبر.٢٦٥)

**خەڵاتی برایم ئاغا:** [بریتی لە بەخشینی شتێك بە کەسێك و هەمدیسان لێ بسێنیتەوە]: كنايه از بخشيدن و دوباره پس گرفتن چيزى از كسى. (فتاحی قاضی. بەرگی١. ١٤٧)

**خەڵك کاغەزی سپی دەخوێنێتەوە:** واتە: خەڵك لە هەموو شتێك دەکولێتەوە ئاگاتان لە قسە و کردەوەتان بێت (جلال محمود. بەرگی١. ١٧٤): [كنايه از مردم از همه چيز آگاهند و مواظب گفتار و رفتارتان باشيد].

**خەم بە با دەدات:** بریتی لە یەکێك کە جۆرە قسەیەك بکات. بە تەوسەوە یان بە بەزەییەوە وای پێ دەڵێن (جلال محمود. بەرگی٢. ٥٨): [كنايه از كسى كه سخن ناهنجار بر زبان بياورد. اين كنايه از روى طعنه يا ترحم به كار مى رود].

**خەمی لێ هاتووە:** ١) سڵ دەکاتەوە و دەترسێت: ١)

[کنایە از می‌ترسد] ٢) سەری دنیای لێ هاتۆتەوە یەك: ٢) [کنایە از دنیا بر سرش ریختە] ٣) کارەکە بوەتە گرێ لە دڵیدا (جلال محمود. بەرگی١. ١٧٥): ٣) [کنایە از کار برایش مشکل شدە].

**خەنەکچان:** بریتی لە دامێن پاکی و بێگوناهی: کنایە از پاك‌دامنی. (مەزبور.٢٦٨)

**خەنەی بۆ گرتکەسەو:** پیلانێکی بۆ ئامادە کردووە کە گرفتاری بکات (جلال محمود. بەرگی٢. ٥٨): [کنایە از نقشە و دسیسەای برایش چیدە کە گرفتارش بکند].

**خەنەی ڕەنگ ناگرێ:** قسەکەی بێ ئەنجامە و ڕەنگ ڕشتنەکەیشی بێ بەر و بێ ئاکام و بێکەڵکە (جلال محمود. بەرگی٢. ٥٨): [کنایە از کسیکە سخنش و نقش‌اش بی‌اثر باشد].

**خەنەی گرتە دەس و پای:** [واتە فێڵی لەگەڵ کرد، واتە: بە درۆ و دەلەسە کڵاوی ناوەتە سەری و خەڵەتاندوویە]: کنایە از او را فریب داد، با وعدەهای دروغی او را فریب داد. (حیرت.٢٢٧)

**خەنەی گرتکە دەست و پای:** واتە بە درۆ و فیشاڵ لاسی دەدا: کنایە از کسی کە با دروغ و لاف و گزاف او را فریب داد.

**خەنجەری لە کا ئەدا:** بریتی لە یەکێك کە بێ پارێز دەست بوەشێنێ، یا پارە خەرج بکا (خاڵ.٢٠٣): [کنایە از کسی کە چشم بستە ضربە بزند یا پول خرج کند].

**خەو ئاشو پاشووە:** بریتی لە یەکێك کە نەخشەیەکی تاڵ و پووچی کێشابێت (جلال محمود. بەرگی٢. ٥٨): [کنایە از کسی کە نقشەی پوچی کشیدە باشد].

**خەونی سەران:** بریتی لە خەونی زۆر درێژ خایەن: کنایە از خواب طولانی. (مەزبور.١٠١١)

**خەوی بۆ دیگە:** بریتی لە پیدا نکردن بۆ دەستبەسەراگرتن، شتێك یان ماڵێك بە یەکێکەوە شك ببەی و تەما کەیتە سەری: کنایە از طمع کردن در مال یا چیز دیگران.

**خەوی پێوە دەبینێت:** تامەزرۆیەتی، ئاواتەخوازی ئەو شتەیە، کوژراویەتی (جلال محمود. بەرگی١. ١٧٦): [کنایە از مشتاقش است، آرزومند آن چیز است، کشتە و مردەی آن است].

**خەیاتە ئەکێشێتە لووتی:** [واتە لەغاوی ئەکا و وای پێ دەکات فەرمانبەری بێت]: کنایە از او را مطیع خود می‌سازد. (حیرت.٢٢٩)

**خەیاڵ پلاو کردن:** بریتی لە کەسێك کە لە بەر خۆیەوە ئارەزوی شتێك دەکا: کنایە از کسی کە آرزوهای محال می کند، خیالبافی می کند.

**خیز گوڵی کرد:** [بریتی لە کارێکی دژوار و دوور لە ئاوەز]: کنایە از امر محال دور از عقل. (فتاحی قاضی. بەرگی١. ١٥٠)

د

**داتە پیرن:** پیربوون و بەناواچوونی گیاندار (خالن.ف.۹۸): [کنایه از موجود پیر و ضعیف].

**داتە پیوە:** واتە پیرە یان پەکی کەوتووە و داکەوتووە (جلال محمود. بەرگی۲. ٦٥): [کنایه از آدم بسیار پیر و افتاده].

**داتەکاندن:** بریتی لە هیچ تێدا نەهێشتن: کنایه از خالی کردن. (مەزبر.۲۷۵)

**داتەکاوە:** ۱) پارەیان بۆ نەهێشتووە هێندەیان پی خەرج کردووە، نابوت بووە: ۱) [کنایه از پولی برایش نگذاشته‌اند و آنقدر به او خرج کرده‌اند که ورشکست شده است] ۲) هەرچی پیّ بووە لێیان سەندووە (جلال محمود. بەرگی۲. ٦٥): ۲) [کنایه از هر چی داشته ازش گرفته‌اند].

**داتەکین:** بریتی لە نابووتبوونی مەردوم (خالن.ف.۹۸): [کنایه از نابود شدن، ورشکستگی].

**داپۆشین:** بریتی لە ونکردنی دەنگوباسێك یا نەنگی یەکێك (خالن.ف.۹۷): [کنایه از عیب و ننگ کسی را مخفی کردن].

**داپۆشان:** بریتی لە تەواوکردنی خانوو: کنایه از تمام کردن خانه. (مەزبر.۲۷۵)

**داخ کردن:** بریتی لە فریودان و زیان لێدان: کنایه از فریب دان. (مەزبر.۲۷۷)

**داخ لە دڵە:** [بریتی لە خەفتباربوون]: کنایه از کسی داغدیده و ناراحت است. (حیرت.۲۳۱)

**داخەکەی لە دڵدا سەوزە:** خەفەتەکەی بنجی داکوتاوە، ناسۆرێکی گەورەیە و تەمی ناڕەوێتەوە (جلال محمود. بەرگی۲. ٦٥): [کنایه از کسی که غم و غصه در دلش ریشه دوانده، زخم التیام ناپذیری است و غم و غصه از او دور نمی‌شود].

**داخی کرد:** تووشی سزا، خەفەت و زیانێکی گەورەی کرد، تەمێی کرد (جلال محمود. بەرگی۱. ١٦٦): [کنایه از این که او را گرفتار رنج و غم و غصه‌ی بزرگی کرد، تنبیهش کرد].

**داخیان کرد:** ۱) سزایەکی زۆریان دا تەمێیان کرد: ۱) [کنایه از رنج بسیاری به او داده‌اند و او را تنبیه کرده‌اند] ۲) زیانێکی گەورەیان پیّ گەیاندووە (جلال محمود. بەرگی۲. ٦٥): ۲) [کنایه از آسیب بزرگی به او رسانده‌اند].

**داڵۆش:** بریتی لە کەسێك کە بە گزی دۆستەوە بەهرە دەبا، هەواڵی خۆی فریو ئەدات: کنایه از دوست دغل. (مەزبر.۲۷۷)

**داڵۆشین:** بریتی لە بەهرەبردنی ناڕەوای دۆستی گزی کار: سوءاستفاده دوست دغل. (مەزبر.۲۷۷)

**دادروون:** بریتی لە خەنجەردان لە یەکێك (خالن.ف.۱۰۱): [کنایه از خنجر زدن به کسی].

**داژدار (داشدار):** بریتی لە لاگر و پارێزەر: کنایه از طرفدار. (مەزبر.۲۸۱)

**دار بۆ کردن:** بریتی لە تۆڵەسەندن (خالن.ف.۱۰۱): [کنایه از انتقام گرفتن].

**دار بە پواژی خۆی دەقلیشێت:** بریتی لە یەکێك کە لە لایەن یاران و خزمی خۆیەوە دوژمن دەستی پیّ بگەیێت زیانی لیّ بدا (جلال محمود. بەرگی۱. ۱۹۳): [کنایه از کسی که دشمن توسط اقوام و نزدیکانش بر او ضربه بزنند].

**دار بە دەمیەوە دەدەن:** هانی دەدەن و ئیدەن بە گژ خەڵکدا بۆ سووکی وای پیّ دەڵێن چونکە دار بە دەمی

سەگەوە دەدرێت، بۆ تووڕە و تیژ کردنی (جلال محمود. بەرگی٢. ٦٥): [کنایە از کسی را تحریک کردن به منظور ایجاد آشوب و بلوا].

**دار بە کونی زەردەواڵەدا دەکات:** برێتی لە یەکێك کە ئاژاوە دەنێتەوە، فیتنە بەرپا دەکات (جلال محمود. بەرگی١. ١٩٣): [کنایە از کسی کە آشوب و بلوا ایجاد می‌کند].

**دار داڕۆك:** برێتی لە نانی زۆر کۆن و ڕەقهەڵاتوو: کنایە از نان کهنە و خشك شدە. (مەژار.٢٧٨)

**دار لە بەرا پێشەیەکە:** [برێتی لە ئەوە هەمووشتێ کاتی ئەوێ و زەمەن ئەخاێنێ]: کنایە از همە چیز نیاز بە زمان دارد. (حیرت.٢٣٢)

**دار لە دەستیدا کەوتووە:** ١) دەسەڵاتی بڕاوە: ١) [از توان و قدرت افتادە] ٢) نەدار بووە: ٢) [کنایە از تنگدست شدە] ٣) لاواز کەوتووە (جلال محمود. بەرگی٢. ٦٥): ٣) [کنایە از لاغر شدە].

**دار لە دەسی داکەفتگە** (ئەمومن.٥٠): [برێتی لە یەکێکی لە کارکەوتوو و بێدەسەڵات: کنایە از آدم از کار افتادە و ناتوان].

**دار لە ڕیشە ئەکەنێ (تێرێ):** بە یەکێك دەوترێ کە بەهێز و پاڵەوان بێت: کنایە از شخص زورمند. (حیرت.٢٣٢/ جلال محمود. بەرگی٢. ٦٥)

**دار و بارێکی نییە** (ئەمومن.٥٠): [برێتی لە یەکێکی لەڕولاواز: کنایە از آدم لاغر].

**دار واویلا:** برێتی لە یەکێکی بێ هێز و ناتەوان، نزار: کنایە از ضعیف.

**دارە دارە دەکات:** ١) منداڵ کە خەریکە پێ بگرێت: ١) [کنایە از کودکی کە تمرین راه رفتن می‌کند] ٢) نەخۆشێك کە خەریکە پێ بگرێتەوە و چاك بێتەوە (جلال محمود. بەرگی٢. ٦٥): ٢) [کنایە از آدم بیماری کە رو بە بهبودیست].

**دارەگەی سەرکەڵ و پەردەکەی قشلاق:** برێتی لە دوو شت کە هیچ پەیوەندییەکیان بە یەکەوە نەبێ. ئەم لە کوێ و ئەو لە کوێ: کنایە از دو چیز کە هیچ ربطی بە هم ندارند.

**داردەستی ئەم و ئەوە (کوتەکی دەستی ئەم و ئەوە):** واتە پیاوی ئەم و ئەوە و خراپەی پێ دەکەن و دەیچەوسێننەوە (جلال محمود. بەرگی١. ١٩٣): [کنایە از شخصی کە دیگران برای اهداف پلید خود از او استفادە می‌کنند در قبال رنج و زحمتی کە می‌کشد مزدی بە او نمی‌دهند].

**دارکە پێچان:** برێتی لە کز و کەنفت، لەڕولاواز: کنایە از لاغر و مردنی.(مەژار.٢٧٩)

**دارماڵ:** برێتی لە دەفرێك کە لێوانلێو بێ لە شتێکی وشك بە بێ قەڵا کردنی (خاڵ.ف.١٠٤): [کنایە از ظرفی کە لبریز و مالامال باشد].

**داروبار:** ١) برێتی لە قەڵافەت و قەبارەی شت: ١) کنایە از قد و اندازەی چیزی ٢) برێتی لە هێز و توان و لەش ساغی (پیاوێ بە داروبارە): ٢) کنایە از توانایی و سلامت. (خاڵ.ف.١٠٤)/ (مەژار.٢٨٠)

**داروباری وەهای نییە:** یەك بایە، کزولاواز و بێهێزە (جلال محمود. بەرگی١. ١٩٤): [کنایە از آدم لاغر و ضعیف و ناتوان].

**داروبەر:** ١) برێتی لە هەموو شت ٢) برێتی لە جێگەی سەخت و چۆڵ: ١) کنایە از هر چیز : ٢) کنایە از زمین خشك و خاکی از سکنە. (مەژار.٢٨٠)

**داری بۆ گرد:** ١) تۆڵەی لێ سەند: ١) [کنایە از او انتقام گرفت] ٢) تووشی چورتومێکی کرد (جلال محمود. بەرگی١. ١٩٥): ٢) [کنایە از او را دچار مصیبتی کرد].

**داری بە رۆحیدا دا:** ١) سزای پێ گەیاند تووشی چەرمەسەرێ و دەردیسەرییەکی زۆری کرد. گرفتاری کرد: ١) [کنایە از رنج و آزار دادن و گرفتار کردن کسی] ٢) زیانێکی زۆری پێ گەیاند (جلال محمود. بەرگی٢. ٦٥): ٢) [کنایە از آسیب بزرگی بە او رساند].

**داری بەسەر بەردییەوە نەماوە:** ١) کاول بووە، تێکشکاوە و هیچی بەسەر هیچەوە نەماوە: ١) [کنایە از ویران شدن و خراب شدن جایی] ٢) پەرش و بڵاو بۆتەوە (جلال محمود. بەرگی١. ١٩٤): ٢) [کنایە از پخش و پلا شدن].

**داری دا بە رۆحیا:** واتە تۆڵەی خۆی لێسەند (خاڵ.٢١١): [کنایە از انتقام خود را از او گرفت].

**داری داگە بە رۆح حاتەما:** ١) بو گاڵتەیە، برێتی لە یەکێك کە زۆر دەست بڵاو و بەخشندە بێت: (بە عنوان مسخرە بە کار میرود)، ١) [کنایە از آدم بخشندە و سخاوتمند] ٢) بەتەوس و بێزەوە بە ڕژدێك دەڵێن کە هیچی لە دەست نەبێتەوە (جلال محمود. بەرگی٢. ٦٥): ٢) [با طعنە و اشتها بە آدم خسیسی گفتە میشود کە هیچ کمك یا بخششی از دست او ساختە نیست].

**داری دستیەتی:** هەموو کارێکی بە ئەو دەکرێت بە بێ ئەو پەکیەتی (جلال محمود. بەرگی١. ١٩٥): [کنایە از کسی کە همە امورش را توسط یکی دیگر انجام دهد و بدون او از کار بیافتد].

**داری سەماوات:** برێتی لە نارەحەت کردنی زۆر: کنایە از زیاد آزردە کردن. (مەزهەر١.٢٨١)

**داری سواڵی دایە دەست:** ١) نابووتی کرد: [کنایە از ورشکستش کرد] ٢) هەژاری خست (جلال محمود. بەرگی١. ١٩٥): [کنایە از تنگدستش کرد].

**داری نەرم، مێرووڵە ئەیخوا:** واتە مەردوم کە زەبوون بوو، هەموو کەسێك تەماعی تێ ئەکا (خاڵ.٢١٢): [کنایە از آدم ناتوان و بیچارە کە مورد سوء استفادە دیگران قرار میگیرد].

**دارێکی تێ دەبرێت:** تووشی چورتمێك و سزایەکی ئەوتۆی دەکات هەتا پێوی بتلێتەوە (جلال محمود. بەرگی١. ١٩٥): [کنایە از او را گرفتار آنچنان مصیبت و رنج و آزاری میکند کە نالە سردهد].

**داس لە سەپان مەشارەوە:** واتە هەرکەسە شایستەی چییە، بیدەرە دەستی (جلال محمود. بەرگی٢. ٦٦): [کنایە از هر کسی کە لایق و شایستەی هر شغلی است آنرا بدو بسپار].

**داس لە سەپانی خۆی دەشارێتەوە:** برێتی لە یەکێك کە بە پێچەوانەی بەرژەوەندیی خۆی کار دەکا (جلال محمود. بەرگی٢. ٦٦): [کنایە از کسی کە برخلاف منافع خویش کار کند].

**داش بە داش:** برێتی لە وتن یا کردنی شتێك بەرامبەر بە شتێکی تر (خاڵ.ف.١٠٥): [کنایە از گفتن یا انجام دادن کار یا چیزی در برابر چیزی یا کاری دیگر].

**داشۆرپاك:** برێتی لە بێ شەرم و ئابڕوو: کنایە از بی شرم و حیا. (مەزهەر١.٢٨١)

**داشی سوارە:** برێتی لە یەکێك کە دەست و قسەی بڕوا (معروف.٥٢): [کنایە از آدم بانفوذ و توانا].

**داگرتن:** برێتی لە لێدانی یەکێك بە زۆری: برێتی لە قسەکردن بە زۆری: شیما نازیلای بە قسە داگرت (خاڵ.ف.١٠٧): [کنایە از با زور کسی را زدن، شخص وراج و پرگو].

**داگرتی:** برێتی لە بادی هەوا، بە فیز: کنایە از متکبر. (مەزهەر٣.٢٨٢)

**داگیە بە گەنەی دەماخیا:** [واتە قەلّزبوون لە غەیبەت بیستوویە کە سەبارەت بە ئەو قسەمان کردووە]: کنایە از فهمیدە کە را جع بە او صحبت کردەایم. (حیرت.٢٢٤)

**داگیە بە گەنەی دەماخیا:** واتە ئەوخەبەرەی بیستووە (خزلدی.گ.١٨١): [کنایە از آن خبر را شنیدە].

**داگیە بە یەکا:** [واتە تووڕە بووە]: کنایە از عصبانی شدە. (حیرت.٢٣٤)

**داگیە دەسەوە:** [برێتی لە پیرێکی لەپاکەوتوو و بێ هێز کە نزیك مردنی بێت]: کنایە از پیری ضعیف و ناتوان و نزدیک بە مرگ. (حیرت.٢٢٤)

**داقلۆز:** برێتی لە فێڵباز و زرنگ: کنایە از آدم زیرک و مکار. (مەژار.٢٨٢)

**داقەلاشتن:** برێتی لە هەلاتنی بە پەلە: کنایە از فرار با شتاب. (مەژار.٢٨٢)

**داکەوتن:** برێتی لە پیربوون و بەناواچوونی گیاندار(خال.ف.١٠٧): [کنایە از موجود پیر و ضعیف].

**دالّبوون:** برێتی لە لاوازبوونی گیاندار (خال.ف.١٠٨): [کنایە از ضعیف شدن].

**دام:** برێتی لە دەولّەمەندی: کنایە از ثروت زیاد. (مەژار.٢٨٤)

**دامرکیاگە:** [هێمن و بێدەنگ بوون]: کنایە از آرام و سربراه شدە. (حیرت.٢٣٥)

**داوێن گرتن:** برێتی لە پەنا بۆ بردن و تکا کردن لە کەسێ: کنایە از التماس و پناه خواستن. (مەژار.٢٨٥/ خال.ف.١١٠)

**داوێنگیر:** برێتی لە کەسێك کە هانات بۆ بێنێ (خال.ف.١١٠): [کنایە از کسی کە بە تو پناه آورد].

**داوێنی خۆی لێ بووە بە دوژمن:** برێتی لە دایکێك زارۆلەکەی نە یاریەتی و بەربەرەکانێی لەگەلّ دەکات (جلال محمود. بەرگی٢. ٦٦): [کنایە از مادری کە فرزندش دشمنش شدە و رودرویش بایستد].

**داوێنی چاکی بە لادا:** خۆی گورج کردەوە و خۆی بۆ کارەکە ئامادە کرد (جلال محمود. بەرگی١. ١٩٦): [کنایە از خود را آمادە کرد].

**داوێنی گرت (بادا):** برێتی لە یەکێك کە پەنا بو یەکێك ببا و تکای لێ بکا (جلال محمود. بەرگی٢. ٦٦): [کنایە از کسی کە پناه بە کس دیگری ببرد و از او برای کاری خواهش و تمنا کند].

**دان تیژ کردن:** برێتی لە تەماح کردن: کنایە از طمع ورزیدن. (مەژار.٢٨٦)

**دان سپی بوونەوە:** برێتی لە بێ شەرم بوون: کنایە از شرم و حیا رفتن. (مەژار.٢٨٦)

**دان لێ تیژ کردن:** برێتی لە چاوبڕینە شتێك و بە تەما بوونی (خال.ف.١١١): [کنایە از بە چیزی چشم دوختن و بە طمع افتادن].

**دانە (دیانە) ڕیچەی پێ کەوتووە:** ١) زۆر لاواز بووە: ١) بسیار لاغر شدە است ٢) لە گیانەلاّ دایە: ٢) کنایە از در حالت نزع افتادە.

**دانەی گالّ لە دەسی دەرنایەت:** [برێتی لە یەکێکی زۆر ڕژد و بەرچاو تەنگ]. (حیرت.٢٣٦)

**دانپیانان:** برێتی لە وتنی ڕاستی شتێك (خال.ف.١١٠): [کنایە از اعتراف کردن بە چیزی].

**دانوویان (دانەیان) پێکەوە ناکولێت:** برێتی لە دوو کەس کە هەمیشە دژی یەکتر بن و پێکەوە هەلّ نەکەن، ناتەبا بن، هاوەمەجاز نەبن (جلال محمود. بەرگی١. ١٩٦): [کنایە از دو نفر کە همیشە ضد هم باشند و با هم نمی‌سازند و ناسازگارند و طبیعت آنها از هم دور است].

**دانی (دیانی) لێ تیژ کردەوە:** واتە مرخی لێ خۆش

کردووە (خال،٢١٢): [کنایه از هوس چیزی را در سر داشتن].

**دانی بە خۆیدا گرت:** ١) ئارامی گرت: ١) [کنایه از آرامش پیدا کرد] ٢) بەرگەی گرت: ٢) [کنایه از مقاومت کرد و تاب آورد] ٣) چاوەڕێی کرد (جلال محمود. بەرگی١. ١٩٧): ٣) [منتظرش گذاشت].

**دانی پێدا نا:** ١) سەلماندی و بە ڕاستی زانی: ١) [کنایه از قبولش کرد و آنرا درست پنداشت] ٢) بڕیاری لە سەردا: ٢) [کنایه از شرط و قرار گذاشت] ٣) پێی لێ نا، چووە ژێری (جلال محمود. بەرگی١. ١٩٧): ٣) [کنایه از اعتراف کرد و آنرا پذیرفت].

**دانی سپی بۆتەوە:** ڕوو هەڵماڵدراوە. لە حاستی گەورەدا شەرم و شکۆی لا نەماوە (جلال محمود. بەرگی٢. ٦٢): [کنایه از آدم بی‌شرم و حیا در مقابل بزرگتر از خود خجالت نمی‌کشد].

**دانی لێ چیر دەکاتەوە:** بریتی لە هەڕەشە لێکردن (جلال محمود. بەرگی٢. ٦٢): [کنایه از این که او را تهدید می‌کند].

**دانیان (دیانیان) لە یەك سپی بۆتەوە:** سیوایان لەیەك هاتۆتەوە و قسە لە یەك ناخۆنەوە و سامیان لە یەك شکاوە و شەرم لە یەك ناکەن (جلال محمود. بەرگی١. ١٩٦): [کنایه از نسبت به هم پررو شده‌اند و از هم ترسی ندارند و خجالت نمی‌کشند].

**دانیشە سەر شواڵ خوت:** واتە بە دەرد خوتەوە داکەوە و ئارام بگرە: کنایه از آرام و ساکت شو.

**داوای خوێن باوکی ئەکا:** [گرانفرۆش]: کنایه از گرانفروش. (حیرت.٢٣٦)

**داوباز:** بریتی لە فێلبازی: نیرنگباز.

**داوم لە داوی نابێتەوە:** واتە دەستی لە یەخەم نابێتەوە. بەرۆکم بەر نادات، ڕزگاریم لێی نابێت (جلال محمود. بەرگی١. ١٩٧): [کنایه از دستش از گریبان من جدا نمی‌شود و از دست او نجات پیدا نخواهم کرد].

**داوی بۆ ناوەتەوە:** واتە تەڵەی بۆ ناوەتەوە، پیلانی بۆ گێڕاوە تووشی بکات (جلال محمود. بەرگی١. ١٩٧): [کنایه از دام برایش نهاده و نقشه برایش کشیده تا گرفتارش کند].

**داوی دامەزراوە:** ١) شووی کردووە: ١) [کنایه از شوهر کرده است] ٢) لەسەر کارێك جێگیر بووە و دامەزراوە (جلال محمود. بەرگی١. ١٩٧): ٢) [کنایه از استخدام شده است].

**داوێن تەڕە:** داوێن پیسە (جلال محمود. بەرگی٢. ٦٢): [کنایه از آلوده دامن است].

**داوێن پاکە:** ١) بریتی لە یەکێك کە توخنی زینا ناکەوێت و مرۆڤێکی ساغە: ١) [کنایه از کسی که زناکار نیست و گناه نمی‌کند و شخص باایمان و سالمی است] ٢) ماقووڵ و پاك و ئاکارچاکە (جلال محمود. بەرگی١. ١٩٨): ٢) [سنگین و باوقار و عفیف است].

**داوێن پیس (شواڵ پیس):** بە دووی زینادا دەگەڕێت: کنایه از آدمی که به دنبال زناکاری و گناه است. (جلال محمود. بەرگی١. ١٩٨/ حیرت.٢٣٧)

**داوێن داتەکاوە:** بریتی لە ژنێکی وەجاخ کوێر و بێ منداڵە (جلال محمود. بەرگی١. ١٩٨): [کنایه از زن بی‌فرزند].

**دای دەدۆشن:** شتی لێ دەپچڕن و کەڵکاوەژووی لێ ئەکەن. بۆ سووکی وای پێ دەڵێن (جلال محمود. بەرگی١. ١٩٣): [کنایه از کسی که دیگران از او سؤاستفاده می‌کنند و هرچه دارد از او می‌گیرد و فریبش

می‌دهند و به عنوان طعنه به کار می‌رود].

**دای لە جەرگم:** [واتە تانەوتەشەر و قسەی تاڵی داوە لێم و لە دڵما ماوەتەوە]: کنایه از طعنه و توهین او در دلم اثر کرده. (حیرت.۲۲۸)

**دای لە شەقەی باڵ:** [واتە باڵی گرتەوە و فڕی]: کنایه از پرواز کرد. (حیرت.۲۲۸)

**دایان دۆشی:** شتیان لێ سەند، لێ ماشییەوە. سا بە فێڵ، بە زمانی لووس، بە هەر ڕێگەیەك بێت ڕووتاندیانەوە (جلال محمود. بەرگی۲. ۶۷): [کنایه از کسی را با زبان چرب و نیرنگ یا به هر نوع دسیسه‌ای دیگری چپاول کنند].

**دایە بە کێوا:** ۱) یاخی بوو: ۱) [کنایه از متمرد شد] ۲) شورشی بەرپا کرد: ۲) [کنایه از قیام کرد] ۳) شێت بوو (جلال محمود. بەرگی۱. ۱۹۸): ۳) [دیوانه شد].

**دایە پاڵ خۆی:** ۱) پاراستی: ۱) [کنایه از نگهش داشت] ۲) کردی بە هی خۆی (جلال محمود. بەرگی۱. ۱۹۸): ۲) [کنایه از مال خودش کرد].

**دایە خواوە بۆی:** [بریتی لە بوختیان کردن]: کنایه از بهتان کردن. (حیرت.۲۲۹)

**دایك شل پێچیاگەسەو:** بریتی لە یەکێك کە شلەپەتە و بێ دەسەڵات بێ، خاوخلیچك و نەکردەیە (جلال محمود. بەرگی۲. ۶۷): [کنایه از آدم ناتوان شل و ول و ناآشنا].

**دایك نازێ لاڵ بێ:** [لە وەڵامی کەسێك کە نازە و نووزی زۆر بکا بۆ گاڵتەیە: بمرم بۆی]: کنایه از بمیرم برایش برای مسخره و استهزا به کار برده می شود. (حیرت.۲۲۷)

**دایك هەموو دەردان:** [بریتی لە یەکێك کە هەموو کاتێ نەخۆش بێ]: کنایه از آدم همیشه بیمار. (حیرت.۲۲۸)

**دایکی خۆی بە چەپلەڕێزان....:** [بریتی لە یەکێکی زۆر فێڵباز]: کنایه از آدم بسیار زیرک و حقه‌باز. (فتاحی قاضی. بەرگی۲.)

**دایکی خۆی دا بە [...]:** ۱) خۆی تووشی چورتوم و زیانیکی گەورە کرد: ۱) [کنایه از کسی که خود را دچار مصیبت و آسیب بزرگی کرد] ۲) کارێکی نابەجێی کرد (جلال محمود. بەرگی۲. ٦٦): ۲) [کنایه از کسی که کار ناشایستی انجام داد].

**درۆزن هەرجارێك ناشتا ئەکا:** واتە تەنیاجارێك پێی باوەڕ ئەکەن (خاڵ.۲۱۷): [کنایه از یک دفعه به دروغگو می‌توان باور کرد].

**درۆودەلەسە:** بریتی لە قسەی ناڕاست و کەڵەك (جلال محمود. بەرگی۱. ۲٦۲): [کنایه از سخن ناراست و حقه‌آمیز].

**درۆی بە باڵ دەفرێت:** بریتی لە یەکێکی زۆر درۆزن و فیشاڵکەرە درۆکانی وایە کە درۆی کەس پێی ناگات (جلال محمود. بەرگی۱. ۲٦۲): [کنایه از شخص بسیار دروغگو گزافه‌گو که دروغهایش به گونه‌ایی است که دروغ دیگران به پای دروغهای او نمی‌رسد].

**دران:** ۱) بریتی لە بڵاوبوونەوەی باسێکی شاراوە: ۱) [کنایه از آشکار شدن راز کسی]: ۲) بریتی لە قەڵەوبوونی گیاندار: ۲) [کنایه از چاق شدن]: ۳) بریتی لە مەردومی بێ دینی بێ باوەر (خاڵ.ف.۱۱٤): ۳) [کنایه از شخص بی دین و بی عقیده].

**دراوە:** واتە زۆر قەڵەو بووە: دەڵێن هێندە گوشتی گرتووە دراوە (جلال محمود. بەرگی۲. ۸٤): [کنایه از کسی که چاق شده باشد].

**درشت:** بریتی لە مەردومی قەبەی تێنەگەیشتوو (خاڵ.ف.۱۱٥): [کنایه از شخص لندهور و ناآگاه].

**درکیان ناوەتە بن کلکی:** بریتی لە تووڕەبوونی یەکێك

کنایە از خشمگین شدن کسی.

**دروستبوون:** بریتی لە کۆبوونەوی پیاو لە گەلْ ژنی خۆیا (خالْ.ف.١١٦): [کنایە از جماع کردن و همبستر شدن مرد با زن خود].

**درێژ تا ئێوارە:** [بە یەکێکی تەژە و درێژ دەلێن]: کنایە از آدم بلند قد. (حیرت.٢٤١)

**درێژ درە:** [بریتی لە زۆر وێژی و چەنەبازی]: کنایە از آدم وراج، پرگو. (فتاحی قاضی.١٨٦)

**درێژبوون:** بریتی لە پالکەوتن و ڕاکیشان (خالْ.ف.١١٧): [کنایە از دراز کشیدن].

**درێژدادر:** [بە یەکێکی قسە فرەکەر و چەقەسرۆ]: کنایە از آدم وراج و گزافگوی. (حیرت.٢٤١)

**درێژداهۆلْ:** بریتی لە مرۆی، تەژەی لاواز: کنایە از بلندبالای لاغراندام. (مەژار.٢٩٢)

**درێژکردن:** بریتی لە بەزەوی دادانی یەکێك (خالْ.ف.١١٨): [کنایە از پشت کسی را بە خاك مالیدن].

**دز بازارە:** [بریتی لە ئاژاوە و بلبشێو]: کنایە از هرج و مرج. (حیرت.٢٤١)

**دزاودزکەوتن:** بریتی لە دووکەس کە گەرەکیان بێت کارێك لە یەك بشارنەوە بەلام لە ئاکامدا کارکە روون ببێتەوە لەیەك ئاشکرا بوون (جلال محمود. بەرگی١. ٢٦٢): [کنایە از دو نفر کە کاری یا چیزی دارند و می‌خواهند از هم پنهانش کنند اما افشا شود].

**دزنەبەر:** ١) بریتی لە ژنی ناشیرین: ١) زن زشت ٢) بریتی لە شتی بێ‌نرخ ٢) کنایە از چیز بی‌ارزش. (مەژار.٢٩٢)

**دزنەخۆر:** بریتی لە شتی بێ نرخ: کنایە از چیز بی‌ارزش. (مەژار.٢٩٢)

**دستومست:** بریتی لە کاربەدەستی خۆ کردن: کنایە از اقدام شخص بدون اتکا بە دیگران. (مەژار.٣١٨)

**دلْ ئاوەدان:** بریتی لە مەردومی وریای زۆر زان (خالْ.ف.١١٩): [کنایە از مردم هوشیار و دانا].

**دلْ ئاوەدانە:** ١) واتە هوشیار و بەپارێزە: ١) [کنایە از هوشیاری و پرهیز] ٢) حەزی لە دنیا و بەرگ و شتی جوانە (جلال محمود. بەرگی٢. ٨٤): ٢) [کنایە از تمایل مال دنیا و لباس و چیزهای زیبا دارد].

**دلْ ئاوخواردنەوە:** بریتی لە باوەڕکردن بە شتێك بە دلْ (خالْ.ف.١١٩): [کنایە از اعتقاد قلبی بە چیزی].

**دلْ ئاودان:** بریتی لە گەیاننی خۆشی یا ناخۆشیەکی زۆر بە دلّی یەکێك (خالْ.ف.١١٩): [کنایە از کسی کە موجب آزار یا خوشی دیگران شود].

**دلْ ئاوڕژێنکردن (دلْ ئاو پرژێنکردن):** بریتی لە دلْخۆشکردنی یەکێك بە مژدە پێدان (خالْ.ف.١١٩): [کنایە از خوشحال کردن و مژدە دادن بە کسی].

**دلْ بە دەس هاوردن:** بریتی لە دلْخوشکردنی یەکێك: کنایە از خشنود کردن و دلخوش کردن کسی.

**دلْ بە دلْ رێگە مەدە:** [واتە: بیری لێ مەکەرەوە، خەم و پەژارەت نەبێ]: کنایە از نگران مباش. (حیرت.٢٤٢)

**دلْ بردن:** بریتی لە عاشق بوون (دلّی بردم کچێکی چواردە سالە): ئەویندار بوون: کنایە از عاشق شدن. (مەژار.٢٩٤)

**دلْ برەوادان:** بریتی لە ڕازی بوونی دلْ لە سەر کارێك: کنایە از اجازە و فتوای دل برای انجام کاری.

**دلْ برین:** بریتی لە زۆر خەمبار: کنایە از بسیار غمگین. (مەژار.٢٩٤)

**دلْ بریندارە:** بریتی لە زۆر خەمبار (جلال محمود. بەرگی٢. ٨٤): [کنایە از آدم بسیار غمگین].

**دلْ تەرە:** بریتی لە یەکێك کە حەز لە بەرگی ئالْ و والا و خۆ رازاندنەوە دەکات حەز لە شتی جوان دەکات (جلال

محمود. بەرگی ۱. ۲۶۳): [کنایه از کسی که آرزوی پوشیدن لباس زیبا و آراسته شدن می‌کند و میل به زیبایی دارد].

**دڵ پڕبوون:** برێتی لە دڵ تەنگبوون بە جۆرێك کە نزیك بێ بە گریان (خاڵ.ف.۱۲۰): [کنایه از غمگین و بغض‌آلود].

**دڵ ڕیشە:** ۱) خەفەتبارە: ۱) [کنایه از غمگین است] ۲) گومانکەرە، گوماندارە (جلال محمود. بەرگی ۱. ۲٦٤): ۲) [گمان کننده].

**دڵ زیندووە:** حەزی لە خۆشیی دنیایە حەزی لە پۆشاك و شتی جوان و ڕەنگینە (جلال محمود. بەرگی ۲. ۸٤): [کنایه از کسی که میل به خوشی‌های دنیا دارد و لباس و چیزهای زیبا و رنگی را دوست دارد].

**دڵ سەختە:** برێتی لە یەکێکی بێ بەزەیی و دڵڕەق (جلال محمود. بەرگی ۲. ۸٤): [کنایه از آدم بی‌رحم و سنگدل].

**دڵ قایمە:** برێتی لە یەکێك کە ورەی بەرز و بەهێز بێت (جلال محمود. بەرگی ۱. ۲٦٥): [کنایه از کسی که روحیه‌ی بلند و نیرومندی دارد].

**دڵ کراوەیە (دڵ بازە):** برێتی لە شوێنێکی دیمەنی خۆش و بەرجەوندارە دڵی مرۆڤی تێدا دەکرێتەوە (جلال محمود. بەرگی ۱. ۲٦٥): [کنایه از جای باصفا و خوش‌منظره که دل انسان در آنجا شاد می‌شود].

**دڵ کوچك ئەکا بە ئاو:** زۆر بەسۆز و دڵتەزێن: کنایه از بسیار سوزناک و رقت‌انگیز.

**دڵ لە دەس دان:** برێتی لە ئەویندداربوون: کنایه از عاشق شدن.

**دڵ لە دڵ مەدە:** برێتی لە دڵنیابوون (خاڵ.۲۲۱): [کنایه از مطمئن بودن].

**دڵ لە دڵدان:** برێتی لە دوودڵی و گومان لە کارێکا (دڵ لە دڵ مەدە) واتە: بێگومان بەو دوو دڵ مەبە (خاڵ.ف.۱۲۳): [کنایه از دو دلی و تردید].

**دڵ لە دوا بوون:** برێتی لە کەسێك کە بە بۆنەی کارێکەوە نیگەران بێت: کنایه از آدم نگران.

**دڵ مردووە:** برێتی لە یەکێك کە بە تەنگ جوانی و ڕازاندنەوە و پۆشاکی خۆیەوە نایەت (جلال محمود. بەرگی ۱. ۲٦٦): [کنایه از کسی که چندان به سر و وضع خویش نمی‌رسد].

**دڵ ناسووتێنێت (دەماخ ناسووتێنێت):** برێتی لە یەکێك خۆی نارەنجێنێت و دڵسۆزانە کارەکە ناکات و بەتەنگەوە نایەت (جلال محمود. بەرگی ۱. ۲٥۱): [کنایه از کسی که زحمت نمی‌کشد و دلسوز نیست و به یاری نمی‌شتابید].

**دڵۆی تێکەوت:** [برێتی لە کارێك یا ئیشێك کە تووشی گێرەوکێشە بێت]: کنایه از کاری که دچار اشکال شده. (فتاحی قاضی. بەرگی ۱. ۱٦۲)

**دڵبەرە:** برێتی لە ئافرەتێکی زۆر جوان و شایستە کە دڵ بۆ لای خۆی دەکێشێ و گرفتاری دەکات (جلال محمود. بەرگی ۲. ۸٤): [کنایه از زن بسیار زیبا و شایسته است که دل را مجذوب و گرفتار می‌سازد].

**دڵە لەرزە:** برێتی لە ترسانی زۆر: کنایه از ترسیدن زیاد. (هەژار.۲۹۷)

**دڵت لای من بێت:** ۱) دڵت بدەرە قسەکەم باش گوێم لێ بگرە: ۱) [کنایه از سخنان من را گوش کن] ۲) خەم و مشوورم بخۆ (جلال محمود. بەرگی ۲. ۸٥): ۲) [به فکر من باش].

**دڵتەڕ:** برێتی لە کەسێك کە حەز لە ژنی جوان، بەرگ و کاڵا و شتی جوان بکا (خاڵ.ف.۱۲۰): [کنایه از کسی که

ئارزوی پوشیدن لباس تازه و زیبا را داشته باشد].

**دڵتەزێن:** [برێتی لە کارەسات و ڕووداوی ناخۆش]: کنایه از اتفاق و حوادث ناگوار. (حیرت.۲٤۳)

**دڵەڕاوکێیەتی:** برێتی لە یەکێکی ڕاڕاییە، لە سەر بیرێك جێگیر نابێت (جلال محمود. بەرگی۱. ۲٦۳): [کنایه از شخص متردد و دودل، کنایه از کسی که عقیده ثابتی ندارد].

**دڵەلەرزێ:** برێتی لە دڵە لەرزە: کنایه از ترسیدن زیاد. (مەژار.۲۹۷)

**دڵپاکە (دڵسافە):** ١) برێتی لە یەکێك کە سینەی سافە، کینەی لە دڵدا نییە: ١) [کنایه از کسی که صاف و صادق است و کینه‌ی در دل ندارد] ٢) خۆش بڕوایە، ساویلکەیە (جلال محمود. بەرگی۱. ۲٦۳): ٢) [کنایه از آدم زودباور و ساده‌لوح است].

**دڵپڕی:** برێتی لە دڵ تەنگی (خاڵ.ف.۱۲۰): [کنایه از غمگینی].

**دڵپیاچوون:** برێتی لە حەز کردن لە شتێك (خاڵ.ف.۱۲۰): [کنایه از آرزوی چیزی کردن].

**دڵپیس:** برێتی لە کەسێك کە دڵی باش نەبێ لە گەڵ مەردوم (خاڵ.ف.۱۲۰): [کنایه از کسی که نسبت به دیگران بدنیّت باشد].

**دڵپیسکردن:** برێتی لە گومان پەیدا کردن دەربارەی یەکێك بە خراپی (خاڵ.ف.۱۲۰): [کنایه از بدگمان شدن از کسی].

**دڵپێسووتان:** برێتی لە بەزەی هاتنەوە بە گیاندارێکا (خاڵ.ف.۱۲۰): [کنایه از رحم کردن به جانداری].

**دڵپیسی:** برێتی لە ناپاکی و خراپی دڵ لەگەڵ مەردوما (خاڵ.ف.۱۲۰): [کنایه از بدنهاد بودن نسبت به مردم].

**دڵخالیەوکردن:** [برێتی لە یەکێك کە بە ڕەنج و ئازار و کۆسپی دوژمن شاد بێتەوە و بە وتەی چزدار یان جنێو تۆڵەی لێ بستێنێ]: کنایه از رنج دشمن شاد شدن و با دادن دشنام دق دل خالی کردن. (حیرت.۲٤۳)

**دڵداکەوتن:** دڵداخوریان: کنایه از شکه شدن، یکه خوردن.

**دڵدز:** برێتی لە گراوی، ماشقە: کنایه از معشوقه. (مەژار.۲۹۵)

**دڵڕۆشن:** واتە هیوادار (جلال محمود. بەرگی۲. ۸٤): [کنایه از آرزومند است].

**دڵڕۆین:** برێتی لە بێخود بوون (خاڵ.ف.۱۲۱): [کنایه از مدهوش شدن].

**دڵڕەش:** [برێتی لە یەکێکی بێ بەزەیی زاڵم، زۆرکار]: کنایه از سنگدل. (حیرت.۲٤۳)

**دڵڕەق:** [برێتی لە یەکێکی دڵڕەش و بێ بەزەیی]: کنایه از سنگدل. (حیرت.۲٤۳)

**دڵڕەقە (دڵ سەختە):** برێتی لە یەکێکی بێبەزەیی و بێباکە، نامیهرەبانە: کنایه از کسی بی‌رحم و بی باک و نامهربان است

**دڵڕفێن:** برێتی لە دڵبەر: کنایه از دلربا، زیبا. (مەژار.۲۹۵)

**دڵڕوون:** برێتی لە دڵخۆش کردن (خاڵ.ف.۱۲۱): [شاد، آسوده‌خاطر].

**دڵسارد:** برێتی لە کەسێك لە کارێکا دوودڵ بێ و گەرموگوڕ نەبێ (خاڵ.ف.۱۲۱): [کنایه از شخصی که در انجام کاری مردد باشد].

**دڵساردی:** برێتی لە دوو دڵی و سارد و سڕی لە کارێکا (خاڵ.ف.۱۲۱): [کنایه از بی‌میل بودن در انجام کاری].

**دڵساف:** ١) برێتی لە یەکێکی بێ کینەیە: ١) [کنایه از آدم بی‌غل و غش] ٢) برێتی لە یەکێکی خۆش بڕوا و ساویلکەیە، زوولاس دەدرێت (جلال محمود. بەرگی۲. ۸٤):

٢) [کنایە از آدم سادەلوح کە زود فریب می‌خورد].

**دڵسەندن:** برێتی لە هۆگرکردنی یەکێك و دڵ لێ سەندن (خاڵ.ف.١٢٢): [کنایە از دل بردن و علاقمند کردن کسی بە خود].

**دڵسووتان:** برێتی لە بەزەیی هاتنەوە بە یەکێکا: ترحّم.

**دڵشکستە:** برێتی لە یەکێکی خەفەتبار و کۆستکەوتوو (جلال محمود. بەرگی٢. ٨٥): [کنایە از آدم غمگین، کە عزیزی را از دست دادە باشد].

**دڵشکستی:** برێتی لە دڵ ڕەنجاندن (خاڵ.ف.١٢٢): [کنایە از رنجیدگی].

**دڵچە پەڵ:** [برێتی لە گومانی ژن و پیاو لە یەکتر]: کنایە از بدگمان از همسر. (حیرت.٢٤٣)

**دڵچوونە سەر:** برێتی لە حەزکردن لە شتێك (خاڵ.ف.١٢٠): [کنایە از آرزوی چیزی کردن].

**دڵگەرم:** برێتی لە کەسێك کە لە کارێکا سەرگەرم بێ (خاڵ.ف.١٢٢): [کنایە از کسی کە دلگرم و امیدوار بە کار باشد].

**دڵگەرمی:** برێتی لە سەرگەرمی لە کارێکا (خاڵ.ف.١٢٣): [کنایە از شاد بودن بە انجام کاری].

**دڵگران بوو:** زیز بوو، دڵگیر بوو (جلال محمود. بەرگی١. ٢٦٥/ خاڵ.ف.١٢٢): [کنایە از قهر کردە، دلتنگ است].

**دڵفراوان:** برێتی لە مەردومی هێمنی لە سەرخۆ (خاڵ.ف.١٢٢): [کنایە از حلیم و شکیبا].

**دڵفراوانە:** ١) بە دەست و دڵە، بەخشندەیە: ١) [کنایە از سخاوت و بخشندگی] ٢) لێ بوردووە: ٢) [کنایە از عفوکنندە] ٣) هێمنە (جلال محمود. بەرگی١. ٢٦٤): ٣) [کنایە از آرام است].

**دڵگرمن:** برێتی لە دڵپیس، دوودڵ: کنایە از بدگمان. (مەژار.٢٩٦)

**دڵم ئاو ناخواتەوە:** برێتی لە متمانە نەکردن بە شتێك بە دڵ (خاڵ.ف.١١٩): [کنایە از صمیم قلب بە چیز اعتقاد پیدا نکردن].

**دڵم داکەفت:** [واتە ترسیام]: کنایە از دلم تکان خورد و ترسیدم و یکە خوردم. (حیرت.٢٤٥)

**دڵم دەرهات بۆی:** [واتە تاسەیم کردووە، تامەزرۆیی زۆر شتێك ئەکەم]: کنایە از آرزومند دیدارش هستم، اشتیاق فراوان برای چیزی. (حیرت.٢٤٥)

**دڵم فێنکەو بوو:** [لە کاتی شادیکامی بۆ نابوودی و بەلایەك کە بە سەر دوژمندا هاتبێ ئەیڵێن. واتە زۆر حەزم کرد]: شاد شدن از نابودی دشمن، بسیار خوشحال شدن. (حیرت.٢٤٥)

**دڵم کوڵەی تێ:** [واتە دڵم پڕە لە پەژارە]: کنایە از دلم پر از غم و غصە است. (حیرت.٢٤٥)

**دڵم لێ هەڵکەفت:** [بێزار بوون لە شتێ یا کەسێك و دووربوونەوە لێی]: کنایە از بیزار شدن از کسی یا چیزی و دوری از آن. (حیرت.٢٤٥)

**دڵم ها لە مشتما:** [دڵڕاوکێ و بێئوقرەی]: کنایە از اضطراب و دلواپسی. (حیرت.٢٤٥)

**دڵم هەڵ نەشێوێ:** [بێزاری و قەڵزبوون لە شتێ]: بیزاری و ناراحت شدن از چیزی. (حیرت.٢٤٥)

**دڵمەندە:** ١) وریا و ژیرە: ١) [کنایە از آدم هوشیار و عاقل] ٢) بەتەنگ دڵی خەڵکەوە دێت (جلال محمود. بەرگی١. ٢٦٦): ٢) [کنایە از این کە در تنگنا و مشکلات روحی بە کمک دیگران می‌شتابد].

**دڵمردوو:** برێتی لە کەسێك کە ئارەزووی شتی خۆش و جوانی نەبێ (خاڵ.ف.١٢٣): [کنایە از دل مردە].

**دڵنیشان:** بریتی لە دڵبەر و دڵڕفێن: کنایە از معشوق. (مەژار.٢٩٦)

**دڵی ئەخوری:** [بریتی لە زۆر حەز لە شتێك کردن]: میل مفرط بە چیزی داشتن. (حیرت.٢٤٥)

**دڵی بۆی دەکورکێنێت:** واتە حەزی زۆری لێ کردووە (جلال محمود. بەرگی٢. ٨٥): [کنایە از بسیار مشتاق است].

**دڵی بۆی دەکوڵێت:** واتە بەزەیی زۆری پێدا دێتەوە. سۆی بۆی جووڵاوە (جلال محمود. بەرگی٢. ٨٥): [کنایە از خیلی دلش بە حالش می‌سوزد، دلش بە رحم آمد].

**دڵی بۆی سووتا:** جەرگی پێ سووتاو بەزەیی پێداهاتەوە: کنایە از دلش بە حالش سوخت. دلش بحالش سوخت بە او رحم کرد.

**دڵی بۆی لێدەدەدات:** واتە ئارەزووی دەکات. حەزی لێ دەکات (جلال محمود. بەرگی٢. ٨٥): [کنایە از دلش هوایش کردە].

**دڵی بە دڵیەوەنا:** واتە پێکەوە گونجان، رێك کەوتن، تەبا بوون. بوون بە دۆستی یەکتر (جلال محمود. بەرگی٢. ٨٧): [کنایە از با هم ساختند و دوست همدیگر شدند].

**دڵی بریندار کرد:** واتە دڵی شکاند، دڵگیری کرد، ڕەنجاندی: کنایە از رنجیدەترش کرد، نگرانش کرد، دل او را آزرد.

**دڵی پاك بۆتەوە:** ١) لە کینە و گومان پاك بۆتەوە بەخشی: ١) کنایە از دل او از کینە و گمان پاك شد او را بخشید ٢) دڵنیا بوو: ٢) کنایە از مطمئن شد.

**دڵی پڕە:** ١) خەفەتبارە: ١) [کنایە از غمگین است] ٢) خەریکە دەگری (جلال محمود. بەرگی١. ٢٦٧): ٢) [کنایە از مشغول گریە کردن است].

**دڵی پێ سووتا:** بەزەیی پێدا هاتەوە (جلال محمود. بەرگی١. ٢٦٨): [کنایە از دلش بە حالش سوخت].

**دڵی پێوەیە:** ١) حەز دەکات: [دوستش دارد] ٢) دڵی چۆتەسەری (جلال محمود. بەرگی١. ٢٦٨): [کنایە از عشق و علاقە بە او پیدا کردە است].

**دڵی خوێنی لێ دەتکێت:** واتە ناسۆرێکی زۆری لە دڵدایە. پەژارە دایگرتووە (جلال محمود. بەرگی٢. ٨٦): [کنایە از درد التیام ناپذیری دارد. غمگین است].

**دڵی داکەوت:** ترسا. خورپەی لێ کەوت (جلال محمود. بەرگی١. ٢٦٨): [کنایە از ترسید. دلش فرو ریخت].

**دڵی داوە پێ (تێ):** ١) واتە حەزی لێ کردووە: ١) [کنایە از عاشقش شدە] ٢) گوێی بۆ شل کردووە: ٢) [کنایە از گوش بە حرفهایش دادە] ٣) سەرنجی تەواوی لە کارەکە داوە (جلال محمود. بەرگی٢. ٨٦): ٣) [توجە کاملی بە کار او نمودە است].

**دڵی ڕاگرت:** دڵی نەشکاند و دڵگیری نەکرد (جلال محمود. بەرگی١. ٢٦٩): [کنایە از رنجیدە خاطرش نساخت و او را دلتنگ نساخت].

**دڵی شەقی برد:** ١) ئارامی لە بەر بڕا: ١) [کنایە از آرام و قرار ندارد] ٢) دڵی تەقی کرد، لە مەراقدا پەست بوو (جلال محمود. بەرگی١. ٢٧٠): ٢) [کنایە از، از غم و غصە دلش ترکید].

**دڵی شکا:** دڵگیر بوو، دڵی ئێشا (جلال محمود. بەرگی١. ٢٦٩): [کنایە از دلتنگ شد، قهر کرد].

**دڵی شکیاگە:** [بریتی لە یەکێك کە خۆشەویستێکی مردبێت]: کنایە از کسی کە عزیزی را از دست دادە باشد. (حیرت.٢٤٦)

**دڵی گۆڕی:** ١) بریتی لە یەکێك کە یارێکیتر بگرێ: ١) [کنایە از کسی کە دوست دیگری را برگزیند] ٢) بریتی لە یەکێك کە بیری بگۆڕێ و پەشیمان بێتەوە

(جلال محمود. بەرگی١. ٢٧٠): ٢) [کنایە از کسی کە فکرش عوض شود و پشیمان شدە باشد].

**دڵی گەردی گرت:** بریتی لە یەکێك کە قسەیك لە دڵی بدا و پێی زیز بێت (جلال محمود. بەرگی١. ٢٧٠): [کنایە از کسی کە از حرف دیگری ناراحت شود].

**دڵی گووشراوە:** بریتی لە یەکێك کە دڵی تەنگ و خەفەتبارە (جلال محمود. بەرگی١. ٢٧١): [کنایە از کسی کە غم و غصە دارد].

**دڵی قایمە:** [بریتی لە دڵنیایی]: کنایە از اطمینان. (حیرت.٢٤٦)

**دڵی قوڕی پێدا دراوە:** دڵی گیراوە و خواردنی بۆ ناخورێت: کنایە از ناراحتی و نگرانی است بە گونەای کە نمی‌تواند غذا بخورد.

**دڵی کەسی بە خۆیەوە نەهێشتووە:** واتە هەموانی لە خۆی کردووە و دڵی زیز کردوون (جلال محمود. بەرگی٢. ٨٦): [کنایە از همە کس را از خود رنجاندە و دل همە را ناخشنود کردە است].

**دڵی کرایەوە:** بریتی لە یەکێك کە دڵخۆش بێتەوە و پەستی و ماتییەکەی بڕەوێتەوە و لاچێ (جلال محمود. بەرگی١. ٢٧٠): [کنایە از کسی کە شاد شود و ناراحتی و غم او از میان برود].

**دڵی لە مشتیدایە (دڵی ها لە مشتیدا):** بریتی لە یەکێك کە دڵەڕاوکێیەتی و ئۆقرەی لێ بڕاوە (جلال محمود. بەرگی١. ٢٧١): [کنایە از کسی کە نگران و بی‌قرار باشد].

**دڵی لێ تۆراوە:** ١) واتە لە بەر چاوی کەوتووە: ١) [کنایە از، چشمش افتادە] ٢) حەزی لێ ناکات بۆ خواردن: ٢) [میلی بە خوردن آن ندارد] ٣) لێی زیز بووە (جلال محمود. بەرگی٢. ٨٧): ٣) [از او قهر کردە است].

**دڵی لێ سەند:** کارێکی کرد کە حەزی لێ بکات و لە گەڵی ڕێککەوێت (جلال محمود. بەرگی١. ٢٧١): [کنایە از کاری کرد کە دوستش داشتە باشد و با او بسازد].

**دڵی لێ چەپەڵ کردووە:** بەدگومانبوون لە کەسێك: کنایە از بدگمانی نسبت بە کسی.

**دڵی لێ کرمۆڵ کردگە:** [واتە گومانی خراپ کردن]: کنایە از بە او ظنین و بدگمان شدە. (حیرت.٢٤٦)

**دڵی لێ هەڵکەنراوە (دڵی لێ هەڵکەفتگە):** واتە لەبەر چاوی کەوتووە (جلال محمود. بەرگی١. ٢٧١): [کنایە از پیش چشمش افتاد].

**دڵی ناسرەوێت:** واتە ئۆقرەی بڕاوە، مەترسی شتێکی هەیە (جلال محمود. بەرگی٢. ٨٧): [کنایە از آرام و قرار ندارد نگران است. از چیزی می‌ترسد].

**دڵی هەڵ ناگرێت:** ١) بریتی لە یەکێك کە بەرگە ناگرێت و قایم نییە: ١) [کنایە از توان ندارد و استوار نیست] ٢) تێرە (جلال محمود. بەرگی١. ٢٧٢): ٢) [کنایە از سیر است].

**دڵی هێنایەوە جێ:** واتە دڵنەوایی کرد و ئاشتی کردەوە (جلال محمود. بەرگی١. ٢٧٢): [کنایە از دلش را بە جا آورد و با او صلح کرد].

**دڵیان بە یەکەوە نووسا:** ١) بریتی لە دووکەس کە حەز لە یەك بکەن: ١) [کنایە از دو نفر کە دوستدار هم باشند] ٢) بریتی لە ڕێککەوتن و گونجانن (جلال محمود. بەرگی١. ٢٧٢): ٢) [کنایە از بە توافق رسیدن].

**دڵیان بە یەکەوەیە:** بریتی لە کچێك و کوڕێك کە دڵخوازی یەکتر بن (جلال محمود. بەرگی١. ٢٧٢): [کنایە از دختر و پسری کە خواهان و عاشق همدیگر باشند].

**دڵیان گۆڕیوەتەوە:** بریتی لە دوو کەس کە حەزیان لە یەکترە (جلال محمود. بەرگی٢. ٨٥): [کنایە از دو نفر کە

همدیگر را دوست دارند].

**دم پلو:** برێتی لە شەرمێونی قسەنەزان: کنایە از خجالتی و نافصیح. (مەزڵر.٢٩٧)

**دم شکاندن:** برێتی لە تەمێ کردن: کنایە از تنبیە کردن، تو دهن زدن. (مەزڵر.٢٩٧)

**دم ناداتە تەڵە:** برێتی لە یەکێك کە خۆی گیر ناخا (رخزادی.١٩٩): [کنایە از آدمی کە بە دام نمی‌افتد].

**دمبەك دڕاو:** [برێتی لە یەکێکی بێ‌شەرم و نابڕوو]: کنایە از آدم بی شرم. (فتاحی قاضی. بەرگی١ .١٦٤)

**دمچەرخدان:** برێتی لە چەنەدان (خاڵ.ف.١٥٩): [کنایە از زبان‌درازی].

**دنیا بنی قووڵە** (مربوخ.١٠): [واتە مەردوم ئەبێ زۆر وریا و دووربین بن: کنایە از انسان باید هوشیار و عاقبت‌نگر باشد].

**دنیا وەك ماستی مەیو وایە:** برێتی لە ئارامی و ئاسایش (خاڵ.٢٢٣): [کنایە از آرامش و امنیت].

**دنیا هەورە و گورگ دەمی چەورە:** برێتی لە یەکێك کە لە کاتی ئاژاوە و نائاسایشتدا هەر ڕۆژە لە لایەکەوە دەست بوەشێنێت (جلال محمود. بەرگی١. ٢٧٣): [کنایە از کسی کە در موقع آشوب و بلوا و ناامنی هر روز از طرفی آسیب برساند و حملە کند].

**دنیای بە هەر دوو دەست گرتووە:** برێتی لە یەکێك کە زۆر خۆی برەنجێنێت و هەوڵ بدات (جلال محمود. بەرگی١. ٢٧٣): [کنایە از کسی کە بسیار زحمت بکشد و تلاش کند].

**دنیای ڕۆشنی لێ تاریك بوو:** ١) برێتی لە یەکێك کە تووشی ناهەمواری و کوڵۆڵی بووە: ١) [کنایە از کسی کە گرفتار ناهمواری و بدبختی شدە است] ٢) نائومێدی دایگرتووە (جلال محمود. بەرگی١. ٢٧٤): ٢) [ناامیدی بر او چیرە شدە].

**دنیای گرتووەتە باوەشەوە:** [برێتی لە یەکێکی تەماکار کە کاری کۆکردنەوەی ماڵی دنیایەو زۆر بە ماڵی دنیا دڵی خۆشە]: کنایە از کسی کە دو دستی بە مال و ثروت دنیا چسپیدە. (حیرت.٢٥١)

**دنیایان لێ تەنی:** واتە سەری دنیایان لێ هێنایەوە یەك (جلال محمود. بەرگی١. ٢٧٣): [او را مجبور ساختند، در تنگنا قرار دادند].

**دوا بڕاو:** برێتی لە شتێك کە حەزی لێ نەکەیت و نەتەوێ ناوی ببەیت (ئەم گرانییە دوابڕاوە هەر نەبڕاویەوە) (خاڵ.ف.١٢٤): [کنایە از چیزی کە دل خوشی از آن ندارید و نخواهید نامی از آن ببرید].

**دوای حەفت سك ئەیژێ کەنیشکم:** [بە ژنێکی دڵ تەڕ و خۆش ڕابوێر دەڵێن]: کنایە از زنی عیاش و خوش گذران. (حیرت.٢٥٦)

**دوژمنی خۆی بە شەکر دەخنکێنێت:** برێتی لە مرۆڤێکی زمان شیرین و زۆرزانە کە بە قسەی نەرم و هێمنانە بە سەر ناحەزەکەیدا سەر دەکەوێت (جلال محمود. بەرگی١. ٢٧٦): [کنایە از آدم شیرین زبان بسیار دانا کە با زبان خوش بر دشمن پیروز خواهد شد].

**دومرکی لێ وێسیاگەسەو:** [واتە نیازی لێدانیە، ڕاسان]: کنایە از بە قصد زدن در مقابلش ایستادە. (حیرت.٢٥٥)

**دوو بەرد:** برێتی لە بەردی کێلی گۆڕ (هەتا لە نێو دوو بەردانم دەنێن لە بیرم ناچێ): کنایە از سنگ لحد. (مەزڵر.٢٩٩)

**دوو دەست بە ناڵە:** برێتی لە یەکێك بە کڕین و فرۆشتنی شتی هیچوپووچ دەسمایەیەکی باش پێکەوە بنێ و دەستکا بە کڕین و فرۆشتنی شتی گەورە (خاڵ.ف.١٣٢): [کنایە از کسی کە از معاملەی کوچك و

کم‌ارزشی تبدیل به بازرگانی بزرگ شود، بازرگان بی‌سرمایه].

**دوو دەسماڵە ئەکا:** بڕێتی لە مرۆڤی دووڕوو کە لە نێوان دوو دوژمندا بۆ بەرژەوەندی خۆی لانی هەر دوو لا ئەگرێ: کنایه از آدم منافق و دورو که برای حفظ منافع خود با هر دو طرف دعوا اظهار همدردی و دوستی کند. (حیرت.۲۵۲/ جلال محمود. بەرگی۲. ۸۸)

**دووپا:** بڕێتی لە مرۆڤ: کنایه از انسان. (مەزبر.۲۹۹)

**دووپف و سەورێ:** لە کارا پەلەنەکردن و سەور کردن (رخزادی.۱۱۱): [کنایه از کسی که در کاری عجله نکند و صبور باشد].

**دوودڵی:** بڕێتی لە ڕاڕا بوون لە کردن یا وتنی کارێکا (خاڵ.ف.۱۳۲): [کنایه از دمدمی مزاج بودن و تردید در انجام کاری یا گفتن آن].

**دۆ و دۆشاوی تێکەڵ کرد:** بڕێتی لە یەکێکی زۆر تووڕەیە کە هیچی تێدا نەبیلێ و هەرچی بە دەمیدا بێت بیلێ (جلال محمود. بەرگی۱. ۲۷۷): [کنایه از فرد بسیار خشمگین که رعایت هیچ چیز را نمی‌کند و هر چه بر زبانش بیاید بگوید].

**دۆبڕ:** بڕێتی لە جووت قۆشەی بێ فەڕ: کنایه از نحس، شوم (نزدیکی سیاره‌های زحل و مریخ). (مەزبر.۲۹۹)

**دۆڕاندن:** بڕێتی لە بەفێڕودانی ماڵ: کنایه از به هدر دادن دارایی. (مەزبر.۳۰۹)

**دۆڵپا:** بڕێتی لە دەس هەڵنەگر چەل و مل وەك دوڵپا سواری شانم بووە دەستم لێ بەر نادا، دێوی چیروکان: کنایه از دست بردار نشدن از کسی. (مەزبر.۳۰۵)

**دۆندان:** بڕێتی لە بەرتیل دان بە کەسێ: کنایه از رشوه دادن. (مەزبر.۳۰۶)

**دوور و دۆس:** بڕێتی لە دووربوون و دۆستایەتی باشترە لەوەی نزیك بین و دڵمان لە یەك بێشێ (رخزادی.۱۹۷): [کنایه از دور و دوست بودن بهتر از نزدیک بودن و رنجیدن از هم است].

**دووربینی دوا دەکات:** [بڕێتی لە یەکێك کە دوارۆژ لە بەرچاو بگرێت]: کنایه از کسی که عاقبت‌اندیشی می‌کند. (حیرت.۲۵۸)

**دووربینی کردن** (مربوخ.۱۱): [بڕێتی لە تەماشای دوارۆژی کار کردن: کنایه از به عاقبت کار اندیشیدن، عاقبت‌نگر بودن].

**دوورەگ:** بڕێتی لە گیاندارێك کە باوك و دایکی لە جۆرێك نەبن (خاڵ.ف.۱۳۲): [کنایه از جانداری که پدر و مادرش از یک‌نژاد نباشند].

**دوورەنگ:** بڕێتی لە مەردومی دوو ڕوو (خاڵ.ف.۱۳۲): [کنایه از منافق].

**دوورکوژ بوون:** بە شتێك یا بە یەکێك ئەوترێ کە لە دوورەوە جوان بنوێنێ (خاڵ.۲۳۰/ جلال محمود. بەرگی۱. ۲۷۵): [کنایه از چیزی یا شخصی که از دور زیبا به نظر برسد].

**دووڕوو:** بڕێتی لە یەکێك کە خۆی خاس پیشان ئەدات بەڵام لە ڕاستیدا وا نییە (خاڵ.ف.۱۳۲): [کنایه از منافق].

**دووسەرە باری ئەکا:** [بڕێتی لە یەکێك کە کارێك داسەپێنێ بە سەر یەکێکی‌تردا و منەتیش بنێتە سەری]: کنایه از تحمیل کاری دشوار بر کسی و منت نیز بر او نهادن. (حیرت.۲۵۲)

**دووسم:** بڕێتی لە گا و مانگا و مەڕ و بزن (خاڵ.ف.۱۳۳): [کنایه از حیوانهای مثل گاو و گوسفند و بز].

**دووگ بە پشیلە ئەسپێرێ:** بڕێتی لە یەکێك کە ماڵی خۆی بداتە دەست مرۆڤی نائەمین (خاڵ.٥٤٦): [کنایه از کسی که مال و دارایی خود را به دست آدم نادرست

بسپارد].

**دووگیان:** بریتی لە ژنی ئاوس: کنایە از زن حاملە.

**دووکەڵ چرای خواردگە:** [بریتی لە یەکێك بۆ بەدەسهێنانی زانیاری هەوڵ و تەقالای زۆری داوە]: کنایە از آدمی کە برای تحصیل علم و دانش تلاش و کوشش زیادی متحمل شده باشد. (حیرت.٢٥٩)

**دووکەڵ لە ماڵی هەڵ ناسێت:** بریتی لە یەکێکی هەژار و چرووك (جلال محمود. بەرگی١. ٢٧٦): [کنایە از شخص فقیر و خسیس].

**دووکەڵەکەی ئەچێتەوە چاو خۆی:** [ئازارەکەی لە دواییا ئەگەڕێتەوە بۆ خۆی]: دست آخر آسیبش بە خودش برمی گردد. (حیرت.٢٥٩)

**دووکەڵی ئەچێتە چاو خومتا:** واتە ئاکامی ڕەشی ئەو کارەساتە داوێنی خۆت ئەگرێ (رخزادی.١٩٨): [کنایە از آخر و عاقبت آن کار دامن خودت را خواهد گرفت].

**دیان بگرە بە خۆتا:** [واتە خۆ ڕاگرە و بەتاقەت بە]: کنایە از مقاومت و پایداری کن. (حیرت.٢٧٨)

**دە ئاو کردن:** خەسار کردن، بە ئاودا دان (ئانەوزادە.١٤١): [کنایە از هدر دادن].

**دە بن سەردا بوون:** داڕشتنی نەقشە و پیلان لە مێشکدا (ئانەوزادە.٣٠٩): [کنایە از خیال توطئەچینی در سر داشتن].

**دەبە:** بریتی لە ئاژەڵی زگ پڕ: کنایە از حیوان آبستن. (مەژار.٣٠٨)

[...] **دەتەقێنێتەوە:** بریتی لە یەکێکی بێکارە و دەستبەتاڵە کە خۆی لە قەرەی هیچ کارێك نادات: کنایە از آدم بی‌دست و پا و تنەلش کە دست بە هیچ کاری نمی‌زند.

**دەر و ئامانی لێ بڕیاگە:** بریتی لە یەکێکی قەڵەو: کنایە از آدم چاق.

**دەر و بەری لێ بڕاوە:** زۆر بێشەرم و ئاوساوە (جلال محمود. بەرگی٢. ٨٨): [کنایە از بسیار بی‌شرم است].

**دەربەرکەوتن:** بریتی لە بەر پاڕانەوە و تکا لێ کردن: کنایە از مورد خواهش و تمنا قرار گرفتن.

**دەربەگی:** بریتی لە زۆرداری و کەڵەگایی کردن (بە دەربەگی خواردی): کنایە از گردن کلفتی و زورگویی. (مەژار.٣١٢)

**دەرەلنگ دڕاو:** بریتی لە رووت و شڕۆڵ: کنایە از ژندە پوش و بینوا. (مەژار.٣١٢)

**دەرپێیان لە پێ داکەند:** ١) ئابڕوویان برد ڕوویان ڕەش کرد: ١) [کنایە از آبروی او را بردند و رسوا نمودند] ٢) دەستیان خستەڕوو (جلال محمود. بەرگی٢. ٦٨): ٢) [کنایە از دستش را خواندند].

**دەردی سەر:** بریتی لە ڕەنج و سەخڵەتی: تووشی (دەردی سەر)م مەکە (خال.ف.١٤٠): [کنایە از رنج و سختی].

**دەردی کارییە:** [واتە نەخۆشیەکەی هیوای ساخ بوونەوەی نییە]: کنایە از بیماری کە امید بە بهبودش نیست. (حیرت.٢٦٠)

**دەردی کەسکونە:** [بریتی لە یەکێك کە نەخۆشیەکەی دەرمانی نییە و خۆشەو ناوێ]: کنایە از کسی کە مریضی لاعلاجی داشتە باشد. (حیرت.٢٦٠)

**دەرگاکوتە:** خوێرییە، ماڵانگەڕە (جلال محمود. بەرگی١. ٢٠٠): [کنایە از آدم بیکارە و ولگرد].

**دەرگای بە قوڕگیرا (هەڵپێچرا):** ١) ماڵی وێران بوو: ١) [کنایە از خانەاش ویران شد] ٢) کەسی نەما و قڕیان تێکەوت: ٢) [کنایە از کسی از او نماندە و همگی از میان رفتند] ٣) جاران ئەگەر یەکێك بمردایا

لەبەر ماڵەکەیدا قوڕیان دادەنا تا کەسوکاری مردووەکە سەریان لە قوڕ بنن: (جلال محمود. بەرگی۱. ۱۹۹) ۳) [کنایه از در گذشته اگر شخصی می‌مرد جلو در خانه‌اش مقداری گلْ فراهم می‌کردند تا نزدیکان مرده آنرا به خود بزنند].

**دەرماڵ:** بریتی لە ماڵە گەورە: کنایه از بارگاه. (مەژار.۳۱۲)

**دەرمان:** شتێکە بۆ چابوونەوە بدرێ بە نەخۆش، بریتی لە دارو (خال.ف.۱٤۱): [کنایه از دارو].

**دەرو ژوور کردن:** ۱) بریتی لە بەرەو چابوون چوونی نەخۆش: ۲) بریتی لە تازە پاگرتنی منالێ: ۱) کنایه از شروع به شفا یافتن: ۲) کنایه از تازه پا گرفتن بچه. (مەژار.۳۱۲)

**دەرهاتووە:** بریتی لە یەکێك کە لە ژیاندا، و لە کاردا بە ئەزموون و شارەزا بووە (جلال محمود. بەرگی۱. ۲۰۰): [کنایه از کسی که در زندگی و کار و حرفه‌اش آگاه و باتجربه شده باشد].

**دەریالووش:** بریتی لە گیانداری زۆر خۆر: کنایه از جاندار پرخور.

**دەزانێ چۆن دە لانکی نێ:** واتە دەزانێ چۆن کار جێبەجێ بکا (جلال محمود. بەرگی۲. ٦٨): [کنایه از این که می‌داند که چگونه کار را انجام دهد].

**دەزگا:** ۱) بریتی لە خانووبەرەی خۆش و گەورە: ۲) بریتی لە نان و خوانی جوان و زۆر: ۱) کنایه از کاخ: ۲) کنایه از سفره‌ی رنگین. (مەژار.۳۱٤)

**دەزووی وشكدا نیەتی (دەزووی وشکی تێدا نییە):** بریتی لە یەکێك کە باران لێی داوە و هەرچی لە بەردایە تەڕە بووە (جلال محمود. بەرگی۱. ۲۰۱): [کنایه از کسی که باران تمام بدنش را خیس کرده باشد].

**دەزووی وشکی تێیا نییە:** بریتی لە هەرچی لە بەری دایە تەڕبووە (خال.۲٤۳): [کنایه از خیس شدن به طور کلی].

**دەزی:** بریتی لە شێوی کۆن: کنایه از آش کهنه، غذای مانده. (مەژار.۳۱٤)

**دەس ئەدا بە ڕانا:** بریتی لە بە پەرۆشبوون و خەم خواردن: کنایه از تأسف خوردن.

**دەس ئەوشێنێ:** بریتی لە شێت: کنایه از آدم روانی که دیگران را کتک بزند.

**دەس بۆ دەم:** بریتی لە ژینی نەمرنەژی، فەقیری: کنایه از زندگی بخور و نمیر. (مەژار.۳۱٥)

**دەس بان دەس نیان:** بریتی لە بێکار مانەوە: کنایه از بیکار ماندن. (مەژار.۳۱٥)

**دەس باو:** بە یەکێکی ماڵ بە فیڕوودەر دەڵێن: کنایه از آدم خراج و اسراف گر.

**دەس بە ئاو:** کناراوچوون: کنایه از توالت رفتن.

**دەس بە تاڵ:** بریتی لە مرۆڤی بێکار (خال.ف.۱٤٦): [کنایه از شخص بیکار].

**دەس بە داوێن بوون:** ۱) بریتی لە پاڕانەوە بۆ ڕاپەراندنی کارێك: ۱) [کنایه از التماس برای انجام کاری] ۲) بریتی لە پەنا بردن بە کەسێك لە کاتی تەنگانەدا: ۲) [کنایه از پناه بردن به کسی در مواقع تنگنا].

**دەس بە دەس دانن:** [واتە: ئاشتکردنەوەی دووکەس]: کنایه از آشتی دادن دو نفر. (حیرت.۲٦۲)

**دەس بە دڵا هاوردن:** بریتی لە هەست بە ئاسایش و خۆشی کردن: پاش تێپەڕاندنی کارێکی دژوار: کنایه از احساس آسایش از یک دشواری.

**دەس بە ژێر باڵیا:** واتە یارمەتی بدە: کنایه از کمکش کن.

**دەس بە زرانی دانیشتگە:** برێتی لە یەکێکی لەکارکەوتوو و بێدەسەڵات، دەستە ئەژنۆ (رخزادی.٢٠٤): [کنایە از پیر و ناتوان، دست بە زانو نشستن].

**دەس بەرزەو کردن:** برێتی لە ترساندن و لێدانی کەسێك: کنایە از کسی را ترساندن و زدن.

**دەس بەرووەوە نان:** برێتی لە ناهومێدکردنی کەسێك: کنایە از نومید گردانیدن.

**دەس بەستە:** برێتی لە خۆ بەدەستەوەدانی بێ لام و جوم: کنایە از تسلیم بدون قید و شرط. (مەزیر.٣١٥)

**دەس برین:** برێتی لە یەکێك کە کەسێکی فریو دابێت (خال.٢٢٨): [کنایە از کسی کە دیگری را فریب و اغفال کردە باشد].

**دەس بڵاو:** برێتی لە کەسێکی ماڵ بە فیڕوودەر: کنایە از ولخرج.

**دەس پیس:** برێتی لە وردە دزی ناوماڵ (خال.ف.٧.١٤٧): [کنایە از دلە دزد].

**دەس خۆی برد بە دەما:** برێتی لە یەکێك کە لە کردنی کارێك پەشیمانە (رخزادی.٢٠١): [کنایە از پشیمان شدن کسی از انجام گرفتن کاری].

**دەس سارد:** برێتی لە یەکێکی فێر کار نەبوو: کنایە از کسی کە کار یاد نگرفتە.

**دەس سووك:** برێتی لە کەسێك کە باش دەرمان بکات یا دەسی خێر بێت: کنایە از کسی کە در معالجە ماهر باشد یا در معاملە و کارهای دیگر دستش خیر باشد.

**دەس شەیتانی لە پشتەوە بەستگە:** [برێتی لە یەکێکی داوباز کە لە کاری خراپەدا شارەزایی تەواوی بێت]: کنایە از آدمی کە انواع صفتهای زشت را داشتە باشد. (حیرت.٢٦٥)

**دەس چەپەڵ:** برێتی لە نائەمین، دزی خوێڕی سیرمەخۆر: دەڵەدز: کنایە از دست کج، دزد.

**دەس چەپەڵە:** [برێتی لە دز]: کنایە از دزد و خیانتکار. (حیرت.٢٦٣)

**دەس چەفت:** برێتی لە یەکێکی دز: کنایە از آدم دزد.

**دەس چەور بساوە بە سەر خۆتا:** [واتە لەو بەڵایەی کە بەسەر خۆتا هێناوتە منیش بەشدار مەکە وازم لێ بێنە]: کنایە از این کە مرا در بدبختی و بلایی کە بر سر خودت آوردەای سهیم مکن. دست از سر من بردار. (حیرت.٢٦٨)

**دەس چووە:** ١) برێتی لە یەکێك کە گەورە بووە: [کنایە از شخص توانمند و بزرگ] ٢) دەسەڵاتدارە، دەوڵەمەندە (جلال محمود. بەرگی٢. ٦٩): [کنایە از شخص مقتدر و ثروتمند].

**دەس گۆڕین:** ١) برێتی لە ژنێك کە بە کەسێکیتر جگە لە شووکەی (...) بدا و منداڵێکی ببێ کە شێوەی لە منداڵەکانیتری نەچێ ١) زنی کە بچە ی حرامزادەای بیاورد کە مانند دیگر بچە هایش نباشد ٢) برێتی ل یەکێك کە ماوەیەك لای یەکێ مامڵە بکات و ئیتر نەیەوێت لە ئەو جێگا مامڵە بکات و بچێتە لای یەکێکیتر: ٢) کنایە از کسی کە مدتی پیش یکی معاملە کند و دیگر نخواهد پیش او بە معاملە خود ادامە دهد و پیش کسی دیگر برود.

**دەس قورس:** کەسێك کوتەك وەشاندنی بە زەبر بێ: کنایە از کسی کە قدرت دستش برای کتک زدن زیاد باشد.

**دەس قوچیاگ:** دەس قوچاو: کنایە از خسیس.

**دەس کەسێ گرتن:** برێتی لە یارمەتیدانی یەکێك: کنایە از کسی را یاری کردن.

**دەس لە بان دەس فرەس:** واتە لە ژوور هەموو خاوەن پیشەیەکەوە، یەکێکی وا هەیە کە گەلێ بەرزتر بێ لەو پیشەیەدا: کنایە از در رأس همە شغلها یک نفر وجود

دارد که از همه استادتر باشد.

**دەس لە بان دەس نیان:** برێتی لە بێکار مانەوە (خاڵ.ف.۳۱۵): [کنایە از شخص بیکار].

**دەس لە پا خەتا ناکا:** [واتە بە باشی کارەکەی بە ڕێوە ئەبا]: کنایە از بە درستی کارش را انجام می‌دهد. (حیرت.۲٦٦)

**دەس لە پا درێژتر:** ۱) برێتی لە یەکێکی تەنبەڵ و تەوەزل: ۱) [کنایە از شخص تنبل]. ۲) هاتەوە بێ‌ئەوەی هیچی دەست کەوێ (جلال محمود. بەرگی۲. ٦۹): ۲) [کنایە از برگشتن کسی از جایی کە هیچ دستاوردی برایش نداشتە باشد].

**دەس لە سەر کەسێ هەڵگردن:** برێتی لە وازهێنان و لەملەوە بوون لە کەسێك: کنایە از دست برداشتن از کاری یا کسی.

**دەس لە سەرم هەڵگرە:** واتە وازم لێ بهێنە: کنایە از مرا رها کن و دست از سرم بردار.

**دەس لێك بەردان:** برێتی لە جیایی نێوان دوو دڵدار یا ژن و مێرد: کنایە از جدایی افتادن بین زن و مرد یا عاشق و معشوق. (مەزبر.۳۲۱)

**دەس ماچ کردن:** برێتی لە ڕێك کەوتنی کارێك بە تایبەت ژن خواستن: کنایە از بە توافق رسیدن دو نفر مخصوصاً در خواستگاری.

**دەس نەخشین:** برێتی لە مرۆی کارامە لە کاری هونەریدا: کنایە از هنرمندی کە با دست خوب بیافد خوب بنوازد و....

**دەس نیانە پشت چاوا:** واتە کەسێك لە کۆڵ خۆ کردنەوە: کنایە از دک کردن.

**دەس و باڵم بەسیاگە:** برێتی لە دەستەنگ و نەدار: کنایە از تنگدست.

**دەس و پا کردن:** برێتی لە هەوڵ و تەقالا بۆ دەسپێکردنی کارێك: کنایە از کوشیدن برای شروع کاری.

**دەس و دڵ باز:** [واتە سەخییە و دڵ فراوانە]: کنایە از جوانمرد و باسخاوت. (حیرت.۲٦۷)

**دەس و دڵ بازە:** برێتی لە یەکێکی زۆر سەخی و بەخشندەیە (جلال محمود. بەرگی۲. ٦۹): [کنایە از شخص بسیار سخاوتمند و فداکار].

**دەس و دڵ پاکە:** [برێتی لە یەکێکی دڵچاك و بێ گز و گێچەڵ و باوڕ پێ کراو]: کنایە از آدم خوش قلب و مورد اطمینان. (حیرت.۲٦۸)

**دەس و دڵم ئەلەرزێ:** واتە دوودڵ و هەراسانم: کنایە از مردّد و نگران.

**دەس و دڵی ساردەو بووە:** [واتە ناهومێد بووە، پەشیمان بووە]: کنایە از ناامید شدن، پشیمان شدن. (حیرت.۲٦۸)

**دەس و دڵی یەك ناگرێ:** [بۆ ڕاپەڕاندی کارەکەی نەگەیشتووە بە دڵنیایی]: اطمینانش را برای انجام کاری یا امری از دست دادە. (حیرت.۲٦۸)

**دەس و کوتەکە:** واتە زۆر تووڕەیە (جلال محمود. بەرگی۲. ٦۹): [کنایە از آدم بسیار خشمگین].

**دەس وشك:** برێتی لە ڕژد و چنوك: کنایە از خسیس.

**دەس هەڵ پێکان:** برێتی لە کەسێك بە بۆنەی ڕووداوێکەوە خەم و پەژارە دایگرتبێ: کنایە از کسی کە بە علت اتفاقی غمگین و افسردە شدە باشد.

**دەساودەس کردن (دەس بە دەس کردن):** [برێتی لە تەفرەدان و خستنە دوا]: کنایە از معطل کردن. (حیرت.۲٦۲)

**دەست ئەکا بە دەمی شێرا:** بە یەکێك ئەوترێ کە زۆر ئازایە (خاڵ.۲۳۵): [کنایە از آدم بسیار شجاع].

**دەست بان دەست فرەس:** لە ژوور یا سەرەوەی خاوەن

پیشە یا پلەیەك یەکێ‌تر هەیە کە گەلێك لە ئەو شارەزاتر و بەرزترە: همیشە در هر حرفە و پیشەای صاحب نظر و عالم برتری وجود دارد یا بە وجود می‌آید کە از بقیە آگاه‌تر و داناتر است.

**دەست بە ئاو گەیاندن:** برێتی لە چوونە سەر ئاودەست: کنایە از مستراح رفتن. (مەزن.٣١٦)

**دەست بە باڵەوە گرتن:** یارمەتیدان: کنایە از کمك کردن.

**دەست بە دەستادان:** برێتی لە پەشیمانی (خاڵ.ف.١٤٦): [کنایە از پشیمان شدن].

**دەست بە دەمی سەگدا دەکات:** برێتی لە یەکێك کە زۆر بەجەربەزە و بێ‌حیایە: کنایە از فرد بسیار ناآرام و بی‌شرم.

**دەست بە دەمی شێردا ئەکات:** برێتی لە یەکێکی دلێرە چاونەترسە (جلال محمود. بەرگی١. ٢٠٢): [کنایە از شخص شجاع و بیباك].

**دەست بە ژێر باڵیا:** واتە یاری بدە پشتیوانی بە (جلال محمود. بەرگی٢. ٧٠): [کنایە از او را کمك و یاری کن].

**دەست بە رەش و سپییەوە نادات:** برێتی لە یەکێکی بێ‌دەسەڵاتە، هیچ کارێك ناکات (جلال محمود. بەرگی٢. ٧١): [کنایە از آدم ناتوان و تنبل، هیچ کاری را انجام نمی‌دهد].

**دەست بە زاخا کردن:** برێتی لە دەست برین هەڵخەڵەتاندنی یەکێك (خاڵ.ف.١٤٦): [کنایە از فریب دادن و آسیب رساندن].

**دەست بە سەرا گرتن:** برێتی لە داگیرکردنی شتێك (خاڵ.ف.١٤٦): [کنایە از تصرف کردن چیزی].

**دەست بەتاڵ:** برێتی لە مەردومی بێ‌کار (خاڵ.ف.١٤٦): [کنایە از شخص بیکار].

**دەست بەردار:** برێتی لە کەسێك کە دەستی لە کارێك هەڵگرتبێ: کنایە از کسی کە از انجام کاری دست بردارد.

**دەست بەردان:** ١) برێتی لە جیابوونەوەی دووکەس لە یەك: ١) [کنایە از جدا شدن دو نفر از همدیگر]، ٢) وازهێنان لە کارێك (خاڵ.ف.١٤٦): ٢) [رها کردن کاری].

**دەست بەڕووەنان:** برێتی لە جوابدان و ناهومێدکردنی یەکێك کە داوای شتێك لێ بکا (خاڵ.ف.١٤٦): [کنایە از نامید گردانیدن].

**دەست بەستە:** برێتی لە مەردومی دەستخەڕۆ (خاڵ.ف.١٤٦): [کنایە از فریب‌خوردە].

**دەست بەسەرە:** ١) دیلە، لە ژێر چاو دێریدایە. داگیرکراوە (بۆ وڵات) (جلال محمود. بەرگی١. ٢٠٢): [کنایە از اسیر است، تحت نظارت است. غصب شدە است].

**دەست بەستن:** برێتی لە دەستخەڕۆ کردن (خاڵ.ف.١٤٦): [کنایە از فریب دادن].

**دەست بڵاو:** بەخشندە و سەخی: کنایە از بخشندە.

**دەست بڵاو:** ١) برێتی لە کەسێك کە ماڵی خۆی بە فیڕۆ بدا: ١) [کنایە از کسی کە مال و ثروت خود را بە هدر دهد] ٢) برێتی لە یەکێك کە پاشەکەوت ناکات، هەرچی دێتە دەستی خەرجی دەکات (خاڵ.ف.١٤٥)(جلال محمود. بەرگی١. ٢٠١): ٢) [کنایە از کسی کە اندوختە نمی‌کند و هرچە بە دستش می‌رسد خرجش می‌کند].

**دەست بوون:** برێتی لە دەسەڵات و دەست ڕۆیشتن یاخوا هەرگیز زۆردار دەستی نەبێ ١) [کنایە از قدرت و توانمندی] ٢) برێتی لە بەشداربوون لە شتێکا (خاڵ.ف.١٤٦) ٢) [همکاری و دست داشتن در کاری].

**دەست تەنگ:** برێتی لە کەم دەستی، دەست کورت (خاڵ.ف.١٤٧): [کنایە از فقیر، ناتوان].

**دەست خەتی نائومێدیی دایە دەست:** واتە پێی ڕاگەیاند کە کارەکە ناکرێت و چاوەڕێ نەبێت (جلال محمود. بەرگی١. ٢٠٤): [کنایە از بە او اطلاع داد کارش انجام نمی‌گیرد و منتظر نباشد].

**دەست دەست دەناسێت:** واتە شتێکت کە لە دەستی یەکێك گرت دەبێت بیدەیتەوە دەستی خۆی (جلال محمود. بەرگی١. ٢٠٤): [کنایە از هر وقت چیزی را از کسی خواستی باید آن چیز را دوبارە بە خود او پس دهی].

**دەست درێژە:** ١) ناپاکە، زۆردارە: ١) [ناپاك است خائن است و ظالم] ٢) تەماعکارە: ٢) [کنایە از طمع‌کار است] ٣) بە سامانە: ٣) [کنایە از ثروتمند است] ٤) بەدەستەلاتە (جلال محمود. بەرگی١. ٢٠٣): ۴) [قدرتمند است].

**دەست ڕۆییوە:** ١) دارایە: ١) [کنایە از ثروتمند است] ٢) بەدەسەلات و توانایە (جلال محمود. بەرگی١. ٢٠٤): ٢) [کنایە از قدرتمند و تواناست].

**دەست لە پا درێژتر:** بە یەکێك ئەوترێ کە بۆ کارێك بچێ و هەروا بێتەوە: کنایە از کسی کە بە دنبال کاری برود و با دست خالی برگردد.

**دەست لە گونان درێژتر:** واتە هیچی پێ نییە، هیچی دەست نەکەوتووە، نائومێد گەڕاوەتەوە (جلال محمود. بەرگی٢. ٧١): [کنایە از کسی کە چیزی دستگیرش نشدە و ناامید برگشتە باشد].

**دەست لە مل کردن:** ئاشتەوەبوون: کنایە از صلح کردن.

**دەست لێ هەستاندن:** [بریتی لە سەرکەوتن بە سەر کەسێکی‌تردا]: کنایە از بر کسی برتری و تفوق یافتن. (فتاحی قاضی. بەرگی١ .٢. ١٨٢)

**دەست لێکبەردان:** بریتی لە جیا بوونەوەی دووکەس لە یەك بە ئێجگاری (خاڵ.ف.١٤٩): [کنایە از جدا شدن دو نفر بە تمامی].

**دەست نادات:** ١) ناگونجێت: [کنایە از نمی‌گنجد] ٢) بەو نرخە کەمە نافرۆشرێت (جلال محمود. بەرگی١. ٢٠٥): [کنایە از بە آن قیمت کم فروختە نمی‌شود].

**دەست و پێی بەستەوە:** ١) دەرفەتی بڕی: ١) [کنایە از فرصت بە او نداد] ٢) لە کاری خست، دەسەلاتی بڕی: ٢) [کنایە از کار انداختش، قدرتی برای او نگذاشت] ٣) دەستخەڕۆی کرد (جلال محمود. بەرگی١. ٢٠٧): ٣) [کنایە از او را فریب داد].

**دەست و دەمی پێوە ئەخورێت:** بریتی لە خواردنێك کە زۆر خۆش و بەچەشە و تام بێت (جلال محمود. بەرگی١. ٢٠٥): [کنایە از غذای بسیار لذیذ و با طعم و مزە].

**دەست و دلی یەك ناگرێت:** ١) پشتی لە کارەکە ساردە و لە کارەکەدا سستەلّەیە: ١) کنایە از رغبتی بە کارش ندارد و در کارش سست و تنبل است ٢) پەیوەندی پچڕیوە و حەز بەو پەیوەندییە ناکات: ٢) کنایە از ارتباطش را قطع کردە است و تمایلی بە ارتباط ندارد.

**دەست:** بریتی لە دەسەلات، فسیارەکەس (دەستی) هەیە، واتە دەسەلاتی هەیە (خاڵ.ف.١٤٥): [کنایە از قدرت].

**دەستاودەستی پێ دەکات:** ١) دەیخایێنێت: [کنایە از صرف‌وقت می‌کند] ٢) دەیخافلێنێ: [کنایە از فریبش می‌دهد] ٣) دەستی بڕێ (جلال محمود. بەرگی٢. ٧١): [کلاە بر سرش گذاشت].

**دەستبادان:** [بریتی لە یەکێکی ملهوڕ و ستەمکار]: کنایە از زورگویی و قلدری. (فتاحی قاضی.١٨٣)

**دەستبەجێ:** بریتی لە خێرا کارێك کردن: کنایە از سریع کاری را انجام دادن.

**دەستبڕ:** بریتی لە فێڵبازی مەردوم خەڵەتێن (خاڵ.ف.145): [کنایە از نیرنگباز و مردم فریب].

**دەستبرداربوون:** بریتی لە دەست هەڵگرتن (خاڵ.ف.146): [کنایە از دست برداشتن].

**دەستبڕین:** بریتی لە فێڵبازی و مەردوم خەڵەتاندن (خاڵ.ف.145): [کنایە از فریب کاری و کلاهبرداری].

**دەستبڵاو:** 1) بریتی لە کەسێ کە زۆر خرج بکا و نان بدەبێ 2) یان یەکێك کە ماڵی خۆی بە فیڕوو بدا: کنایە از کسی کە ثروت و دارایی خود را مفت از دست دهد.

**دەستت بە شۆن خۆتەوە بێ:** بریتی لە یەکێك کە دەرگا بە شوێنی خۆیدا نابەستێ: کنایە از کسی کە موقعی کە از خانە بیرون رود یا برگردد در را نبندد.

**دەستت بە کەوگیرە و چاوت لە فەقیرە:** واتە ئێستە کە کاربەدەستی ئاگات لێمان بێت (جلال محمود. بەرگی1. 204): [کنایە از این کە حالا کە مسئول هستی بە فکر ما هم باش].

**دەستەئەژنۆ:** 1) بریتی لە کەسێکی خەمبار: 1) [کنایە از شخص غمناک] 2) بریتی لە مەردومی پەك‌کەوتە (خاڵ.ف.150): 2) [کنایە از مردم از کار افتادە و بدبخت].

**دەستە پاچەیە:** بریتی لە یەکێکی بێ دەستەڵات و هیچ لێ نەهاتووە، ئاڵۆزوپەرێشان (جلال محمود. بەرگی2. 70): [کنایە از آدم ناتوان، سراسیمە].

**دەستەشکێنم مەکە:** بە یەکێك ئەوترێ کە بەڵێنێکی پێ دا بێت، واتە بەڵێنەکەت ببەرە سەر (خاڵ.227/ جلال محمود. بەرگی1. 201): [کنایە از خوش عهد و پیمان، بر عهد خود بمان].

**دەستەگوڵی دا بە ئاوا** (ئەمومن.45): [بریتی لە کاری ناشیرین کردن کە ببێتە هۆی بێ‌ئابڕوویی یەکێك لە نێو خەڵکدا: کنایە از انجام گرفتن کاری کە باعث بی‌اعتباری کسی شود].

**دەستەو کەمەر وەستاوە:** بێ‌دەربەسە، دوورەپەرێزە توخنی کارەکە ناکەوێت وەك هی ئەویش نەبێت وایە (جلال محمود. بەرگی1. 202): [کنایە از درست نیست، پرهیز می‌کند و بە کار نزدیک نمی‌شود انگار کە بە او مربوط نیست].

**دەستەونەژنۆ:** بە یەکێکی بێ کار ئەوترێ (خاڵ.227): [کنایە از آدم بیکارە].

**دەستەوسانە:** بریتی لە یەکێکی بێ‌دەسەڵات و بێ‌توانا و دەستەپاچەیە (جلال محمود. بەرگی1. 202): [کنایە از شخص ناتوان و سراسیمە].

**دەستەونەزەر:** بریتی لە یەکێکی چاوەڕێی فەرمان: کنایە از آمادە بودن برای انجام دستور.

**دەستەویەخە:** 1) بریتی لە نزیك بوون: 1) [کنایە از نزدیک بودن]، 2) بریتی لە یەك ئاڵان (خاڵ.ف.319): 2) [کنایە از گلاویز شدن].

**دەستپاکە:** واتە جێی بڕوا و متمانەیە، ناپاکی ناکات دز نییە (جلال محمود. بەرگی1. 203): [کنایە از شخص مورد اعتماد، اعمال بد انجام نمی‌دهد و دزد نیست].

**دەستپانکردنەوە:** بریتی لە سواڵ کردن (خاڵ.ف.146): [کنایە از گدایی کردن].

**دەستپێشخەرە:** بریتی لە یەکێکی گورجوگۆڵە کە زووتر کار دەکات و فریا دەکەوێت (جلال محمود. بەرگی1. 203): [کنایە از آدم سریع کە زود کارها را انجام می‌دهد].

**دەستپێوەنان:** بریتی لە دەربازکردنی یەکێك یا شتێك، بریتی لە ملەو کردنی شتێك یا یەکێك (خاڵ.ف.147): [کنایە از دک کردن].

**دەستدار:** برێتی لە مەردومی دارای بە دەسەڵات (خاڵ.ف.١٤٧): [کنایه از مردم ثروتمند و توانمند].

**دەستڕۆیشتن:** برێتی لە دەسەڵات بە سەر شتێکا (خاڵ.ف.١٤٧): [کنایه از تسلط بر چیزی یافتن].

**دەستڕۆین:** برێتی لە دەوڵەمەندی (خاڵ.ف.١٤٧): [کنایه از ثروتمندی].

**دەستڕەش:** برێتی لە کەسێك لە هەر شتێکی لێوە دستکەوێ فەرێ لێ نابینرێ (خاڵ.ف.١٤٧): [کنایه از کسی که از دستش خیر نبینند].

**دەسترەنگین:** برێتی لە کەسێك بەدەستی خۆی پیشەی جوان بزانێ (خاڵ.ف.١٤٧): [کنایه از مردمی که از انگشتشان هنر بارد].

**دەسەسەرکردن:** [برێتی لە هەڵخەڵەتاندنی یەکێك]: کنایه از کسی را فریب دادن و دنبال چیزی فرستادن. (حیرت.٢٦٩)

**دەستسپی:** برێتی لە کەسێك کە پیشەیەکی وا نەزانێ خۆێ پێ بژینێ (خاڵ.ف.١٤٧): [کنایه از کسی پیشه و هنری نداند که بتواند با آن زندگی کند].

**دەستسپیکردن:** برێتی لە پارەدان (خاڵ.ف.٣١٧): [کنایه از پول دادن].

**دەستسپییە:** بە یەکێك ئەوترێ کە پیشەیەك نازانێ تا پێی بژیی، نەکارە (خاڵ.٢٣٦): [کنایه از آدمی که شغل و حرفه‌ای نداند که با آن معیشت خود را تأمین کند].

**دەستقووچان:** برێتی لە ڕژدی و چرووکی (خاڵ.ف.١٤٨): [کنایه از خست].

**دەستقووچاو:** برێتی لە مەردومی چرووك (خاڵ.ف.١٤٨): [کنایه از شخص خسیس].

**دەستکەلا:** برێتی لە مرۆڤی خۆ لە پێش خەر (خاڵ.ف.٣١٧): [کنایه از کسی که همیشه خود را جلو بیندازد].

**دەستکراوە:** برێتی لە مەردومی دڵ فراوانی بەخشندە (خاڵ.ف.١٤٨): [سخی].

**دەستکردنەوە:** برێتی لە دەست وەشاندن لە جەنگا (خاڵ.ف.١٤٨): [کنایه از ضربه زدن در هنگام جنگ].

**دەستکورت:** برێتی لە مەردومی نەدار (خاڵ.ف.١٤٨): [کنایه از مردم بی‌پول، ندار].

**دەستکورتی:** برێتی لە نەداری (خاڵ.ف.١٤٨): [کنایه از فقیری].

**دەستمان بۆ مەگەرە:** گاڵتەمان پێ مەکە (جلال محمود. بەرگی٢. ٦٩): [کنایه از ما را مسخره مکن].

**دەستندەخۆر:** برێتی لە کەسێك کە چاو لە دەست بێ و نانی بە منەت بخوا: کنایه از کسی که نان با منّت می خورد. (مەزبر.٣٢١)

**دەستنێژ:** برێتی لە یەکێك کە پێت گەیاندبێ و داتمەزراندبێت (خاڵ.ف.١٤٩): [کنایه از کسی که او را بار آورده باشی و سروسامان داده باشی].

**دەستوبردکردن:** [برێتی لە خێرا کردن لە ئیش و کارێکا]: کنایه از به سرعت عمل کردن. (فتاحی قاضی. بەرگی١. ١٨٣)

**دەستوشێن:** برێتی لە شێتێ کە هێرش بۆ خەڵك ببا: کنایه از دیوانه‌ای که به دیگران حمله کند. (مەزبر.٣١٨)

**دەستودوو:** برێتی لە هێز و توانا (لە دەستودوو کەوتوە): کنایه از نیرو و توان جسمی. (مەزبر.٣١٨)

**دەستهەلگرتن:** برێتی لە وازهێنان لە کردارێك یا گوفتارێك (خاڵ.ف.١٥١): [کنایه از دست برداشتن از کاری یا سخنی].

**دەستی ئەسپت درێژ بێت:** بە تەوسەوە، سوپاس لە کەسێك کە منەت بە سەرتا بکا (جلال محمود. بەرگی١.

٢٠٦): [برای طعنه است کنایه از تشکر و سپاس از کسی که بر تو منت می‌گذارد].

**دەستی ئەوی پێوە دێت:** ١) بە هۆی ئەوەوە چاکە و خێری تووش دێت: ١) [کنایه از این که خوبی دستگیرش خواهد شد] ٢) سەر دەکەوێت: ٢) [پیروز می‌شود] ٣) چاك دەبێتەوە (جلال محمود. بەرگی١. ٢٠٦): ٣) [کنایه از بهبود پیدا می‌کند].

**دەستی بۆ برد:** ١) دزی کرد، دژایەتی کرد: ١) [کنایه از او دزدی کرد، و با او مخالفت کرد] ٢) لێی داو ئازاری پێ گەیاند: ٢) [او را زد و رنج و آزار به او رساند] ٣) ناپاکی لە گەڵدا کرد: ٣) [کنایه از به او خیانت کرد] ٤) بە نیازی خراپ پەلاماری ئافرەتێکەی دا (جلال محمود. بەرگی٢. ٧٢): ٤) [با نیت بد زنی را مورد حمله قرار داد].

**دەستی بە دەستدا دا:** ١) پەشیمان بووەوە: ١) [پشیمان شد] ٢) داخی خوارد، ژان چووە دڵییەوە (جلال محمود. بەرگی١. ٢٠٧): ٢) [کنایه از غم و غصه خوردن].

**دەستی بە دەم خۆی ناگەیێ:** ١) واتە چرووکە ٢) هێشتا منداڵە و نان پەیداکەر نییە (جلال محمود. بەرگی٢. ٦٩): ١) [کنایه از خسیس] ٢) [کنایه از بچه است و هنوز نان‌آور نیست].

**دەستی بە رۆن داخدا کرد:** واتە تووشی گاشەی کرد، زیانی پێ گەیاند. فێڵی لێ کرد (جلال محمود. بەرگی٢. ٧١): [کنایه از او را گرفتار آشوب و بلوا کرد و فریبش داد].

**دەستی بە رووەوە نا:** ١) شتەکەی نەدایە: ١) [کنایه از آن چیز را به او نداد] ٢) کارەکەی بۆ جێبەجێ نەکرد (جلال محمود. بەرگی١. ٢٠٧): ٢) [کنایه از این که کارش را درست نکرد].

**دەستی بە ماڵی خۆیەوە نا:** ١) بە زۆر ملی دەستی بە خەرجکردن کرد: ١) [کنایه از به اجبار شروع به خرج کردن کرد] ٢) بە تەوسەوە بە یەکێك دەڵێن کە پارەی کەم خەرج بکات (جلال محمود. بەرگی١. ٢٠٧): ٢) [با طعنه به کسی که پول کم خرج کند می‌گویند].

**دەستی بڕی:** ١) واتە دەستخەڕۆی کرد: ١) [او را فریب داد] ٢) فێڵی لێ کرد (جلال محمود. بەرگی٢. ٧٢): ٢) [کنایه از فریبش داد].

**دەستی بڵاوە:** بە یەکێك ئەوترێ کە هەرچی بێتە دەستی خەرجی ئەکا (خال. ٢٢٨): [کنایه از ولخرج].

**دەستی ترێشتەی (تەشووی) گرتگە:** واتە گەورە بووە و کاری پێ‌دەکرێ (جلال محمود. بەرگی٢. ٦٩): [کنایه از کسی که بزرگ شده و توانایی کار کردن را دارد].

**دەستی پاراست:** ١) سڵی کردەوە: ١) [کنایه از ترسید] ٢) بە پارێزەوە جووڵایەوە، کارەکەی کرد (جلال محمود. بەرگی١. ٢٠٨): ٢) [کنایه از با پرهیز حرکت کرد و کارش را انجام داد].

**دەستی پێ گەرم کردوە:** بە پیاوێك دەڵێن کە ئافرەتێك بۆ ماوەیەك هەڵ بخەڵەتێنێت واتە هەڵی خەڵەتاند (جلال محمود. بەرگی١. ٢٠٨): [کنایه از مردی که زنی را برای مدتی فریب دهد].

**دەستی پێ گەیی:** ١) ئازاری دا، لێی دا: ١) [کنایه از آزارش داد و او را زد] ٢) زیانی پێ گەیاند: ٢) [به او آسیب رساند] ٣) یارمەتی دا (جلال محمود. بەرگی١. ٢١٣): ٣) [کنایه از کمکش کرد].

**دەستی پێدا هێنا:** واتە جوانی کرد و ڕازاندیەوە دەڵێن دەستی بە خۆیا هێناوە (جلال محمود. بەرگی١. ٢١٣): [کنایه

از زیبا و آراستەاش کرد می‌گویند خود را زیبا کرده است].

**دەستی پێوە دەلەرزێت:** برێتی لە بە کار نەهێنان یان خەرجنەکردن لە بەر ڕژدی یا کەمی (جلال محمود. بەرگی۱. ۲۰۸): [کنایە از خرج نکردن یا استفادە نکردن بە علت کمی یا خسیسی].

**دەستی پێوە نا:** ۱) شتەکەی فرۆشت: ۱) [کنایە از آن چیز را فروخت] ۲) زەلامەکەی دەرکرد: ۲) [کنایە از آن مرد را بیرون کرد] ۳) هانی دا: ۳) [کنایە از تحریکش کرد] ٤) ڕای گرت، گرتیەوە (جلال محمود. بەرگی۱. ۲۰۸): ٤) [نگاهش داشت].

**دەستی پێوەیە:** هەمیشە یاری دەدات (جلال محمود. بەرگی۲. ۷۲): [کنایە از همیشە کمکش می‌کند].

**دەستی خۆی قورس کرد:** واتە بە دیاریەوە هاتووە (جلال محمود. بەرگی۲. ۷۲): [کنایە از کسی کە با دست پر و یا سوغات آمده باشد].

**دەستی خۆی وەشاند:** ۱) کارەکەی خۆی باش جێبەجێ کرد، دەست پێشکەریی کرد: ۱) [کنایە از کار خود را بە خوبی روبراه کرد، و دست خود را پیش انداخت] ۲) هەلی لە دەست نەدا (جلال محمود. بەرگی۲. ۷۱): ۲) [کنایە از فرصت را از دست نداد].

**دەستی خێری نایە سەر:** بە تەوەسەوە بە یەکێك دەوترێت کە لە جیاتی ئەوەی کە قازانج بە یەکێك بگەیەنێت زیانی پێ بگەیەنێت (جلال محمود. بەرگی۱. ۲۰۹): [با طعنه بە کسی گفته می‌شود کە بە جای این کە منفعتی یا سودی را بە کسی برساند ضرر می‌رساند].

**دەستی داری گرتووە:** برێتی لە یەکێکی نەخۆش کە خۆش بێتەوە و بەرەو چاکبوون دەڕوات: کنایە از بیماری کە رو بە بهبودی می‌رود.

**دەستی دەستی پێ دەکات:** ۱) دەیخلافێنێت: ۱) [کنایە از سرگرمش می‌کند و فریبش می‌دهد] ۲) دەیخایێنێت (جلال محمود. بەرگی۱. ۲۰۹): ۲) [کنایە از صرف وقت می‌کند و بە تأخیر می‌اندازدش].

**دەستی ڕاست و گیرفانی چەپ:** واتە پیاو پشت بە گیرفانی خۆی ببەستێت و منەتی کەس نەبات (جلال محمود. بەرگی۱. ۲۰۹): [کنایە از شخص باید بە جیب خویش متکی باشد و منت کسی را نبرد].

**دەستی سەگ ماچ دەکا:** ۱) واتە زۆر مەجبوور و ناچارە: ۱) [کنایە از بسیار مجبور و ناگزیر است] ۲) زۆر حەز دەکا جاری وا هەیە بۆ سووکیش ئەمە ئەوترێت (جلال محمود. بەرگی۲. ۷۲): ۲) [کنایە از بسیار آرزو می‌کند گاهی اوقات برای تحقیر است].

**دەستی شەیتان شکێت (بشکێت):** واتە خۆزگە ئەو هەلەم لە دەست نەدایە، ئەو کارەم بکردایە یان ئەو قسەیەم بوتایە و لە بیرم نەچوایە (جلال محمود. بەرگی۱. ۲۱۰): [کنایە از ای کاش آن فرصت را از دست نمی‌دادم، آن کار را می‌کردم یا آن سخن را می‌زدم و از یاد نمی‌بردم].

**دەستی شکاوە:** برێتی لە یەکێك کە پەکی کەوتبێت و بێ دەسەڵات مابێ (جلال محمود. بەرگی۱. ۲۱۰): [کنایە از آدم از کار افتاده و ناتوان].

**دەستی گرت:** ۱) بە پارە یارمەتی دا: ۱) [کنایە از این کە او را با پول کمك کرد] ۲) لە کارەکەیدا کۆمەکی کرد، پشتی گرت بۆ ئەوەی سەرکەوێت (جلال محمود. بەرگی۱. ۲۱۱): ۲) [کنایە از در کارش او را کمك کرد، حمایتش کرد تا پیروز شود].

**دەستی گرتە خەنە:** برێتی لە یەکێك کە کەسێکیتر بخەلەتێنێ و فریوی بدا (رخزادی.۲۰٦): [کنایە از آدمی کە

دیگری را فریب دهد].

**دەستی کەوتە ڕوو:** بڕیتی لە یەکێك لە دەغەڵیی کارەکەی ئاشکرا بێت و فێڵ و تەڵەکەبازییەکەی یان درۆوەکەی دەرکەوێ و ناوی بزڕێ (جلال محمود. بەرگی١. ٢١٠): [کنایه از کسی خلاف و نیرنگش برای دیگران آشکار شود و موجب بی‌آبرویی او در میان مردم شود].

**دەستی لە دڵی نابێتەوە:** بڕیتی لە یەکێکی چرووکە کە دڵی نایەت پارەکەی خەرج بکات، شتێك ببەخشێ (جلال محمود. بەرگی١. ٢١١): [کنایه از شخص خسیس که دلش نمی‌خواهد پولش را خرج کند و یا چیزی را ببخشد].

**دەستی لە دنیا شتووە (شۆردووە):** واتە بە ژیان ڕەشبینە و نائومێدی سواری بووە (جلال محمود. بەرگی١. ٢١١): [کنایه از بدبینانه به زندگی نگاه می‌کند و ناامیدی بر او غلبه پیدا کرده].

**دەستی لە هەموو لایەکەوە بڕاوە:** بڕیتی لە یەکێکی نائومێدە کە کەسی بەدەستەوە نەمابێ، یارمەتی بدات و پشتگیری بکات (جلال محمود. بەرگی١. ٢١٢): [کنایه از آدم ناامید که کسی برایش نمانده تا از او کمک و پشتیبانی بکند].

**دەستی لە یەخەی نابێتەوە:** واتە وازی لی ناهێنێت. لێی ڕزگار نابێت (جلال محمود. بەرگی٢. ٧٢): [کنایه از او دست برنمی‌دارد و از دست او نجات پیدا نمی‌کند].

**دەستی لە یەخەی ناکاتەوە:** تێی ئالاوە و شەڕی پێ دەفرۆشێت. وازی لێ ناهێنێت (جلال محمود. بەرگی٢. ٧٢): [کنایه از به او پیچیده و سرجنگ و دعوا دارد و از او دست برنمی‌دارد].

**دەستی لەگەڵ تێکەڵ کرد:** بڕیتی لە یەکێك کە لە ژێرەوە بە حەرامی لە گەڵ یەکێکیتردا ڕێککەوێت یان جووت بێ (جلال محمود. بەرگی١. ٢١١): [کنایه از کسی که مخفیانه و به حرامی با کسی به توافق و سازش برسد].

**دەستی لێ بەردا:** ١) پشتی تێ کرد: [کنایه از به او بی‌اعتنایی کرد] ٢) وازی لێ هێنا و بەرەڵای کرد (جلال محمود. بەرگی١. ٢١٢): [کنایه از، او دست کشید و رهایش ساخت].

**دەستی لێ بشۆ:** واتە چاوەڕێی مەبە بێتەوە یان ئەنجامێکی باشی ببێت (جلال محمود. بەرگی١. ٢١٢): [کنایه از منتظرش مباش برگردد یا عاقبت خوبی داشته باشد].

**دەستی لێ بشۆرە:** واتە بە تەمای مەبە: کنایه از به هوای چیزی نبودن.

**دەستی لێ سارد بووەوە:** ١) واتە لێی نائومێد بوو: ١) [کنایه از او ناامید شد] ٢) دەستی لێ کێشاوە: واتە وازی لێ هێنا (جلال محمود. بەرگی١. ٢١٢): ٢) [کنایه از دست کشیدن از چیزی یا کسی].

**دەستی ئاگا سەری بخورێنێ** (ئەمومن.٤٧): [بڕیتی لە یەکێك کە زۆر کار ڕژابێتە سەریا، سەری جەنجاڵ بێ: کنایه از کسی که سرش پرمشغله باشد].

**دەستی نەمەکی نییە** (ئەمومن.٤٨): [بڕیتی لە یەکێك کە سەبارەت بە کەسانیتر چاکە بکا بەڵام لە ئاخردا بە پیاو خراپی بزانن: کنایه از کسی که نسبت به دیگران خوبی بکند اما دست آخر هم او را بد جلوه دهند].

**دەستیان بڕیوە:** ١) بڕیتی لە یەکێك کە دەسەڵاتیان نەهێشتبێت: ١) [کنایه از کسی که قدرتی برایش نگذاشته باشند] ٢) هەڵیان فریواندووە بە هەڵەیاندا بردووە (جلال محمود. بەرگی١. ٢٠٥): ٢) [کنایه از فریبش

دادەاند او را به اشتباه انداختەاند].

**دەستیان چۆتە یەکترەوە (یەکترا):** واتە یەکتریان کوشتووە، خوێن کەوتۆتە بەینیانەوە و بوونەتە دوژمنی یەك، خوێنە خوێی یەکتر (جلال محمود. بەرگی۱. ٢٠٦): [کنایه از هم دیگر را کشته‌اند، خون میانشان افتاده و دشمن همدیگر شده‌اند، دشمن خونی همند].

**دەستێکی تەڕی بە قنگیدا هێنا:** هەڵی خەڵەتاند، لە خشتەی برد و فێڵی لێ کرد (جلال محمود. بەرگی۲. ٧٢): [کنایه از فریبش داد و او را از راه بدر برد].

**دەسپەڕ:** برێتی لە ئاوهێنانەوە بە دست: کنایه از جلق زدن.

**دەسپڕ:** برێتی لە کەسێکی دەوڵەمەند و دارا: کنایه از شخص ثروتمند. (مەزڕ.٣١٥)

**دەسگیر:** برێتی لە خەبەر بیستن، زانیاری لە سەر شتێك: کنایه از شنیدن خبر، اطلاع یافتن از چیزی. (مەزڕ.٣١٦)

**دەسمان بە داوێنت ناگات:** بە یەکێك دەڵێن کە دەوڵەمەند بوو‌بێت و پلەوپایەی چووبێتە سەرەوە و لە خۆی رازی بێت یان کەمتر بتوانی ببینی.

**دەسمز:** برێتی لە بەشی دەڵاڵ: کنایه از مزد دلال. (مەزڕ.٣٢١)

**دەسمی بڕی:** [برێتی لە یەکێك کە بێ بەڵێنی کردبێ]: کنایه از کسی که بدقولی کرده باشد. (حیرت.٢٦٧)

**دەسمی گرتە خەنە:** فێڵی لێ کردم (جلال محمود. بەرگی۲. ٦٩): [کنایه از ما را فریب داد].

**دەسمی کردگە بە ڕۆن داخا:** [واتە تووشی کارێکی پڕ لە مەترسی کردم زیانی پێ گەیاندم و فێڵی لەگەڵ کردم]: کار پرخطری را به من واگذار کرد. (حیرت.٢٦٧)

**دەسی ئەچێتە گیرفانیا:** برێتی لە یەکێك ئیش و کارێکی پەیدا کردبێ و خەرجی خۆی پەیا بکا: کنایه از کسی که بتواند مخارج زندگی خود را خود تأمین کند.

**دەسی بۆ بردن:** دەست لە قوون دانی کەسێ: کنایه از انگلک کردن.

**دەسی شەیتانی لە پشتەوە بەستگە:** برێتی لە یەکێك کە لە شەیتان شەیتانتر بێ (جلال محمود. بەرگی۲. ٦٩): [کنایه از کسی که از شیطان هم حقه‌بازتر باشد].

**دەسی چووە بە خوێن خویا:** واتە تەمێ بووە و جارێکیتر کاری وا ناکات (جلال محمود. بەرگی۲. ٧٠): [کنایه از تنبیه شده است و بار دیگر چنین کاری را انجام نمی‌دهد].

**دەسی گرتە خەنە:** برێتی لە فریودانی کەسێك (رخزادی.٢٠٦): [کنایه از فریب دادن کسی].

**دەسی کرد بە زاخا:** واتە یەکێکی دەسەخەڕە کرد (رخزادی.٢٠٥): [کنایه از علاف کردن کسی].

**دەسی لە دنیا داشۆردگە:** برێتی لە کەسێك کە نائۆمید بووبێ و ژینی لە دەس دابێ (رخزادی.٢٠٦): [کنایه از نامید شدن در زندگی].

**دەسی لە عەلی و عومەر بڕیا:** برێتی لە یەکێك کە هەموو دەرگایەکی لێ داخرابی یان بەسترا بێ (جلال محمود. بەرگی۲. ٧٠): [کنایه از کسی که تمام درها به رویش بسته شده باشد].

**دەسی ناگەیێ بەرێ** (ئەمومن.٧٥): [برێتی لە یەکێك کە کاری زۆر بێ و سەرجەنجاڵ بێ: کنایه از آدم پرمشغله].

**دەسی نیا خەنە:** برێتی لە فریودان و خەڵەتاندنی کەسێك: کنایه از کسی را فریب دادن.

**دەسی نیا کاسە:** ١) برێتی لە خەڵەتاندنی یەکێك و دەسخەڕە کردنی: ١) [کنایه از او را فریب داد] ٢) یەکێکی نائومێد کرد (جلال محمود. بەرگی۲. ٧٠/ رخزادی.٢٠٧): ٢) [کنایه از ناامید کردن کسی].

**دەسی هەڵپێکیاگە:** بێ ئیش و کار و داماوە (جلال محمود. بەرگی۲. ۷۰): [کنایه از شخص بیکار و درمانده].

**دەسیان ها لە کاسەیەکدا:** بریتی لە دوو یا چەند کەسی هەڤاڵ و هاوڕێ کە پێکەوە کارێکیان کردبێ: کنایه از با هم همراه و همدست بودن دو یا چند نفر.

**دەسیم خوێندەوە:** بریتی لە بیروبڕوای نهێنی کەسێك تێگەیشتن: کنایه از قصد پنهان کسی را دریافتن و به غرض کسی پی‌بردن.

**دەچێتە دڵەوە:** بریتی لە مروڤێك کە شێوەی شیرینە، خوێن گەرمە. بە دڵی ئەو کەسەیە (جلال محمود. بەرگی۲. ۶۸): [کنایه از آدم تو دل برو و خون‌گرم و خوش‌برخورد].

**دەفژەنە:** زمان درێژە، پڕوپاگەندەچییە (جلال محمود. بەرگی۲. ۷۳): [کنایه از زبان دراز، سخن‌چین است].

**دەفی دەنگ نادات:** ۱) بریتی لە کەسێك کە لە بەر هەندێ تێبینی لەو بارەوە قسەی پێ‌ناکرێ: ۱) [کنایه از شخصی که به خاطر بعضی ملاحظات نمی‌تواند حرفی بزند] ۲) بریتی لە یەکێك کە کەس بە قسەی ناکات و قسەی لای کەس ڕەواجی نییە (ریخزادی.۲۰۷)/(جلال محمود. بەرگی۲. ۷۳): ۲) [کنایه از کسی که به حرف او گوش نمی‌دهند و سخنش رواجی ندارد].

**دەڵەسەگ گۆچی (گوشی) کردگە:** بریتی لە یەکێك کە باش پەروەردە نەکرا بێت (جلال محمود. بەرگی۲. ۷۳): [کنایه از کسی که خوب پرورده نشده باشد].

**دەڵی سەرتوونکان:** [بریتی لە ژنی قەرەچناخ و بێ ئابڕوو]: کنایه از زن بی‌حیا. (فتاحی قاضی. بەرگی۱. ۲۱۰)

**دەم ئەوەشنێ:** بریتی لە یەکێك کە جنێو و شتی ناشیرینی زۆر دەڵێ (جلال محمود. بەرگی۲. ۸۱): [کنایه از کسی فحش و ناسزای زشت می‌گوید].

**دەم بە هاوارە:** بریتی لە یەکێکی بێ‌وورە و ترسەنۆکە، لە هەموو شتێکدا هاواری لێ هەڵدەستێ (جلال محمود. بەرگی۱. ۲۵۲): [کنایه از آدم بی‌روحیه و ترسو که در انجام هر چیزی فریادش بلند می‌شود].

**دەم تەڕکەرە:** بریتی لە میوە و تەڕەکاری: کنایه از میوه و تره‌بار. (مەزەر.۳۲۷)

**دەم تێ ژەنەن:** بریتی لە خەرجی زیاد کردن لە دارایی: کنایه از اسراف در خرج. (مەزەر.۳۲۷)

**دەم پاراو:** واتە قسەزان و زمان لووس (جلال محمود. بەرگی۱. ۲۵۳): [کنایه از آدم سخندان و زبان‌چرب].

**دەم داچەقاندن:** بریتی لە مردن (خاڵ.ف.۲۲۷): [کنایه از مرگ].

**دەم دڕیاگە:** [بریتی لە یەکێکی فرەوێژ و بێ شەرم و جنێوفرۆش]: کنایه از آدم پرحرف و پرچانه و بی‌آزرم و دشنام‌گوست. (حیرت.۲۷۳)

**دەم ڕەشە:** واتە نوقڵانەی خراپ لێ دەدات و قسەکانی چاك ناهێنێت (جلال محمود. بەرگی۱. ۲۵۳): [کنایه از کسی که سخنانش بدیمن و بدشگون است].

**دەم شڕە:** ۱) [بە یەکێکی بێ شەرم و جنێوفرۆش دەڵێن]. ۲) [بریتی لە یەکێکی دەمنەوێسیاگ]: کنایه از آدم بی‌شرم و ناسزاگو، کنایه از آدمی که رازدار نیست. (حیرت.۲۷۳)

**دەم چەوتە (چەفتە):** واتە قسەنەزان و دەم بە تاڵ و بڕوا بە قسەی ناکرێت، کەس بە قسەی داناکەوێت (جلال محمود. بەرگی۱. ۲۵۳): [کنایه از آدم کج‌دهن و ساده‌لوح که کسی به حرف او گوش نمی‌دهد].

**دەم و دەستی یەك ناگرێت:** ناڕاستە، ئەوەی بە دەم دەیڵێت، بە کردووە ئەوە ناکات (جلال محمود. بەرگی۱. ۲۵٤):

[کنایه از ریاکار که گفتار و اعمالش یکی نیست].

**دەم و چاوی داکەوتووە:** برێتی لە یەکێك کە چاخی و قەڵەوییەکەی جارانی نەمابێت و لاواز بووە، چرچ و لۆچ کەوتووەتە ڕووی (جلال محمود. بەرگی١. ٢٥٥): [کنایه از کسی که لاغر شده و صورتش چروکیده].

**دەم و لووتی بەیەکدا داوە:** واتە دڵکەسەر و خەمینە (جلال محمود. بەرگی١. ٢٥٥): [کنایه از کسی که پکر و غمگین است].

**دەم هەڵپچران:** برێتی لە قسە دەست پێ کردن: کنایه از شروع به سخن گفتن کردن. (مەزبر.٣٢٨)

**دەم یەك نیان:** برێتی لە مردن: کنایه از مرگ. (مەزبر.٣٢٨)

**دەماخ بەرزە:** ١) کەیفی هەیە و جیهان بە دڵی ئەوە: ١) [کنایه از کسی که شاد است و دنیا به کام اوست] ٢) بە فیز و دەعیەیە (جلال محمود. بەرگی٢. ٨١): ٢) [کنایه از آدم متکبر].

**دەماختەختکردن:** برێتی لە بە خۆشی ڕابواردن: کنایه از به کام دل گذراندن.

**دەماخشکاندن:** برێتی لە لووتدان و نەهێشتنی کەیف و خۆشی یەکێك (خاڵ.ف.١٥٨): [کنایه از به ذوق کسی زدن].

**دەماخی سازە:** ١) واتە دڵی خۆشە و لە سەر هەوەسە: ١) [کنایه از دل خوش و شاد است] ٢) کارەکەی بۆ ساز بووە (جلال محمود. بەرگی١. ٢٥١): ٢) [کنایه از این که کارش انجام گرفته].

**دەماخی شکاند (لە دەماخی دا):** لە خۆشی خست، تیزی پێ کرد و لووتی هێنایەوە بەر خۆی بەوەی کە قسەی پێ وت و چوو بە گژیدا (جلال محمود. بەرگی١. ٢٥١): [کنایه از شادی انداختن و مسخره و تنبیه کردن].

**دەمار دەرهاتن:** ١) برێتی لە تێداچوون و بە یەکجاری لە ناوچوون: ١) کنایه از تار و مار شدن، دمار از روزگار کسی درآمدن ٢) برێتی لە تین پێگەیین و تەنگەتاوبوونی مەردوم لە شتێکەوە: (بە دەست منالەوە دەمارم دەرهات): ٢) کنایه از تحت فشار قرار گرفتن مردم. (مەزبر.٣٢٦)/(خاڵ.ف.٣٢٦)

**دەماری دەرهێنا:** ١) تۆڵەی خۆی لێ کردەوە: ١) [کنایه از انتقام خود را از او گرفت] ٢) بە سەریدا زاڵ بوو: ٢) [کنایه از بر او مسلط شد] ٣) کارەکەی جێبەجێ کرد (جلال محمود. بەرگی١. ٢٥١): ٣) [کارش را انجام داد].

**دەماری زلە:** برێتی لە یەکێکی بەفیز و لووتبەرزە (جلال محمود. بەرگی٢. ٨١): [کنایه از شخص متکبر است].

**دەماڵیدا نییە دانەی بروێشێ/ بە بێ دەرپێ چۆپی دەکێشێ:** واتە مرۆڤێکی بەرەڵایە و هەست بە پێویستی ڕەنج و تەقالا ناکات و هەر خەریکی هەڵەکەسەمایەتی (جلال محمود. بەرگی٢. ٨١): [کنایه از آدم لاقیدیست که برای زندگیش تلاش نمی‌کند و خود را به کارهای بیهوده سرگرم می‌کند].

**دەمت بوێسێ:** [واتە قسە لە دڵتا ڕابگرە و نهێنیەکان مەدرکێنە]: کنایه از رازدار باش. (حیرت.٢٧٣)

**دەمتاڵ:** برێتی لە کەسێك کە زۆر قسە دەکا (خاڵ.ف.١٥٩): [کنایه از زیاد حرف زدن، وراج].

**دەمەتەقێ کردن:** پێکەوە بە قسە ڕادەبوێرن (جلال محمود. بەرگی١. ٢٥٢): [کنایه از گپ زدن].

**دەمەتەقێ:** برێتی لە قسە و گوفتوگۆ کردن بۆ ڕابواردن (خاڵ.ف.١٦١): [کنایه از محاورەی بین دو نفر به منظور شوخی].

**دەمتەڕ:** ١) برێتی لە زمان لووس، یەکێك کە بە قسە

خەڵك فریو بدا: ١) [کنایە از چرب زبانی]. ٢) بریتی لە یەکێك کە هەر بە دەم پیاوەتی بکا (فسیارکەس (دەم تەڕ)ی کاسە وشکە) (خاڵ.ف.١٥٩): ٢) [کنایە از دهندەی بی‌عمل].

**دەمتەڕکەرە:** بریتی لە میوە و هەرچی دەم تەڕ بکا (خاڵ.ف.١٥٩): [کنایە از میوە و ترەبار].

**دەمتەڕکردن:** ١) خواردنی میوە و شتی وا ٢) بریتی لە نهێنی درکاندن ١) کنایە از میوە خوردن ٢) کنایە از رازی را افشا کردن. (مەزیر.٣٢٦)

**دەمەداچەقێ:** بریتی لە یەکێکی نزیکەو مەرگ: کنایە از کسی کە بە مرگ نزدیک شدە باشد. (مەزیر.٣٢٧)

**دەمەلاسکەیەتی:** بە گاڵتە پێ کردن و سوککردنەوە لاسایی ئەم و ئەو دەکاتەوە (جلال محمود. بەرگی١. ٢٥٢): [کنایە از بە شوخی یا مسخرە ادای کسی را درآوردن].

**دەمپیس:** بریتی لە مەردومی جنێوفرۆش. (خاڵ.ف.١٥٩)

**دەمخاو:** بریتی لە کەسێك کە شل و ولە لە قسە کردندا: کنایە از کسی کە در گفتار سست است.

**دەمدان:** بریتی لە، لەوەڕینی کەمی ئاژاڵ (ئاژاڵەکان بەر بدە با دەمێك بدەن) (خاڵ.ف.١٦٠): [کنایە از کم چریدن حیوان].

**دەمدەمییە:** [بریتی لە یەکێکی دوودڵ و ڕاڕایی]: کنایە از آدم مردد و هرهری مذهب. (حیرت.٢٧٣)

**دەمدراو:** بریتی لە یەکێك کە قسە لە دەمیا نەوەستێ (خاڵ.ف.١٦٠): [کنایە از دهن لق].

**دەمدروون:** لە دەمکوتکردنی یەکێك (خاڵ.ف.١٦٠): [کنایە از کسی را وادار بە خاموشی کردن].

**دەمدرێژ:** بریتی لە مەردومی درێژدادڕی بێ شەرم (خاڵ.ف.١٦٠): [کنایە از مردم وراج و پر گو].

**دەمڕاس:** بریتی لە کەسی باوڕ پێ کراو کە قسەی ئاخر دەکا: کنایە از شخص مورد اعتماد کە حرف آخر را می زند.

**دەمڕاستبوونەوە:** بریتی لە دەوڵەمەندبوون و تێرخواردنی یەکێك لە پاش برسیەتی و هەژاری (خاڵ.ف.١٦٠): [کنایە از ثروتمند شدن کسی بعد از فقیری و تنگدستی].

**دەمڕەش:** بریتی لە یەکێك کە هەر نوقڵانەی خراپ لێ بدا و شووم بێ (خاڵ.ف.١٦٠): [کنایە از شخصی کە گفتارش نحس است].

**دەمڕووت:** بریتی لە پیاوی منالکاری بێ نموود کە شەرمی لێ نەکرێ (خاڵ.ف.١٦٠): [کنایە از جوان بی‌نمودی کە بە حدی نرسیدە کە احترام او واجب باشد].

**دەمسپی:** ١) بریتی لە پیاوی قسەڕەوا کە شەرمی لێ بکرێت: ١) [کنایە از آدم حسابی کە احترام او واجب است] ٢) بریتی لە کەسێك کە خێرخوای خەڵك بێ (خاڵ.ف.١٦٠): ٢) [کنایە از آدم خیرخواە].

**دەمسوور:** بریتی لە یەکێك کە پشتئەستوور بێ لە کارێکا (خاڵ.ف.١٦٠): [کنایە از شخصی کە در انجام کاری پشتگرم باشد].

**دەمچەفت:** بریتی لە کەسێك کە قسە بە دمیاوە ناوێسێت و قسەی خراپ ئەکات: کنایە از کسی کە دهنش قفل و بست ندارد و بددهن است.

**دەمچەوت:** بریتی لە یەکێك کە قسەی بایەخی نەبێ و بەگوێی نەکەن (خاڵ.ف.١٥٩): [کنایە از مردم بی ارزش و سادەلوح کە کسی بە حروف او گوش ندهد].

**دەمچوونە کلیلە:** بریتی لە بەسترانی دەم و نەکرانەوەی لە ترسانا (خاڵ.ف.١٥٩): [کنایە از از ترس حرف نزدن].

**دەمگەرم:** بریتی لە مەردومی قسەزان (خال.ف.١٦٠): [کنایە از شخص ناطق، سخنران ماهر].

**دەمگرتن:** بریتی لە ڕووشکان و قسەکردنی بە بێ شەرم (خال.ف.١٦٠): [کنایە از سخنان بی‌شرمانە بە زبان آوردن].

**دەمگرتنەوە:** بریتی لە خۆگێڕانەوە لە خواردن (خال.ف.١٦٠): [کنایە از پرهیز از خوراک، رژیم غذایی].

**دەمکوتی کرد:** ١) واتە لە قسەی خست بێ دەنگی کرد: ١) [کنایە از سخن انداختن و ساکت نمودن کسی] ٢) بە درۆی خستەوە: ٢) [کنایە از بی‌اصل بودن سخنان او را اثبات کرد] ٣) قایلی کرد (جلال محمود. بەرگی١. ٢٥٤): ٣) [کنایە از راضیش کرد].

**دەملەقە:** بریتی لە یەکێکی دەم نەوێسیاگ کە قسەی هەڵیت و پەڵیت دێتە سەرزاری: کنایە از آدمی کە رازدار نیست.

**دەملێکنان:** بریتی لە مردن و هەناسەبڕان (خال.ف.١٦١): [کنایە از خاموش شدن و مردن].

**دەمم داکەفت:** زۆر قسەم کرد. [ئەوندە قسەم لە گەلی کرد دەمم داکەفت]: کنایە از بسیار حرف زدن. (جلال محمود. بەرگی٢. ٨١/ حیرت.٢٧٣)

**دەموپل:** بریتی لە قسەڕەوانی، فسیارکەس بەدەموپلە (خال.ف.١٦١): [کنایە از آدم فصیح].

**دەمودەس:** [بریتی لە دەسبەجێ و خێرا]: کنایە از فوری، آنی. (حیرت.٢٧٤)

**دەمودەست:** واتە کوتوپڕ، خێرا (جلال محمود. بەرگی١. ٢٥٤): [کنایە از ناگهان و فوری].

**دەمودوو:** بریتی لە قسە و گوفتوگو، بەدەم و زوان فسیارکەس (دەمودوو)ی خۆشە (خال.ف.١٦١): [قوّت بیان، زرنگی].

**دەمهەراش:** واتە بە دەم و زمانە، بە قسە کەس نایبەزێنێ. بە دەم و زمانە بۆ قسە دانامێنێت (جلال محمود. بەرگی٢. ٨٢): [کنایە از پرحرف و وراج است و در سخن گفتن کسی حریف او نمی‌شود].

**دەمی بۆی شیری لێ تێ:** [بۆ سووکی دەڵێن: بریتی لە منداڵبوون]: کنایە از هنوز بچە است و بی‌تجربە. (حیرت.٢٧٤)

**دەمی بەربوو:** ١) بریتی لە یەکێك کە بکەوێتە قسە و زۆری لە سەر بڕوات: [کنایە از کسی کە شروع بە حرف زدن بکند و طولش دهد] ٢) بریتی لە یەکێك کە بەپارێز یان بەرۆژوو بێت و دەسکاتە خواردنی زۆر (جلال محمود. بەرگی١. ٢٥٥): [کنایە از کسی کە پرهیز داشتە باشد یا روزە باشد و شروع بە خوردن غذای بسیار بکند].

**دەمی بێ تەقەڵە:** [واتە دەم نەوێسیاگە]: کنایە از آدم رازداری نیست. (حیرت.٢٧٤)

**دەمی تەڕە:** واتە زمان لووسە (جلال محمود. بەرگی٢. ٨٢): [کنایە از چرب‌زبان].

**دەمی تێ بەردا:** واتە هانی دا بە گژیدا بچێت و قسەی پێ بڵێت: (جلال محمود. بەرگی١. ٢٥٦) [کنایە از تحریکش کرد کە با او گلاویز شود و حرف بد بزند].

**دەمی پان دەکاتەوە:** بریتی لە یەکێك کە هەمیشە پێدەکەنێت (جلال محمود. بەرگی١. ٢٥٦): [کنایە از کسی کە همیشە می‌خندد].

**دەمی پڕ لە خوێنە:** بە یەکێك ئەوترێ کە خۆشەویستێکی مردبێ یان ڕازێکی سەختی لە دڵدایە (خال.٢٤٣): [کنایە از کسی کە عزیزی را از دست دادە باشد].

**دەمی دا بە چەرخا:** واتە دەستی کرد بە هەراو قسە یا

جنێو: کنایه از شروع به حرافی یا فحاشی نمود.

**دەمی دا بە یەکا:** واتە مرد و گیانی دەرچوو (خال.٢٤٤): [کنایه از مردن].

**دەمی سووتیا:** [واتە بێ بەش و بێوەری بوو]: کنایه از محروم و بی‌نصیب شده. (حیرت.٢٧٥)

**دەمی شیرین کرد:** واتە بەرتیلی دایە و قایلی کرد. خزمەتی کرد (جلال محمود. بەرگی١. ٢٥٨): [کنایه از رشوه داد و راضیش کرد. خدمتش کرد].

**دەمی چۆتە کلیلە:** بە کەسێك ئەوترێ قسەی بۆ نەکرێ چ لە بەر نەخۆشی بێ یان لە بەر شتێکی‌تر بێ (خال.٢٤٣): [کسی که نتواند حرف بزند].

**دەمی چووە بە خوری خۆیا:** بریتی لە یەکێك کە زۆر رژد و لەچەر بێ (خال.٢٤٤): [کنایه از خسیس].

**دەمی چووکە بۆ گیلاخە خواردن:** بەهۆی نەخۆشییەوە زۆر لاواز بووە (جلال محمود. بەرگی٢. ٨٢): [کنایه از بسیار لاغر شده است].

**دەمی چووگە بە ئاوکولانگا** (مریوخ.١٠): [بریتی لە یەکێك کە لە کارێکا یا رووداوێکا چزیابێ و ژیریان کردبێ: کنایه از مار گزیده، کسی که در کاری بد آورده و تنبیه شده باشد].

**دەمی گۆ ناکا (لەگۆ نییە):** واتە بە ڕەوانی قسەی بۆ ناکرێ (خال.٢٤٤): [کنایه از کسی به روانی و فصاحت نتواند صحبت کند].

**دەمی گرتووە:** واتە فێری قسەی خراپ بووە. فێری دەمدرێژی بووە (جلال محمود. بەرگی٢. ٨٣): [کنایه از کسی که شروع به گفتن سخنان نابهنجار و بد کرده باشد].

**دەمی قووچیا:** واتە لە فرەوێژی کەوت: کنایه از وراجی و پرحرفی افتاد.

**دەمی کەف ئەچەرێنێ:** بریتی لە یەکێکی تووڕەیە کە دەروونی ورووژاوە و قسەی زۆر ئەکات (جلال محمود. بەرگی١. ٢٥٨): [کنایه از شخص عصبانی است که بسیار خشمگین شده و حرف زیاد می‌زند].

**دەمی کرەهای گەرمکە:** بریتی لە یەکێك کە بە تەمای قسەی بن و نەیکا. دەڵێن خۆ دەمت بە کرێ نییە بۆ قسە ناکەیت (جلال محمود. بەرگی٢. ٨٣): [کنایه از کسی که منتظر باشند سخن بگوید ولی او حرف نزند می‌گویند چرا سخن نمی‌گویی زبانت که کرایه نمی‌خواهد].

**دەمی کێشاوە:** بریتی لە ئامادە بوونی پلاو، سازبوونی چایی (جلال محمود. بەرگی١. ٢٥٨): [کنایه از آماده شدن پلو، دم کشیدن چایی].

**دەمی لێ بەر بوو:** بریتی لە یەکێك کە بکەوێتە شەڕە قسە و پەرچدانەوەی یەکێکی‌تر و جنێوی پێ بدا (جلال محمود. بەرگی٢. ٨٣): [کنایه از کسی که شروع به جنگ لفظی و مقابله با کسی دیگر نماید و به او بد و بیراه بگوید].

**دەمی لێ بەرەڵا کردووە:** ١) بریتی لە یەکێك کە دەم ناپارێزیت و هەموو خواردنێك دەماشێتەوە: ١) [کنایه از کسی که پرهیز نمی‌کند و همه غذایی را می‌خورد] ٢) هانی داوە کە قسە بەو بلێت (جلال محمود. بەرگی١. ٢٥٨): ٢) [کنایه از تحریکش کرده که به او سخن زشت بگوید].

**دەمی لێ کردوە:** زمانی گەزارە بوو، قسەی پێ وت. بە زمان هێرشی بردەسەری، هانی دا قسەی پێ بلێت (جلال محمود. بەرگی١. ٢٥٨): [کنایه از زبان درازی کردن تحریک نمودن برای گفتن سخنان زشت].

**دەمی لێك نا:** ١) بێ دەنگ بوو: ١) [کنایه از ساکت ماند] ٢) مرد (جلال محمود. بەرگی١. ٢٥٨): ٢) [کنایه از

مردن].

**دەمی مردووە:** برێتی لە خواردەمەنی یا چاییەك کە سارد بوویێتەوە: کنایە از غذا یا چایی کە سرد شدە باشد.

**دەمی نەکردوە:** برێتی لە یەکێك کە سەبارت بە شتێك بێدەنگ بێ و هیچ نەڵێ: کنایە از ساکت ماندن و مهر سکوت بر لب زدن.

**دەمی ها لە ناو خوێنا:** [واتە تازیەتبارە]: کنایە از آدم عزادار. (حیرت.٢٧٦)

**دەنگ دەرهاتوو:** [برێتی لە یەکێکی چەنەباز و بێ شەرم و قەرەچناخ]: کنایە از پرحرف گستاخ و پرچانە. (حیرت.٢٧٦)

**دەنگدران:** برێتی لە زۆر هاوار کردن (خاڵ.ف.١٦٣): [کنایە از فریاد با صدای بلند].

**دەنگی برا:** ١) لەناوچوون، فەوتان: ١) [کنایە از از بین رفتن و نابود شدن] ٢) دەمکوت کرا: ٢) [سرکوبش کرد] ٣) ون بوو (جلال محمود. بەرگی١ .٢٥٩): ٣) [گم شد].

**دەنگی دێت:** برێتی لە یەکێك کە لە گەڵ یەکێکیتردا شەرپەتی و تووڕە بووە (جلال محمود. بەرگی١. ٢٦٠): [کنایە از کسی کە با شخص دیگری جنگ و دعوا دارد و خشمگین و عصبانی شدە است].

**دەوەن بە ئاش:** برێتی لە قسە و گوفتوگۆکردنێکی بێ هوودەو زۆر لە سەر شتێك (خاڵ.٢٤٦): [کنایە از گفتگوی بیهودە و بی ارزش دربارەی چیزی].

**دەور هەڵگرتن:** برێتی لە تووڕەبوون. کنایە از عـصبانی شدن.

**دەوڵی دەنگ نادا:** [برێتی لە یەکێك کە قسەی بایەخی نەبێ و لە دەسەڵات کەوتبێ]: کنایە از آدم بی‌قدرت. (فتاحی قاضی. بەرگی١ .٢٠٩)

**دەوڵی دڕیاگە:** برێتی لە یەکێك کە ئابڕووی چووبێ: کنایە از کسی کە اعتبار و حیسیتش از بین برود

**دەهۆڵ دان:** برێتی لە مرۆڤی زگ زل: کنایە از آدم شکم گندە. (مەزهەر.٣٣٠)

**دەهۆڵ دڕان:** برێتی لە ئابڕوو چوون و ناوزڕان: کنایە از رسوا شدن. (مەزهەر.٣٣٠)

**دەهۆڵ کوت:** برێتی لە یەکێك کە زۆر حەز لە بڵاوکردنەوەی باسوخواس بکات یا درۆ و هووشە بکات (جلال محمود. بەرگی١ . ٢٦٠): [کنایە از کسی کە میل بە فضولی و خبرچینی داشتە باشد یا دروغگو و خودستا باشد].

**دەهۆڵ لێدەرە:** ١) پڕوپاگانتەچییە، قسەهاوەروبەرە: کنایە از هوچی و سخن‌چین ٢) درۆزنە، فیشالکەرە: دروغگوست، لاف‌زن است.

**دەیپالێوێت:** واتە مەرایی دەکات (جلال محمود. بەرگی١. ٢٦٠): [کنایە از تملق می‌کند].

**دەیگرێتە ئەستۆی خۆی:** برێتی لە یەکێك کە دەچێتە ژێر باری کارێك و گفتی ڕاپەراندنی دەدات (جلال محمود. بەرگی١ .٢٦١): [کنایە از کسی کە انجام کاری را می‌پذیرد و تعهد انجام آن را می‌دهد].

**دیان تیژ کردن:** برێتی لە تەماح کردن لە شتێك: کنایە از طمع ورزیدن بە چیزی. (مەزهەر.٣٣١)

**دیان خێری پێیا نانێن:** بە یەکێك ئەوترێ کە چاکەی نایەژن (رەخزادی.٢١١): [کنایە از کسی کە نام او را بە نیکی نبرند].

**دیان چەرمگ بوون:** دان سپی بوونەوە: کنایە از پر رو شدن. (مەزهەر.٣٣١)

**دیانم لێ تیژ ئەکاتەو:** واتە هەڕەشەم لێ ئەکات: کنایە از مرا تهدید می‌کند.

**دیانم لێ چیڕ ئەکاتەوە:** ١) [واتە هەڕەشەم لێ ئەکات] ، ٢) [واتە گاڵتەم پێ دەکات]: ١) کنایە از تهدید ٢) کنایە از مسخره کردن. (حیرت.٢٧٨)

**دیانی تیژەو کردگە:** خۆی مڵاز داوە بۆ بردن یان ڕفاندنی چتێك (رخزادی.٢١٢): [کنایە از کمین کردن برای بردن یا ربودن چیزی].

**دیانی پیا نانێ:** بە یەکێك ئەوترێ کە ڕاستی نایەژێ (رخزادی.٢١٢): [کنایە از اعتراف نکردن].

**دێزە بە کۆڵ:** برێتی لە کەسێك کە خاوەنی ماڵ و منداڵ یا دارایەکی زۆر بێ (خاڵ.٢٥٠): [کنایە از کسی کە دارای خانوادە و ثروتی زیاد باشد].

**دێزە بەدەر خونە:** برێتی لە پۆشینی سڕ: کنایە از پوشیدن راز. (معزر.٣٢٣)

**دێزەی دوو قوڵفی** (ئەمومن.١١٦): [برێتی لە یەکێکی بەخۆ و قەڵەوبووگ: کنایە از آدم چاق].

**دیق کردن:** برێتی لە مردن لە بەر خەفەتی زۆر: کنایە از مرگ بە علت غصە بسیار. (معزر.٣٢٣)

**دیق:** برێتی لە خەمی زۆر: کنایە از غم جانکاه. (معزر.٣٢٣)

**دێڵەدڕ:** برێتی لە ژنی زمان درێژی بێ شەرم: کنایە از زن سلیطە. (معزر.٣٢٤)

**دین ئەفرۆشێ بۆ دینار:** [بە یەکێکی ماڵخۆشەویست و دنیاپەرس دەڵێن]: کنایە از آدم مادی است. (حیرت.٢٨٠)

**دێو دەهۆڵ پا** (ئەمومن.١١٦): [برێتی لە یەکێکی قەڵەو: کنایە از آدم چاق].

ر

**ڕاست نەبێتەوە:** بریتی لە دۆعا و نزای شەڕی یەکێك بکەیت و ڕازی بی بە مردنی (جلال محمود. بەرگی۲. ۹۰): [کنایە از دعای شر کسی را کردن و راضی بە مردنش بودن].

**ڕاست و چەپی کرد:** بریتی لە گرفتار کردنی یەکێك (جلال محمود. بەرگی۲. ۹۰): [کنایە از گرفتار کردن کسی].

**ڕاکێشاو:** بریتی لە گیانداری درێژی بەقەڵافەت (خال.ف.۱۷۵): [کنایە از موجود بلندقد و تنومند].

**ڕاوەڕێوی:** بریتی لە پێچ و پەنا هێنانەوە لە کاروباردا (خال.ف.۱۷٦): [کنایە از کلک زدن و بهانە آوردن در انجام کار].

**ڕاووڕووت:** واتە زۆرداری کردن و ماڵی ئەم و ئەو بە فێڵ و زۆر خواردن. واتە ڕاوکردنی مەردوم و ڕووتکردنەوەی (جلال محمود. بەرگی۱. ۲۸۰): [کنایە از راهزنی و مردم لخت کردن].

**ڕاووڕێوی بۆ هێنایەوە:** ڕێوی چۆن لەگەڵ ڕاوکەردا بەپێچوپەنایە و خۆی بەدەستەوە نادات واتە: ئەویش بیانووی درۆ و کەڵەك و پێچوپەنای بۆ هێنایە کایەوە (جلال محمود. بەرگی۱. ۲۸۰): [کنایە از آوردن بهانەهای دروغین بە قصد فریب].

**ڕاهێڵبوون:** بریتی لە هەڵنگوتن و ڕەتبردن و کەوتن: کنایە از سکندری خوردن و بە سر افتادن. (مەزهەر.۲٤٤)

**ڕژدی ڕسوایی تێری:** [واتە: بەرچاوتەنگی و چنۆکی بێ ئابڕوویی ها بە شوێنیەوە]: کنایە از حرص و خست رسوایی ببار می‌آورد. (حیرت.۲۸۳)

**ڕستن:** بریتی لە خوڵتە کردن، (تەشی لەبەر ڕستن): زۆر مەڕیسە= زۆر مەڵێ: کنایە از پرحرفی، غلط مکن.

**ڕچە شکان:** بریتی لە کردنی کارێك لە لایەن یەکێکەوە بۆ ئەوەی کە چاوی لێ بکرێ (خال.ف.۱۷۹): [کنایە از انجام دادن کاری توسط کسی بە گونەای کە دیگران از او تقلید بکنند].

**ڕفان ڕفانە:** واتە هەر کەس لە ڕێگەوە دێت تاڵان ئەکا و کەس کاری بە کەسەوە نییە و هەر کە بۆ خۆیە: کنایە از هرج و مرج و بی‌نظمی.

**ڕکێف:** بریتی لە دەسەڵات فسیارکەس لە ڕکێفی کەسا نییە: کنایە از قدرت.

**ڕۆحچوون:** بریتی لە ترسان هەردیم (ڕۆحم چوو) واتە ترسام (خال.ف.۱۸۳): [کنایە از ترسیدن].

**ڕۆحیان لە قنگی یەك دایە:** یەکتریان زۆر خۆش دەوێت (جلال محمود. بەرگی۱. ۲۸٦): [کنایە از همدگیر را بسیار دوست دارند].

**ڕۆحزل:** بریتی لە مەردومی بەفیز (خال.ف.۱۸۳): [کنایە از آدم متکبر].

**ڕۆحی تێدا نییە:** ۱) بۆشت. زۆر تەنکە، پەرپووتە: ۱) [کنایە از آدم زوار دررفتە] ۲) مرۆڤێکی زۆر بێهێز و لاواز (جلال محمود. بەرگی۲. ۹۱): ۲) [کنایە از آدم بسیار ناتوان و لاغر].

**ڕۆژ بە پەنجە ئەژمێرێت:** ۱) زۆر دەمێکە چاوەڕوانی شتێکە: ۱) [کنایە از کسی کە مدت زیاد چشم انتظار چیزی باشد] ۲) پەلەیەتی (جلال محمود. بەرگی۱. ۲۸٦): ۲) [کنایە از عجلە دارد].

**ڕۆژ ڕەش:** بریتی لە بەدبەخت (خال.ف.۱۸٤): [کنایە از سیاەبخت].

**ڕۆڵە لە بەر دایك هەڵ ئەگرێ:** بریتی لە دزێکی زۆر

چالاك (رخزادی.۲۱٦): [کنایە از دزد بسیار زرنگ].

**ڕۆن بان ئاشە:** بە ئینسانی هێژا و جوامێر دەوترێ (جلال محمود. بەرگی۲. ۹۲): [کنایە از آدم شایستە و لایق و شجاع].

**ڕۆن قازیان لێ داگە:** بە یەکێکی بەدەماخ و سەرحاڵ ئەوترێ: کنایە از کسی کە شاداب و سرحال باشد.

**ڕۆنی ڕژیاگ جەمەو ناوێ:** [واتە نابڕوو کە چوویێت هەڵناگەڕێتەوە]: آبروی رفتە باز نیاید. (حیرت.۲۸۵)

**ڕۆژبەسەربردن:** برێتی لە دیان بە خۆدا گرتن و گوزەران کردن هەرچۆنێك هەڵسووڕا (خال.ف.۱۸٤): [کنایە از روزگار گذرانیدن].

**ڕۆژکردنەوە:** برێتی لە شەونەنووستن: کنایە از شب بیداری. (مەزبر.۳٥۱)

**ڕوو زەردە:** برێتی لە یەکێکی شەرمەزار و گوناهبار (جلال محمود. بەرگی۱. ۲۸٤): [کنایە از آدم شرمسار و گناهکار].

**ڕوو کردنەوە:** برێتی لە شەرم شکاندنی یەکێك (خال.ف.۱۸۹): [کنایە از خجالت رها شدن].

**ڕوو لێ وەرگێران:** بێزاری کردن لە کەسێ: کنایە از بیزاری از کسی. (مەزبر.۳٥٤)

**ڕووبازارییە:** ۱) جوانە: ۱) [کنایە از زیباست] ۲) دەچێتە دڵەوە خواز بێنیکەری زۆرە: ۲) [بە دل می‌چسبد و خواستگار زیادی دارد]. ۳) برێتی لە شتی بەدیەمن و جوان کە زوو بفرۆشی (خال.ف.۱۸۷/ جلال محمود. بەرگی۱. ۲۸٤).

**ڕووت بووەوە:** برێتی لە یەکێك کە هەژار کەوتووە و بێچارە بووە (جلال محمود. بەرگی۱. ۲۸٦): [کنایە از کسی کە فقیر و ناتوان شدە باشد].

**ڕووت تاڵ مەکە:** واتە تورشڕوو و ناوچاوتاڵ مەبە، واتە تووڕە مەبە: کنایە از اخمو نباش، کنایە از عصبانی نشو.

**ڕووت کەم بکە:** واتە ئەوەندە چڵێس مەبە: کنایە از طمع نداشتە باش.

**ڕووت:** برێتی لە نەدار و هەژار: کنایە از فقیر و ندار.

**ڕووتـاندنەوە:** برێتی لە شت سەندن لە یەکێك بە زۆری (خال.ف.۱۸۷): [کنایە از چیزی را بە زور از کسی گرفتن].

**ڕووتبوون:** برێتی لە فەقیربوون: کنایە از نداری و فقر. (مەزبر.۳٥۰)

**ڕووترش:** برێتی لە مەردومی ڕووگرژ (خال.ف.۱۸۷): [کنایە از آدم اخمو].

**ڕووخۆش:** برێتی لە یەکێك کە زبانی شیرین و ناو چەوانی ڕوون بێ لە گەڵ مەردوما (خال.ف.۱۸۸): [کنایە از آدم خوشرو و خوش برخورد].

**ڕووخۆشی:** برێتی لە زبان شیرین و ناو چەوانڕوونی لە گەڵ مەردوما (خال.ف.۱۸۸): [کنایە از آدم خوش برخورد].

**ڕووداماڵیاگ:** برێتی لە بێ شەرم بوون: کنایە از بی‌آزرمی.

**ڕووڕەش:** برێتی لە مەردومی شەرمەزاری تەریق و گوناهکار (خال.ف.۱۸۸): [کنایە از آدم گناهکار، روسیاە، خجل].

**ڕووڕەشی:** برێتی لە شەرمەزاریی و تەریقبوونەوە (خال.ف.۱۸۸): [کنایە از شرمگینی و خجالت].

**ڕووزەرد:** برێتی لە مەردومی شەرمەزار (خال.ف.۱۸۸): [کنایە از آدم خجل].

**ڕووزەردی:** برێتی لە شەرمەزاری (خال.ف.۱۸۸): [شرمندگی].

**رووسارد:** برێتی لە گوێ پێ نەدان یان کەسێ سارد و سڕ بێ لەگەڵتا (خاڵ.ف.١٨٨): [کنایە از بی‌مبالات و بی‌اعتنا].

**رووسپی:** ١) برێتی لە ئافرەتی بەدکارە و خراپ: ١) [کنایە از زن روسفید و بدکارە]: ٢) برێتی لە مرۆی بێ ئابڕوو (خاڵ.ف.١٨٩): ٢) [کنایە از انسان بی‌آبرو].

**رووسپیەتی:** برێتی لە خوێنی نیشانەی کچ بوونی بووك (خاڵ.ف.١٨٨): [کنایە از نشانەی بکارت عروس].

**رووسوور:** بە دەماخ و سەربەرز: کنایە از سرزندە و سرافراز. (حیرت.٢٩٠/ خاڵ.ف.١٨٩/ جلال محمود. بەرگی١. ٢٨٤)

**رووش:** برێتی لە مەردومی دەم و چاو ئاوڵاوی (خاڵ.ف.١٨٩): [کنایە از انسان آبلەرو].

**رووشکان:** برێتی لە تەریقبوونەوەی مەردوم (خاڵ.ف.١٨٩): [کنایە از خجلت و از رورفتن شخص].

**رووشکاندن:** برێتی لە تەریقکردنەوەی مەردوم (خاڵ.ف.١٨٩): [کنایە از خجل کردن و از روبردن کسی].

**رووشکێن:** برێتی لە کەسێك کە زۆر مەردوم تەریق بکاتەوە (خاڵ.ف.١٨٩): [کنایە از خجالت دهندە، از رو برندە].

**رووگرتن:** برێتی لە شەرم کردن و لە ڕوو دامان (خاڵ.ف.١٩٠): [کنایە از شرم کردن].

**رووگرژ:** برێتی لە مەردومی تووڕە و ترۆی (خاڵ.ف.١٩٠): [کنایە از انسان خشمگین و بی‌آبرو].

**رووقایم:** برێتی لە کەسێك کە هەرگیز تەریق نەبێتەوە (خاڵ.ف.١٨٩): [کنایە از پررو].

**رووکرانەوە:** برێتی لە لاچوونی شەرم (خاڵ.ف.١٨٩): [کنایە از، از خجالت رها شدن].

**رووکراویی:** برێتی لە شەرم شکان (خاڵ.ف.١٨٩): [دور از خجالت، چشم و گوش باز شدە].

**رووکردن:** برێتی لە شەرم کردن (خاڵ.ف.١٨٩): [شرم کردن].

**رووڵێنیان:** برێتی لە تکاکردن لە یەکێك بۆ کردنی کارێك (خاڵ.ف.١٩٠): [کنایە از خواهش کردن از کسی برای انجام دادن کاری].

**روون بووەوە:** ڕووی کرایەوە گەش بووەوە، داخەکەی لە دڵ دەرچوو (جلال محمود. بەرگی١. ٢٨٨): [کنایە از خوشحال و شاداب شد و غم و غصە از دلش بیرون رفت].

**رووهاتن:** برێتی لە شەرمنەکردن لە گوفتار و کردارا (خاڵ.ف.١٩١): [کنایە از کسی کە در گفتار و کردارش بی‌شرم باشد].

**رووهەڵگردن:** برێتی لە پژاندنی کچێنی ئافرەت: کنایە از پارە کردن بکارت.

**رووهەڵماڵاو:** برێتی لە مەردومی بێ شەرم: کنایە از شخص بی‌شرم و بی‌آبرو.

**رووی خۆی سپی کرد:** ١) کارێکی چاك و بەئەنجامی کرد: ١) [کنایە از کار خوبی را انجام داد] ٢) یارمەتی باشی پێشکەش کرد (جلال محمود. بەرگی٢. ٩١): ٢) [کنایە از کمک خوبی بە او کرد].

**رووی دایە:** ١) نازی کێشا و زۆری لاواند: ١) [کنایە از او را نوازش کرد، بسیار او را نواخت] ٢) سەربەستی کرد (جلال محمود. بەرگی١. ٢٨٥): ٢) [کنایە از آزادش گذاشت].

**رووی شکاند:** واتە: ١) دەستی بە ڕوویەوە نا و داخوازییەکەی بە جێ نەهێنا: ١) [کنایە از او را جواب کرد و خواستەاش را انجام نداد] ٢) تەریقی کردەوە (جلال محمود. بەرگی١. ٢٨٥): ٢) [کنایە از شرمسارش کرد].

**ڕووی قەڵغانی کردگە:** خۆ ئامادەکردن بۆ شەڕ (رخزادی.٢١٧): [کنایە از خود را برای جنگ آمادە کردن].

**ڕووی کەسێ بە زەویا دان:** ١) شەرمەندە کردنی کەسێك: ١) کنایە از شرمندە نمودن کسی ٢) ڕەتکردنەوەی داخوازی کەسێك: ٢) کنایە از رد کردن درخواست کسی.

**ڕووی کردە ڕەشەبا:** [برێتی لە یەکێك کە لە ڕووی سووکییەوە، بمرێ]: کنایە از اهانت بە کسی کە در حال مردن است. (فتاحی قاضی. بەرگی١. ٢٥٥)

**ڕووی لێ وەرگێڕا:** واتە پشتی تێ کرد، لێی هەڵگەڕایەوەو بوو بە نەیاری (جلال محمود. بەرگی١. ٢٨٦): [کنایە از او را یاری نکرد، از او برگشت و دشمنش شد].

**ڕووی لێ هەڵ چەرخاند:** ١) پشتی تێ کرد و خۆی تێ نەگیاند، پشتی بەردا: ١) [کنایە از بی‌اعتنایی بە او کرد و خویش را در آن دخالت نداد و او را کمک نکرد] ٢) لێی یاخی بوو، لێی تۆرا (جلال محمود. بەرگی٢. ٩٢): ٢) [کنایە از او متمرد شد، از او قهر کرد].

**ڕێ بە دێییککردن:** برێتی لە شارەزایی و سەر لێ دەرچوون لە شتێك: فسیارکەس لە خوێندنا (ڕێ بە دێیێك) ئەکاتەوە واتە شتێکی لێ ئەزانی (خال.ف.٢٠٠): [کنایە از آگاهی و اطلاع داشتن در مورد چیزی].

**ڕەتی بڵاوە (دەستی ناگات سەری خۆی بخورێنێت):** واتە فرمانی زۆرە، سەری قاڵە و هەردەمە بە لایەکدا ڕەت دەبێت: کنایە از کسی کە کار و سرگرمیش زیاد باشد و هر لحظە مشغول چیزی و کاری است. (جلال محمود. بەرگی١. ٢٨١/ حیرت.٢٨٨/ فتاحی قاضی. بەرگی١. ٢٥٥)

**ڕەپاوڕەپ:** برێتی لە وتنی شت بێ ڕوودەربایستی (خال.ف.١٩٢): [کنایە از رک و صریح بودن].

**ڕەزای سووکە:** واتە دەچێتە دڵەوە یا لە بەر شێوەی جوانی، یا لە بەر ڕەفتار شیرینی و دەم و لفتی (جلال محمود. بەرگی٢. ٩٠): [کنایە از کسی کە بە دل می‌چسپد بە خاطر زیبایی یا رفتار و اعمال].

**ڕەزای شیرینە:** برێتی لە یەکێکی ئێسکسووکە کە جوان دەچێتە دڵەوە خۆشەویستە (جلال محمود. بەرگی٢. ٩٠): [کنایە از فرد دوست‌داشتنی کە بە دل می‌چسپد و محبوب است].

**ڕەزەڵخوا:** برێتی لە ڕووت و نەداری تەواو: کنایە از فقیر، مسکین. (مەژار.٣٥٤)

**ڕەش گرێدان:** برێتی لە ئازیەت باری: کنایە از سوگواری. (مەژار.٣٥٩)

**ڕەش و ڕووتە:** [بە یەکێکی هەژار و نەدار دەڵێن]: کنایە از آدم فقیر و ندار. (حیرت.٢٨٨)

**ڕەش و سپی لێك ناکاتەوە:** برێتی لە یەکێکی نەزان و ناشارەزایە: (جلال محمود. بەرگی١. ٢٨٢) [کنایە از آدم نادان و ناوارد].

**ڕەش و شین:** [برێتی لە زۆر ماندوو]: کنایە از بسیار خستە شدن. (حیرت.٢٨٨)

**ڕەشان:** برێتی لە بزن و گۆشتی بزن: کنایە از بز و گوشت بز. (مەژار.٣٥٨)

**ڕەشایی داهات:** واتە ١) کوێر بوو: ١) [کور شد] ٢) بەرچاوی تاریك بوو. تارمایی ڕەش بە چاویدا هات (جلال محمود. بەرگی١. ٢٨١): ٢) [کنایە از جلو چشمش تاریک شد و شبحی جلو چشمش را گرفت].

**ڕەشایی داهاتن:** لە تاریکبوونی چاو (خال.ف.١٩٤): [کنایە از چشم درد منتهی بە کوری].

**ڕەشبگیرە:** واتە بێ‌جیاوازی، پاك و پیس، گەورە و

بچووك. پیا و ژن، گوناهدار و بێگوناه دەگرن (جلال محمود. بەرگی١. ٢٨١)؛ [کنایە از بدون هیچ اختلافی همە را بازداشت می کنند].

**ڕەشبوون:** بریتی لە ئیسکقورسبوون لە پێش چاوی یەکێك: منفور شدن، از چشم کسی افتادن. (خال.ف.١٩٥/ مەزهر.٣٥٨)

**ڕەشبوونەوە:** بریتی لە کوژرانەوەی چرای دەروون (خال.ف.١٩٥): [کنایە از خاموش شدن چراغ درون].

**ڕەشبین:** بریتی لە مەردومی بەدبین (خال.ف.١٩٥): [کنایە از بدبین].

**ڕەشپۆش:** بریتی لە ئازیەت باری کەسێك کە ڕەشی لە بەر کردبێ لە ماتەما (خال.ف.١٩٥): [کنایە از عزادار، سیاه پوشیدن].

**ڕەشکەو پێشکە:** بریتی لە خەتنووسینی تێکەڵ و پێکەڵ و ناخۆش تێکەڵبوونی سوّما و دیدی چاو: کنایە از خط بد و درهم و برهم. (مەزهر.٣٥٩)

**ڕەشکەوسپیکە:** بریتی لە خەتنووسین لە سەرکاغەز (خال.ف.١٩٦): [کنایە از نوشتن روی کاغذ].

**ڕەشکردن:** بریتی لە، لەبەرچاو خستنی یەکێك لای یەکێك (خال.ف.١٩٥): [کنایە از کسی را از نظر مردم انداختن].

**ڕەشکوژ:** بریتی لە کەسێ کە بێ ئاگا پیاو دەکوژێ (خال.ف.١٩٥): [کنایە از تروریست].

**ڕەگ بە ڕیشە و گلێنە بە بنەتۆم:** [واتە هەر شتێك بە بنچینەی خۆی هەڵدەگەڕێتەوە]: کنایە از هر چیز بە اصل خویش بازمی گردد. (حیرت.٢٨٩)

**ڕەگ خەوی ها لە دەسما:** [واتە لەگەڵ ئاکار و ڕێوڕەوشتی ئاشنایەتیم هەیە]: کنایە از با اخلاق و رفتارش آشنا هستم. (حیرت.٢٨٩)

**ڕەگەگیا:** بریتی لە یەکێکی لەڕ و لاواز: کنایە از آدم لاغر و نحیف.

**ڕەگداکوتان:** بریتی لە مانەوە و جێگیربوونی یەکێك لە شوێنێك (خال.ف.١٩٨): [کنایە از استقرار و ماندن کسی در جایی].

**ڕەق و وشك:** بریتی لە زۆر لاواز: کنایە از لاغر و مردنی. (مەزهر.٣٦٠)

**ڕەمەقی داوە:** [بریتی لە یەکێك کە لەڕ و لاواز بوویێت]: کنایە از کسی کە ضعیف و ناتوان شدە. (حیرت.٢٨٩)

**ڕەنجی بە با چوو:** واتە ئەنجامی کارەکەی لە دەست دا. هیچی دەستگیر نەبوو یان یەکێك دەست ڕەنجی تیابچێ (جلال محمود. بەرگی٢. ٩١)؛ [کنایە از، از دست دادن دسترنج و بە هدر رفتن آن].

**ڕەنگ کردن:** بریتی لە دەستبڕین و خاپاندن: کنایە از کلاهبرداری. (مەزهر.٣٦٢)

**ڕەنگ مردووی لێ نیشتووە:** [بریتی لە یەکێك کە زۆر لاواز و بێهێز بووە]: کنایە از بسیار ضعیف و ناتوان شدە. (حیرت.٢٩٠)

**ڕەنگگرتن:** بریتی لە سەرگرتنی کارێك: کنایە از انجام گرفتن کاری.

**ڕەنگمان مەکە:** واتە مەمان خەڵەتێنە و کڵاو مەنە سەرمان: کنایە از فریبمان مدە و اغفالمان مکن.

**ڕەنگی زەردەو بووە:** [واتە زۆر ترساوە]: کنایە از کسی کە بسیار ترسیدە. (حیرت.٢٩٠)

**ڕەنگی سوورەو بووە:** [بریتی لە یەکێك کە شەرمەزار بوویێت]: کنایە از اینکە شرمسار شدە است. (حیرت.٢٩٠)

**ڕەنگی چەرمگەو بووە:** [بە یەکێك دەڵێن کە ترسیابێ یان تەریق بوویێتەوە]: کنایە از آدمی کە ترسیدە یا

شرمسار شده است. (حیرت.۲۹۰)

**ڕەنگی لەبەر براوە (ڕەنگی تێك چووە):** واتە: ۱) زەرد و لاواز بووە: ۱) کنایه از لاغر شده ۲) هەڵبزرکاوە. گۆڕاوە: ۲) کنایه از رنگ باخته و عوض شده.

**ڕەنگی مردووی لێ نیشتووە:** واتە زەرد هەڵگەڕاوە، لاوازە. وەك مردووی لێ هاتووە. سا یا لە بەر نەخۆشی یان لە ترساندا (جلال محمود. بەرگی۲. ۹۰): [کنایه از ضعیف و لاغر شده مثل مرده شده یا به علت بیماری یا از روی ترس].

**ڕەنگی هەڵ پرووسقیاوە:** [بە یەکێك دەڵێن ترسیابێ یان نەخۆش بێت]: کنایه از کسی ترسیده یا مریض شده باشد. (حیرت.۲۹۱)

**ڕەنگێکی هێناو برد:** واتە ۱) زەرد بوو: ۱) [کنایه از ترسید] ۲) تەریق بووەوە و شەرمەزار بوو (جلال محمود. بەرگی۱. ۲۸۳): ۲) [کنایه از شرمسار شد].

**ڕەویتانگ:** برێتی لە خانووی تازە دروست کراو: کنایه از خانەی نوساز. (معزبر.۳٦۲)

**ڕەهندە:** برێتی لە بنیادەمی پانوپۆڕ: کنایه از کسی که دارای هیکلی عریض و پهن باشد. (معزبر.۳٦٤)

**ڕێ بە ڕێبوار نادات (ڕێ بە ڕێبوار ناکەوێت):** برێتی لە جێگایەك کە جەنجاڵ بێت و جمەی بێت، و ڕێی هاتوچۆی تیا نەبێت (جلال محمود. بەرگی۱. ۲۸۸): [کنایه از جایی شلوغ و پر از ازدحام جمعیت، که راه رفت و آمد در آن بکندی انجام گیرد].

**ڕێ بە ڕێدار نییە:** برێتی لە جێگایێکی زور جەنجاڵ: کنایه از جای شلوغ.

**ڕێ بەرخستن:** برێتی لە سپاردنی کارێ بە کەسێك: کنایه از سپردن کاری به کسی. (معزبر.۳٦٤)

**ڕێ بەرنان:** برێتی لە تەگبیر بۆ کردن: کنایه از رهنمونی کردن. (معزبر.۳٦٤)

**ڕێخ ها لە کلاشیا:** برێتی لە یەکێکی ئاژاوەچی کە گۆبەندێك لە ژێر سەریایە: کنایه از شخص آشوبگر که دسیسه‌ای زیر سر دارد.

**ڕێخۆڵە ئەستوور:** برێتی لە ئازا و بەبڕشت: کنایه از جسور و قاطع. (معزبر.۳٦٥)

**ڕێخۆڵەی درێژە:** بەرگە گرە و بەئارامە و نافەوتێت:. دەڵێن: کوڕ ڕێخۆڵەی درێژە یان بە یەکێك کە شان دەداتە بەر سەختی ژیان و نانەوێت (جلال محمود. بەرگی۲. ۹۲): [کنایه از توان دارد و در برابر مشکلات پشت خم نمی‌کند].

**ڕێخاوی:** برێتی لە مرۆی خوێڕی و بێکارە: کنایه از بیکاره و ولگرد. (معزبر.۳٦٤)

**ڕێزان:** برێتی لە پیاوی کارزان و زانا: کنایه از دانشمند. (معزبر.۳٦٦)

**ڕیسوگوریس:** برێتی لە کردار یان گوفتارێکی دووورودرێژ (خال.ف.۲۰۸): [کنایه از کار یا گفتار دور و دراز].

**ڕیش سپی:** برێتی لە دەمڕاست و قسەڕەوای کۆمەڵێك (خال.ف.۲۰۹): [کنایه از آدم آگاه و بانفوذ در میان یک گروه یا مجموعه].

**ڕیش لە ئاسیاو چەرمگ نەکردن:** خاوەن ئەزموون و تەجروبە: کنایه از باتجربه بودن.

**ڕیش لە بەر خۆرەوە چەرمگ نەکردن:** برێتی لە مروڤی بەئەزموون، تەجروبە پەیدا کردن: کنایه از فرد باتجربه.

**ڕیشە بڕبوون:** برێتی لە بڕانەوەی خێزان یا تیرەیەك: کنایه از بین رفتن یا انقراض خانواده یا قبیله‌ای. (معزبر.۲۰۹)

**ڕیشە داکوتان:** برێتی لە جێگیربوونی یەکێك لە شوێنێکا: کنایه از استقرار و ماندن کسی در جایی. (معزبر.۲۰۹)

**ڕیشە دەرهاتن:** برێتی لە کەنەفت کردنی یەکێك: کنایه

از بدبخت کردن کسی. (مەزبر.٢٠٩)

**ریشەدەرهاتن:** برێتی لە کەنەفتبوونی یەکێك بە هۆی شتێکەوە (ریشەم دەرهات لە دەست تۆوە): کنایە از تلاشی بسیار برای انجام کاری و در نهایت، هلاك و درمانده شدن در راستای انجام آن. (مەزبر.٢٠٩)

**ریشەکێشی کرد (دەماری دەرهێنا):** لە ڕابردوودا زۆر زەلامیان ریشەکێش دەکرد. سەریان دەخستە کونە دیوارێکەوە و گوریسیان دەخستە ملی و گوریسەکەیان بە ولاخێکەوە دەبەست و ولاخەکەیان تاو دەدا، بەم شێوەیە سەریان لە ملی دەکردەوە: (جلال محمود. بەرگی١. ٢٨٩) [کنایە از در گذشته سر بسیاری از انسان ها را از تنشان جدا می‌کردند بدین ترتیب سرش را توی سوراخ دیواری قرار می‌دادند و ریسمانی را به دور گردن او می‌بستند و سر دیگر ریسمان را به الاغی می‌بستند و الاغ را به تاخت درمی‌آوردند و بدین شیوه سر فرد را از بدنش جدا می‌کردند].

**ریشەی جگەر:** برێتی لە منالی خۆت: کنایە از فرزند خویش. (مەزبر.٢٠٩)

**ریشم نیاوە بارمتە:** [واتە ئەستۆگر و تاوانبژێری کەسێك بوون]: کنایە از واسطە و ضامن کسی شدن. (حیرت.٢٩١)

**ریشم ها لە گرەودا:** [واتە زەرەر و زیانی ئەوم بە ئەستۆی خۆم گرتووە]: کنایە از تعهد کردەام و ضامن شدەام. (حیرت.٢٩١)

**ریشی پێوە بووە (تێوە گلاوە):** واتە تازە دەستی چۆتە کارەکەوە تێوە گلاوە (جلال محمود. بەرگی٢. ٩٢): [کنایە از گرفتار کاری شدن].

**ریشی خۆی دایە دەستی (ریشی داوە دەستییەوە):** برێتی لە یەکێك کە بۆ یەکێکیتر مل شۆڕ کاتەوە و جلەوی خۆی داوە دەستیەوە (جلال محمود. بەرگی١. ٢٩٠)؛ [کنایە از کسی کە تسلیم کسی دیگر شود و امور خویش را بە او بسپارد].

**ڕێگۆڕین:** برێتی لە وازهێنان لە بڕوای خۆی: دست از مرام و عقیدەی خود برداشتن. (مەزبر.٣٦٨)

**ڕێگە بە ڕێگەدار نییە:** [بە جێگایەکی زۆر جەنجاڵ و قەرەباڵغ دەڵێن]: کنایە از جایی کە ازدحام در آن زیاد است. (حیرت.٢٩٢)

**ڕێگە بنە بەر پای:** برێتی لە یەکێك ڕێنوێنی کردن: کنایە از کسی را راهنمایی کردن.

**ڕێگە:** برێتی لە دۆز، ڕەوشت: کنایە از مرام. (مەزبر.٣٦٨)

**ڕێگەی پێ ناوات:** [واتە لێی تێناگات شوێن ناباتە سەری]: کنایە از آنرا درك نمی‌کند. (حیرت.٢٩٢)

**ڕێگەی خۆی گوم ناکات:** [واتە ئەو کارە یا ئاکارە باشە کە بوویەتی هەر ئەمێنێ]؛ کنایە از حفظ رفتار نیکو. (حیرت.٢٩٢)

**ڕێگەی دوور و بار قورس:** [دژواری کارێك، گوناهباری]؛ کنایە از سختی و دشوار بودن کار یا امری، گناهکار بودن. (حیرت.٢٩٣)

**ڕێگەی گوم کردگە:** ١) برێتی لە یەکێك کە گومڕا بووبێت: ١) [کنایە از کسی کە از راە و رسم معمول خارج شدە باشد] ٢) برێتی لە یەکێك ڕێی خراپی گرتووە (جلال محمود. بەرگی٢. ٩٣)؛ ٢) [کنایە از کسی کە راە بدی را در پیش گرفتە باشد].

**ڕێکبوون:** برێتی لە ئاشنایەتی و تێکەڵی لە گەڵ یەکێکا (خاڵ.ف.٢٠٥): [کنایە از دوستی و آشنایی با کسی].

**ڕێوی بە بێ مریشك هەڵ ناکا:** برێتی لە یەکێك کە فێری خواردنی ماڵی حەرام بووبێ و نەتوانێ دەستی لێ

هەڵگرێ. (خاڵ.۲۵۷)

**ڕێوی بە پیرییەوە هاتووە:** بڕێتی لە یەکێك کە بەخت رووی تێ بکات (جلال محمود. بەرگی۱ . ۲۹۱): [کنایه از کسی که شانس به او روی آورد].

**ڕێوی هاتووە بە پیریتەوە:** واتە بەخت رووی تێکردوویت. (خاڵ.۲۵۸)

**ڕێویی کونێکن (کونابێکن):** بڕێتی لە دووکەس کە فێڵباز و کەڵەکباز کە ڕەوشت و خوویان وەکوو یەك بێت (جلال محمود. بەرگی۲. ۹۳): [کنایه از دو نفر مکار و نیرنگ‌باز که اخلاق و رفتارشان مثل هم باشد].

**ڕێی ئەکەوێتە کونی مار:** بڕێتی لە مەردومی زیرەکی بزیو. (خاڵ.۲۵۸)

**ڕێی دەستی نییە:** ۱) توانا و وزەی ئەو کارەی نییە: ۱) [کنایه از توانایی و نیروی آن کار را ندارد] ۲) بوارو دەرفەتی کردنی ئەو کارەی نییە: ۲) [کنایه از وقت آن کار را ندارد] ۳) دەسەڵاتی براوە (جلال محمود. بەرگی۱. ۲۹۱): ۳) [کنایه از قدرت و اختیارش را از دست داده است].

**ڕێی لێ بڕیوەتەوە:** ۱) واتە پەکی خستووە: ۱) [کنایه از، از کار افتاده است] ۲) بۆتە تەگەرە و ناهێڵێت هیچ بکات (جلال محمود. بەرگی۱. ۲۹۱): ۲) [کنایه از مانعی بر سر راهش شده و نمی‌گذارد کاری انجام دهد].

**ڕێی لێ گۆڕاوە (لەونی لێ گۆڕاوە):** ۱) واتە گومڕا بووە و ڕێی خراپەی گرتۆتە بەر: ۱) [کنایه از کسی که از راه و رسم معمول منحرف شده] ۲) لە خشتە براوە (جلال محمود. بەرگی۱. ۲۹۱): ۲) [از راه بدر شده است].

# ز

**زاتبردن:** برێتی له ترساندنی یه‌کێك (خال.ف.۲۱۰): [کنایه از ترساندن].

**زاتچوون:** برێتی له ته‌واو ترسان (خال.ف.۲۱۰): [کنایه از وحشت کردن].

**زاخ ده‌کوڵێنێ:** [برێتی له که‌سێکی خوڵته‌که‌ری به‌فروفێڵ]: کنایه از آدم ریاکار و متملق. (قاضی. به‌رگی۱. ۲۲۳)

**زاخاو دان:** ۱) برێتی له ته‌ختکردنی که‌یف (زاخاوی مێشکم‌دا): ۱) کنایه از خوش گذشتن، ۲) برێتی له ته‌ماشاکردنی یه‌کێکی جوانی دڵبه‌ر: ۲) کنایه از نگاه کردن به جوان زیبا و دلفریب. (مه‌ژار.۳۷۲)

**زاخاو:** برێتی له داخ و خه‌فه‌ت (خال.ف.۲۱۰): [کنایه از غم و غصه].

**زاخاوی چاوی خۆی دایه‌وه:** برێتی له یه‌کێك که تێر ته‌ماشای ئافره‌تی جوان بکا و چاوی خۆی پێ ڕوون بکاته‌وه (جلال محمود. به‌رگی۱. ۲۹۲): [کنایه از کسی که بسیار نظرباز باشد و با دیدن زیبارویان شاد شود].

**زاخاوی مێشکی دایه‌وه:** برێتی له یه‌کێك که شتێك بخوێنێته‌وه و رۆشنبیری خۆی فراوانتر بکات (جلال محمود. به‌رگی۱. ۲۹۲): [کنایه از کسی که چیزی را بخواند و آگاهی خود را زیادتر کند].

**زاخدار:** برێتی له مرۆڤی به‌جه‌رگ (خال.ف.۲۱۱): [کنایه از شجاع].

**زاخی بۆ تواندەوه:** واته تووشی ئاژاوه، گاشه‌یه‌کی کرد (جلال محمود. به‌رگی۲. ۹٤): [کنایه از او را گرفتار بلوا و آشوب کرد].

**زاره ترەك:** برێتی له زۆر ترساو، تۆقیو له ترسان (خال.ف.۲۱۲): [کنایه از زهره ترک].

**زاره‌ترەك بوو (زه‌نده‌قی چوو):** برێتی له یه‌کێك که له ترسا بمرێت یان وه‌ك مردووی لێ بێت مرۆڤ که زراوی ته‌قی ده‌مرێت (جلال محمود. به‌رگی۱. ۲۹۲): [کنایه از کسی که از ترس یا وحشت بمیرد].

**زاروو تۆقین:** برێتی له فره‌ترسان (خال.ف.۲۱۵): [کنایه از زهره ترک شدن و بسیار ترسیدن].

**زاروویردن (زراو بردن):** برێتی له تۆقاندن (خال.ف.۲۱۵): [کنایه از ایجاد وحشت و زهره ترک کردن].

**زاروی تۆقاند:** واته ترساندی (جلال محمود. به‌رگی۱. ۲۹۲): [کنایه از این که او را بسیار ترساند].

**زاڵمی زۆرداره:** ۱) [ژنی چه‌وساوه به ده‌ست مێرده‌که‌ی]. ۱) کنایه از زنی که شوهرش نسبت به او ظلم کند. ۲) [مه‌ردمی ژێر چه‌پوك ئه‌بێ] ۲) کنایه از مردم ستمدیده. (حیرت.۲۹٥)

**زامداریش ده‌کات و تیماریش ده‌کات:** واته سزایشی ده‌دات و ئاشتیشی ده‌کاته‌وه (جلال محمود. به‌رگی۱. ۲۹۲): [کنایه از رنج و آزارش می‌دهد و دلش را نیز به دست می‌آورد].

**زبانتاڵ:** برێتی له مرۆڤی قسه ڕه‌ق (خال.ف.۲۱٤): [کنایه از کسی که سخن ناخوشایند گوید].

**زبانپاکی:** برێتی له ناونه‌بردنی که‌س به خراپه (خال.ف.۲۱٤): [کنایه از بد نگفتن از کسی].

**زبانپیس:** برێتی له جوێنفرۆش (خال.ف.۲۱٤): [کنایه از شخص دشنام‌دهنده].

**زبانرێژ:** برێتی له که‌سێك که له ئه‌ندازه‌ی خۆی زیاتر و به‌ره‌و ژوورتر ده‌رباره‌ی مه‌ردوم بلوێ (خال.ف.۲۱٤):

[کنایە از کسی کە دربارەی مردم بیش از اندازە حرف بزند].

**زبانلریژی:** برێتی لە قسەی ناشیرین کردن دەربارەی یەکێك (خال.ف.٢١٤): [کنایە از حرف زشت زدن دربارەی کسی].

**زبانشیرین:** برێتی لە یەکێك کە قسە خۆشبێ لە گەڵ مەردوما (خال.ف.٢١٤): [کنایە از شخص خوش برخورد و خوش زبان با مردم].

**زبانگەستن:** برێتی لە پەشیمانبوونەوە و خەفەتخواردن بۆ شتێك کە لە دەست چووبێ (خال.ف.٢١٤): [کنایە از پشیمانی و تأسف خوردن برای چیزی کە از دست رفتە باشد].

**زبانگرتن:** برێتی لە قسەکردن بە بێ شەرمی. شاخەوان (چاك زبانی گرتووە) (خال.ف.٢١٤): [کنایە از کسی کە در حرف زدن رک و بی‌شرم باشد].

**زبانلووس:** برێتی لە کەسێك کە بە زبانی خۆش مەردوم لاس بدا (خال.ف.٢١٤): [کنایە از شخصی کە با زبان خوش مردم را فریب دهد].

**زرتەی چاوی دێت:** بێدارە و نەنووستووە (جلال محمود. بەرگی٢. ٩٥): [کنایە از بیدار است و نخوابیدە است].

**زرێ لە باخەڵدا دەکات:** برێتی لە یەکێك کە لە کارێکدا زۆر کارامە بێت (جلال محمود. بەرگی١. ٢٩٤/ خال.٢٦١): [کنایە از کسی کە در کاری بسیار کارامد و ماهر باشد].

**زگ جەردە:** [برێتی لە یەکێکی فرەخۆر و تێرنەخۆر]: کنایە از آدم شکم‌پرست کە هرچە می‌خورد سیر نمی‌شود. (فتاحی قاضی. بەرگی٢. ١٤٤)

**زگ لە وەراندن:** واتە بۆ خواردن و بۆ چڵێسی، شوێنە و شوێن کردن (جلال محمود. بەرگی٢. ٩٥): [کنایە از جهت خوردن و شکم‌پرستی بە همەجا سر کشیدن].

**زك شێلان:** برێتی لە زۆر میوان بوونی کەسێك: کنایە از زیاد مهمان شدن کسی.

**زکبەردان:** برێتی لە فرەخواردن (خال.ف.٢١٩): [کنایە از پرخوری].

**زکە شۆڕێ پێکەوتن:** برێتی لە ماندووبوونی یەکێك بە هۆی هاتوچۆی زۆرەوە (خال.ف.٢١٩): [کنایە از خستە شدن کسی بە علت رفت و آمد بسیار].

**زکەڕۆ:** برێتی لە زکدڕاوی زۆرخۆر: کنایە از پرخوری.

**زکدڕاو:** برێتی لە زۆر خۆر (خال.ف.٢٧٩): [کنایە از پرخور].

**زکسووتان:** برێتی لە مناڵمردن: کنایە از مرگ فرزند. (مەژار.٢٧٩)

**زکچوون:** برێتی لە ڕەوان و سەر پێ کردن، وەبا (خال.ف.٢١٩): [کنایە از اسهال].

**زلحۆرت:** برێتی لە تەژەی ناقولا: کنایە از لندهور بدقوارە. (خال.ف.٢٢٠)

**زلێخا زەماوەن:** [بە کچوڵەیەکی هاروهاج دەڵێن]: کنایە از دختربچە شلوغ و زرنگ. (حیرت.٢٩٥)

**زمان ڕەشە:** ١) واتە نوقڵانەی خراپ لێ دەدات. زمانی باش ناهێنێت: ١) [کنایە از بدبینی و فال بد زدن] ٢) دەم پیس و قسە ڕەقە (جلال محمود. بەرگی٢. ٩٥): ٢) [کنایە از فحاش و بددهن].

**زمان چەوتە (زمان چەفتە):** واتە قسەی باش و خێر بە زمانیدا نایەت. زمان چەپڕەگە (جلال محمود. بەرگی٢. ٩٦): [کنایە از بددهن].

**زمانت ببەستە:** واتە زۆر مەڵێ و ئاگات لەوە بێت کە دەیڵێت. ئەمە وەکوو هەڕەشەیشە (جلال محمود. بەرگی٢.

۹۵): [کنایه از دهانت را ببند و مواظب حرف زدنت باش بیشتر برای تهدید است].

**زمانگەستن:** بریتی لە پەژیوانی: کنایه از پشیمانی. (مەزهەر ا ۲۸۱)

**زمانکێشان:** بریتی لە تینوویەتی زۆر کە مرۆ دەکەوێتە هەناسەدان: کنایه از منتهای تشنگی. (مەزهەر ا ۲۸۱)

**زمانی بەستراوە:** ناوێرێت مەبەستی خۆی دەربرێت (جلال محمود. بەرگی ا. ۲۹۵): [کنایه از جرئت نمی‌کند منظورش را ابراز دارد].

**زمانی ترازا:** بریتی لە یەکێك کە قسەیەك بدرکێنی کە نەدەبوو ناشکرای بکردایات (جلال محمود. بەرگی ا. ۲۹۵): [کنایه از کسی که رازی را افشا کند که نمی‌بایست آشکار می‌کرد].

**زمانی پاکە:** ۱) دوو زمانی ناکات: ۱) [کنایه از سخن‌چینی نمی‌کند] ۲) پاشملە قسە بە کەس ناڵێت: ۲) [کنایه از غیبت کسی را نمی‌کند] ۳) قسەی ناشیرین و خراپ بە کەس ناڵێت (جلال محمود. بەرگی ۲. ۹۶): ۳) [کنایه از حرف بد به کسی نمی‌گوید].

**زمانی درێژە:** بریتی لە یەکێکی زۆر وێژ و جنێوفرۆش و دەمهەراش (جلال محمود. بەرگی ا. ۲۹۶): [کنایه از آدم پرحرف و فحاش].

**زمانی گرتووە (دەمی گرتووە):** بە تەوەس و ڕقەوە بە یەکێك دەوترێت کە دەمهەراشی بکات (جلال محمود. بەرگی ا. ۲۹۶): [با طعنه و کینه به کسی گفته می‌شود که زبان‌درازی کند].

**زمانی کول بوو:** واتە هێندەی لەگەڵ وت کەڵکی نەبوو، ماندوو بوو وەك زمانی بسوێت لە قسە کەوت (جلال محمود. بەرگی ۲. ۹۶): [کنایه از بسیار با او حرف زد ولی سودی نداشت و خسته شد].

**زمانی لاڵە:** بریتی لە یەکێك کە ناوێرێت قسە بکات و مەبەستی خۆی دەربرێت (جلال محمود. بەرگی ۲. ۲۹۶): [کنایه از کسی که جرئت نمی‌کند حرف بزند و منظورش را بیان دارد].

**زمانی لەنگە، بە تەوسەوە دڵێن:** زمانی بەستراوە و ناوێرێت قسە بکات (جلال محمود. بەرگی ا. ۲۹۷): [کنایه از زبانش بسته است و جرئت نمی‌کند حرف بزند].

**زمانی لێ نەشکاوە:** چەشەی نەکردووە (جلال محمود. بەرگی ا. ۲۹۷): [کنایه از طعمش نکرد].

**زمبێڵ قەتیان (سمێڵ قەیتان):** بریتی لە کەسێ کە سمێڵی ڕەش و بریقەدارە: کنایه از کسی که سبیل سیاه و براق دارد. (مەزهەر ا ۲۸۱)

**زمسان یەخی لێ ناسنگێ** (نەمومن.ف.٥٤): [بریتی لە یەکێکی دەسوشك و ڕژد: کنایه از آدم خسیس].

**زرتەی چاوی بێت:** با هەر بە تەما بێت هیچی دەستگیر نابێت: کنایه از بگذار انتظار بکشد چیزی دستگیرش نخواهد شد.

**زوان لە دەمیا نییە:** [زۆر ئەهوەن و فەقیربوون، گێلبوون]: کنایه از بسیار آرام و سربه زیر، ساده‌لوح. (حیرت.۲۹٦)

**زواندار:** بریتی لە مەردومی دەم هەراش (خالن.ف.۲۲٤): [کنایه از شخصی زبان دراز و بی‌شرم].

**زوانم کول بوو:** [واتە زۆر پێداگری و زۆر دووپاتکردنەوە]: کنایه از اصرار و تکرار زیاد. (حیرت.۲۹۷)

**زوانمان لێ نەکێشێ:** [بریتی لە یەکێکی بێ شەرمە کە پەڕۆ بە دەمیەوە نییە و هەرچێ دێت بە دەمیا وەکو جنێو و قسەی ناشیرین پێمانی دەکات]: کنایه از سخن‌درازی و دشنام گویی. (حیرت.۲۹٦)

**کلکەمار:** برێتی لە شتی زۆرتاڵ (خاڵ.ف.۹۲): [کنایە از چیز بسیار تلخ].

**کلك پێوەکردن:** برێتی لە خەڵەتاندن: کنایە از فریب دادن. (مەزبر.۶۲۰)

**کلکپێهەڵپەساردن:** برێتی لە گوێ نەدان بە کار، خۆگێلکردن لە ئەنجامدان، خاوەخاو: کنایە از اهمال. (مەزبر.۶۲۰)

**کلکگرتن:** برێتی لە خستنە ناچاریەوە: کنایە از در تنگنا گذاشتن. (مەزبر.۶۲۰)

**کلککێشان:** [برێتی لە ڕاونیان و دوورکردنەوەی کەسێ لە خۆت]: کنایە از کسی را طرد کردن و از خود راندن. (فتاحی قاضی. بەرگی۱. ۳۰۶)

**کلكهەڵسووڕاندن:** برێتی لە بەرەنگاری کردن و بە قسە نەکردن: کنایە از مخالفت کردن. (مەزبر.۶۲۰)

**کلکی پێ هەڵگرت:** ۱) دەستخەڕۆی کرد. فێڵی لێ کرد. گاڵتەی پێ کرد: ۱) [کنایە از فریبش داد و مسخرەاش کرد]. ۲) لاساری و گوێنەدان. بە تەنگ کارەکەوە نەهات (جلال محمود. بەرگی۲. ۱۲٤): ۲) [اهمیّت ندادن و بی‌توجهی به کار به سختی و دشواری آن نیندیشید].

**کلکی پێواوە و دەزانێت چەند بستە:** برێتی لە یەکێك کە یەکێکی‌تر هەڵسەنگێنێ و بزانێت چی لە باردایە (جلال محمود. بەرگی۱. ۲۸۸): [کنایە از کسی که دیگری را بیازماید میزان توانایی و مهارت او را بسنجد].

**کلکی پێوە دەکات:** گاڵتەی پێ دەکات، دەیخەڵەتێنێت. دەسخەڕۆی دەکات (جلال محمود. بەرگی۲. ۱۲٤): [کنایە از مسخره کردن و فریب دادن].

**کلکی خۆی دەکورۆژێت:** برێتی لە یەکێك کە زۆر ڕقی هەستاوە. بۆ سووکی (جلال محمود. بەرگی۲. ۱۲٤): [کنایە از کسی که بسیار به خشم آمده هنگام تحقیر به کار برده می‌شود].

**کلکی خستە کارەکەوە:** واتە کارەکەی تێکدا، دەستێوەردانەکەی نابەجێ بوو (جلال محمود. بەرگی۲. ۱۲٤): [کنایە از بەهم‌زدن کاری، دخالت بی‌جا که موجب بەهم‌زدن کاری شود].

**کلکی گرتووە:** ۱) بۆ سووکیی، برێتی لە یەکێك کە لەخۆبایی بووبێت، کەوتبێتە جرتوفرت: ۱) [برای تحقیر گفته می‌شود و کنایە از کسی که متکبر شده باشد، و دست به بازیگوشی و جلفی بزند] ۲) یاخی بووە (جلال محمود. بەرگی۲. ۱۲٤) ۲) [کنایە از متمرد و طاغی شده].

**کلکی قنج کردۆتەوە (ڕاست کردۆتەوە):** ۱) لە خۆبایی بووە: ۱) [کنایە از مغرور و متکبر شده است] ۲) سەرپێچی دەکات (جلال محمود. بەرگی۲. ۱۲٤): ۲) [کنایە از تمرد می کند].

**کلکی لە ژێر دەستم دایە:** ۱) دەسەڵاتی یا جڵەوی بەمنە. نهێنییەکانی لای منە: ۱) [کنایە از کنترل و قدرتش با من است و رازش پیش من است] ۲) دەتوانم هەرکارێکی پێ بکەم (جلال محمود. بەرگی۲. ۱۲٤): ۲) [کنایە از در اختیار من است و هرکاری بخواهم می کند].

**کلکی لە کوڵە کەمترە (کلکی لە سەگ کەمترە):** بۆ تەوەس و پێکەنین دەوترێت واتە: زۆرزانە (جلال محمود. بەرگی۱. ۲۸۸): [از روی طعنە و مسخره به کسی گفته می‌شود که بسیار دانا است].

**کلکیان هەڵکێشا:** بۆ سووکی و تەووسە واتە لەسەر کارەکە لایان برد، دەریان کرد (جلال محمود. بەرگی۱. ۲۸۷): [از روی تحقیر و طنز به کسی گفته می‌شود که از

کار بر کنار و اخراج شده باشد].

**کلیلبەدەست:** برێتی لە خاوەن دەسەڵات: کنایە از همە کارە. (معژبر.٦٢١)

**کوتایەوە بە چاویدا:** منەتی بە سەردا کرد و ئەو پیاوەتیەی لە گەڵیدا کردبوو بە گەنجەفە و خۆ یادانەوە هێنا بەرچاوی و سەرەژێری کرد (جلال محمود. بەرگی٢. ١٢٥): [کنایە از بر او منت گذاشت و آن خوبی‌ای را کە در حق او کردە بود با لحنی مسخرەآمیز و متکبرانە تکرار کرد و سر بە زیرش کرد].

**کوتەك پشتی سەرتم:** واتە پشتیوانتم (جلال محمود. بەرگی٢. ١٢٥): [کنایە از پشتیبانت هستم].

**کوتەك ناو چلپاوە:** [برێتی لە یەکێك کە خۆی بکوتێتە نێو هەر کارێ کفتەی بەرکوڵ بێت]: کنایە از کسی کە در هر کاری دخالت کند. (حیرت.٣٧٩)

**کوتەك وشێنە:** ١) برێتی لە یەکێکی شەڕانی و دەمپیس: ١) [کنایە از آدم بدزبان و ستیزەجو] ٢) برێتی لە یەکێکی کارامە (جلال محمود. بەرگی٢. ١٢٥): ٢) [کنایە از آدم ماهر].

**کوتەکی دەستی ئەم و ئەوە:** برێتی لە یەکێك کە پیاوی ئەم و ئەو بێ، خراپەی پێ دەکەن (جلال محمود. بەرگی٢. ١٢٥): [کنایە از کسی کە آلت دست این و آن باشد و وادار بە کارهای بدش می‌کنند].

**کوتەکی لێ ناوەتە ئاو:** خۆی بۆ ناوەتەوە تا جەرزەبەیەکی چاکی پێ بگەیەنێت. هەڕەشەی لێ دەکات (جلال محمود. بەرگی٢. ١٢٥): [کنایە از قصد دارد کە بلایی بر سرش آورد و تهدیدش می‌کند].

**کوتەکی نیاگە ئاو:** برێتی لە یەکێك کە هەڕەشە ئەکا و خۆی ئامادە کردووە بۆ شەڕ و لێدانێك (معروف.٧٥): [کنایە از کسی کە تهدید می‌کند و خود را برای جنگ و درگیری آمادە کردە است].

**کوتەکی هەمیشە لە ئاودایە:** شەڕانییە (جلال محمود. بەرگی٢. ١٢٥): [کنایە از آدم ستیزەجویی است].

**کوژاندنەو:** برێتی لە نەهێشتنی هەرا و ئاژاوەیەك (خال.ف.١٠٥): [کنایە از خواباندن بلوا و آشوب].

**کورتبین:** برێتی لە بیرنەکەرەوە و هەڵەرۆ: کنایە از سرسری بودن. (معژبر.٦٢٩)

**کوردی دۆ نەدیو:** [برێتی لە یەکێك کە لەگەڵ دابونەریت ئاشنا نەبێت]: کنایە از کسی کە با آداب و رسوم آشنا نباشد. (فتاحی قاضی. بەرگی١. ٣١٤)

**کوڕی کۆڕە:** برێتی لە یەکێکی لێهاتووە کە لە هەموو کۆڕێکدا دەردەچێت (جلال محمود. بەرگی١. ٣٩١): [کنایە از آدم شایستە و لایق کە در میان هر جمعی موفق است].

**کوزەکەمتیار:** برێتی کەرستەی فریودان، بۆ وێنە: کوزە کەمتیاری پێ بێ ساعەتەن لایدام لە رێ. «مامۆستا کوردی»: کنایە از وسیلەی فریب دادن. (معژبر.٦٣٤)

**کوساگور:** برێتی لە ڕەنجبەخەسار: کنایە از آدمی کە نتیجەی تلاشش از بین رفتە. (معژبر.٦٣٥)

**کوسەك:** برێتی لە خوێڕی: کنایە از بی عرضە و ترسو. (معژبر.٦٣٥)

**کۆستکەوتن:** برێتی لە هاتنی بەڵایەکی گەورە بەسەر یەکێکا (خال.ف.١٠٥): [کنایە از کسی کە بە مصیبتی دچار شدە باشد].

**کوشتن:** برێتی لە دارکاری کردنی خەست: کنایە از کتک زدن جانانە. (معژبر.٦٣٥)

**کوچك ئەتاونێتەوە:** [برێتی لە کسێك توانای خواردنی هەموو شتی بێت و کێشەیەکشی نەبێ]: کنایە از کسی کە توانایی خوردن همە چیز را داشتە

باشد، معده‌اش قوی باشد. (حیرت.۲۸۰)

**کوچك ئەخا بەر پای:** بریتی لە کۆسپ و تەگەرە بۆ کەسێك دروست کردن: کنایە از ایجاد مانع کردن در کار کسی کارشکنی کردن، اشکال‌تراشی.

**کوچك ئەخەمە سەر دڵم:** [واتە: دەبێ بەتاقەت و خۆڕاگر بم]: کنایە از این کە باید صبر و شکیبایی پیشه بکنم. (حیرت.۲۸۰)

**کوچك ئەدا بە مل کوچکا:** [بریتی لە یەکێك کە کاری بێ کەڵك و سوود بکات]: کنایە از کار بیهوده کردن. (حیرت.۲۸۰)

**کوچك بان مەڵو** (ئەمومن.۱۵): [بریتی لە کاتێ کە گەرکیانە کەنیشکێك بۆ کوڕێ دیاری بکەن دوای دەسماچکردن و هیجوی کلکەوانەیەك ئەکەنە دەس کەنیشکەکە یا لە بەین دووکەسا مامەڵەیەك بە زوانی یا سەنەد عادی ئەوسن. کنایە از هنگامیکە می‌خواهند دختری را برای پسری خواستگاری کنند بعد از جلسه نامزدی انگشتری را بە انگشت دختر می کنند و یا میان دو نفر معاملەی زبانی یا سند کتبی می‌نویسند].

**کوچك خەڵك ئەدا لە سینگ:** بریتی لە لایەنگری کردن لە کەسێك: کنایە از هواخواهی کردن از کسی.

**کوچك دەکوڵێنێ:** بریتی لە یەکێك کە هەوڵی بێ سوود ئەدا (خاڵ.۳۲۳/جلال محمود. بەرگی۱. ۲۸۹): [کنایە از تلاش بیهوده کردن].

**کوچك دڵ:** [بە یەکێکی بێبەزەیی دەوترێ]: کنایە از آدم بی عاطفە و نامهربان. (حیرت.۲۸۰)

**کوچکگلاندن:** بریتی لە کاری قورس و گرنگ کردن: کنایە از کار سنگین کردن.

**کوچکێ بخە بە ئاسمانا:** [واتە: کارێك یان قسەیەك بکە بەڵکوو ببێتە هۆی دەسکەوتێکی باش]: کنایە از کاری بکن یا سخنی بگو کە موجب بە دست آمدن چیز خوبی شود. (حیرت.۲۸۰)

**کولبوون:** بریتی لە ماندوو بوون لە کارێکا (خاڵ.ف.۱۰۹): [در انجام کاری خستە شدن].

**کوڵە کردن:** بریتی لە گوێ هەڵ خستن بۆ قسەدزین (خاڵ.ف.۱۱٤): [کنایە از دزدکی گوش دادن، استراق سمع].

**کوڵەفتنە:** [بریتی لە یەکێکی ئاژاوەگێڕ و گێرەشێوێن]: کنایە از آدم آشوبگر و دوبهم‌زن. (حیرت.۲۸۳)

**کوڵەوبیاب:** بریتی لە مەردومی بەئاشووب (خاڵ.ف.۱۱٤): [کنایە از آدم آشوبگر].

**کوڵەی تێ:** [بریتی لە یەکێك کە دڵێ پڕ بێ و ئامادەی گریان بێت]: کنایە از کسی کە دل پری دارد و آمادەی گریستن است. (حیرت.۲۸۳)

**کوڵخواردن:** بریتی لە ڕقهەستان و جۆشخواردنی دەروون (خاڵ.ف.۱۱۰): [کنایە از خشمگین شدن و بە جوش آمدن].

**کوڵك ئەڕژنێ ئەرزنێ:** [بە یەکێکی هەژار و نەدار دەڵێن]: کنایە از آدم فقیر و ندار. (حیرت.۲۸۳)

**کوڵك ئەرزنێت:** ۱) بریتی لە یەکێکی سەقیل و ماڵخۆنەخۆر: ۱) [کنایە از آدم خسیس]، ۲) بریتی لە کەسێکی دەستتەنگیش (رخزادی.۲۸۸): ۲) [کنایە از فقیر و ندار].

**کوڵك و موو شی دەکاتەوە:** بریتی لە یەکێك کە درێژە بە قسەی پڕوپووچ بدات (جلال محمود. بەرگی۲. ۱۲٦): [کنایە از کسی کە سخنان بیهودە را بسیار تکرار کند، متە بە خشخاش بزند].

**کوڵکە بوو بە ماڵ:** [بریتی لە یەکێکی هەژار کە

دەوڵەمەند بێتەوە]: کنایە از فقیری کە وضع زندگیش خوب شود. (حیرت.٢٨٣)

**کوڵکەوموو شیەوکردن:** برێتی لە یەکێك کە درێژە بە قسەی پڕ و پووچ بدات و لە سەر قسە بڕوات: کنایە از کسی کە بە صورت افراطی رودە درازی و موشکافی کند.

**کوڵکەی سەر بە خوێن:** [برێتی لە پیرەژنی فێڵباز و خوێنەونەر]: کنایە از پیرزن فرهادکش و نیرنگ‌باز. (حیرت.٢٨٣)

**کوڵنجە:** برێتی لە کچی تازە پێگەیشتو: کنایە از دختر نورسیدە. (مەژار.٦٤٠)

**کوڵوکۆ دامرکیان:** ١) برێتی لە یەکێك کە جۆش و هەستی دەروونی کپ و خاو بووەوە: ١) کنایە از فروکش کردن اشتیاق و ذوق کسی ٢) برێتی لە یەکێك ویست و ئاواتەکانی دامرکابێت: ٢) کنایە از کسی کە آرزوهایش فروکش کردە باشد. (جلال محمود. بەرگی١. ٣٩٣)/(فتاحی قاضي. بەرگی١. ١٣٥)

**کولێرە چەور کردن:** [برێتی لە خوڵتە کردن]: کنایە از چاپلوسی و ریاکاری کردن. (فتاحی قاضي. بەرگی١. ٣١٥)

**کومبەتاڵ:** برێتی لە بێوەژن: کنایە از بیوەزن. (مەژار.٦٤٤)

**کومڕەش:** برێتی لە عاجز، وەڕەز، جاڕز: کنایە از ملول، پکر، برێتی لە ئێرانی: کنایە از ایرانی، برێتی لە ئێرەیی: کنایە از حسود. (مەژار.٦٤٤)

**کون بە سەهۆڵ ناگیرێت:** برێتی لە یەکێك کە چارەی شتێك بە شتێکی هیچوپووچ بکات واتە ئەم چارەیە سەرناگرێت (جلال محمود. بەرگی١. ٣٩٤): [کنایە از کسی کە علاج چیزی را با چیز بی‌پایە و اساس بکند و این راەحل بە انجام نخواهد رسید].

**کون لە جەرگیدا نییە:** برێتی لە یەکێکی زۆر ئازا و بەجەرگ (جلال محمود. بەرگی١. ٣٩٤): [کنایە از فرد بسیار شجاع].

**کونا مشکی لێ بوو بە قەیسەری:** [برێتی لە یەکێك کە زۆر ترسابێت]: کنایە از ترس و وحشت بسیار. (حیرت.٢٨٤)

**کونەبا:** برێتی لە درۆزنی بەشاتوشووت: کنایە از دروغگوی لاف زن. (مەژار.٦٢٦)

**کونەمشکی لێ بوو بە قەیسەری:** برێتی لە یەکێك کە لە ترسدا شوێنی نەبێ خۆی تێدا بشارێتەوە (جلال محمود. بەرگی١. ٣٩٣): [کنایە از کسی کە از ترس جایی پیدا نکند کە خود را در آن مخفی سازد].

**کونی بە خێر کراوەتەوە:** [برێتی لە کچێك لە کچێنی نەمابێ و بوویێتە ژن]: کنایە از دختری کە بکارتش از بین رفتە و زن شدە است. (فتاحی قاضي. بەرگی١. ٣١٦)

**کووانی حەوت سەر:** [برێتی لە دومەڵی چارەنەکراو]: کنایە از دمل بدخیم علاج‌ناپذیر است. (فتاحی قاضي. بەرگی١. ٣١٦)

**کووزەڵەبەنانبوون** (مریوخ.١٨): [برێتی لە زۆر دەستتەنگ و فەقیر بوون: کنایە از شدت گدایی].

**کوولەکە سەرە:** [برێتی لە یەکێکی بێ‌مێشك]: کنایە از آدم بی‌مغز میان تهی. (حیرت.٢٨٥)

**کوویی:** برێتی لە هیچ نەزان: کنایە از وحشی. (مەژار.٦٤٨)

**کوێر بووەوە:** دەڵێن ئەو بنەماڵەش کوێر بووەوە: واتە کەس لە وەجاخیاندا نەما (جلال محمود. بەرگی١. ٣٩٤): [کنایە از خانوادەای کە هیچکدام از افرادش نماندە باشد و از بین رفتە باشند].

**کوێرایی بە چاویدا هاتووە:** برێتی لە یەکێك کە وریا نەبێت و سەرنج نەداتە بەر پێی یان کارەکەی (جلال محمود. بەرگی١. ٣٩٤): [کنایە از کسی کە هوشیار نباشد و عواقب کارش را ننگرد].

**کوێرایبیت داهاتگه:** [بە یەکێك دەوترێ کە بەدبەختی و نەهاتی رووی تێ کردبێ]: کنایە از کسی کە بدبختی و بدشانسی بە او رو آوردە باشد. (حیرت.٢٨٥)

**کوێرنان (نان کوێر):** برێتی لە کەسێك کە ناندەر نەبێ (خال.ف.١٢٢): [کنایە از آدم خسیس].

**کوێری کردەوە:** برایەوە، کوژاندییەوە نەیهێشت (جلال محمود. بەرگی١. ٣٩٤): [کنایە از تمامش کرد نابودش ساخت، خاموشش کرد و چیزی از آن نگذاشت].

**کۆتەرە:** برێتی لە پەلەورێك کە باڵی نەمابێ (خال.ف.٩٧): [کنایە از پرندەی بی بال].

**کۆتر لە دەماخا پەڕین** (مریوخ.١٧): [برێتی لە بەکەیف و شادبوون: کنایە از شاد بودن].

**کۆتر لە دەماخی ئەپەڕێ:** [برێتی لە یەکێکی زۆر خۆشحاڵ و بەکەیفە]: کنایە از آدم شاد. (حیرت.٢٧٩)

**کۆپانی دەجاڵ:** [برێتی لە دووپاتکردنەوەی کارێك کوتومت وەکوو جاران]: کنایە از کاری است کە پس از گذشت مدتی عیناً باید آن را از سر بگیرند و از نو تکرار کنند. (فتاحی قاضی. بەرگی١. ٣١٤)

**کۆرمباف:** برێتی لە پیاوی ئازا و نەترس: کنایە از مرد شجاع. (معژر.٦٣٢)

**کۆزروبەربانان:** برێتی لە لێدانی زۆر لە یەکێك (خال.ف.١٠٤): [کنایە از کسی را بسیار زدن].

**کۆستەکۆستە:** برێتی لە چاوڕاکردنی چەن کەسێك لە گەڵ یەکێك بۆ دەستبڕین و هەڵ خەڵەتاندنی (خال.ف.١٠٦): [کنایە از انتظار کشیدن چند نفر برای فریب دادن کسی].

**کۆستی کەوتووە:** برێتی لە یەکێکی باوان شێواو (خال.٣٣٥): [کنایە از کسی کە خانە پدرش آشفتە و بدبخت شدە باشد].

**کۆچکردن:** برێتی لە مردن (خال.ف.٩٨): [کنایە از مردن].

**کۆچی دوایی:** برێتی لە مردن: کنایە از مرگ. (معژر.٦٢٧)

**کۆکەل:** برێتی لە ئازا: کنایە از آدم شجاع. (معژر.٦٣٢)

**کۆڵانکوت:** برێتی لە مەردومی گەڕۆك (خال.ف.١٠٩): [کنایە از آدمی کە زیاد این طرف و آن طرف می‌رود].

**کۆڵە هێلکەی هێناوە:** واتە بێ کەڵکە و ناز و نووزیش ئەکا (معروف.٧٥): [کنایە از آدم بی‌سود کە ناز و عشوە هم می‌کند].

**کۆڵەکەی ماڵ:** [برێتی لە پیاوی گەورەی ماڵ]: کنایە از مرد بزرگ خانە. (فتاحی قاضی. بەرگی١. ٣٠٩)

**کۆڵەوەژی جەهەننەم:** [برێتی لە یەکێکی بە تەواوی تاوانبار]: کنایە از کسی کە سراپا تقصیر و گناە باشد. (فتاحی قاضی. بەرگی١. ٣١٠)

**کۆڵەی کوتا:** ١) پەکی خست و لە برِی بردەوە، دەستی بەستەوە: ١) [کنایە از او را از کار انداخت، دستش را بست توانش را محدود کرد] ٢) زیانێکی گەورەی پێ گەیاند: ٢) [کنایە از آزار بزرگی بە او رساند] ٣) ئازارێکی زۆری دا (جلال محمود. بەرگی١. ٣٩٢): ٣) [کنایە از آزار بسیاری بە او رساند].

**کۆڵوی کوتا:** واتە داماو و سەر لێ شێواوی کرد: کنایە از این کە او را بیچارە و مستأصل کرد.

**کۆنە چەکمەرەق:** برێتی لە پیاوی بووەی لێکەوتووی بەفیز (خال.ف.١١٩): [کنایە از آدم ثروتمند و متکبر].

**کۆنە پۆش:** برێتی لە پیاوی تەرکەدنیای خواخواز: کنایە از مرد زاهد. (معژر.٦٤٦)

**کۆنە پیاوە:** [برێتی لە پیاوێکی خاوەنئەزموون و خاوەنچاکە و ئاکارباش]: کنایە از کسی تجارب و

اندوختەهای معنوی دارد. (فتاحی قاضی. بەرگی ١. ٣١٠)

**کەوتوومتە هەواری خاڵی:** برێتی لە یەکێك کە بە هیوای شتێك، بۆ شوێنێك چووە بەڵام لەوێ خێری لە شتەکە نەدیوە (جلال محمود. بەرگی ٢. ١٢٢)؛ [کنایە از کسی کە بە هوای چیزی بە جایی رفتە امّا در آنجا سودی عایدش نشدە باشد].

**کەر ئاوس دەکا:** [واتە کەسێك کە لە خراپەکردندا زۆرزان و وەستایە]: کنایە از دانا در خرابکاری. (حیرت. ٢٨٧)

**کەر بە بارە و گوم ئەکا:** [برێتی لە یەکێکی گێژوویژ و نەزان]: کنایە از آدم نفهم و کودن. (حیرت. ٢٨٨)

**کەر بە بارەوە و ناڵ ئەکەن:** [برێتی لەوەی کە هەمووشتێکی بە فێڵبازی ئەسێنن، ڕووتی دەکەنەوە]: کنایە از همە چیزی را با مکر و حیلە از او می‌گیرند و لختش می‌کنند. (حیرت. ٢٩١)

**کەر بە کۆپانە و ئەناسێ:** [برێتی لە یەکێکی زۆر گێژ]: کنایە از آدم بسیار کودن. (حیرت. ٢٨٨)

**کەر بە کۆپانەوە خواردن** (ئەمومن. پ. ٥٧): [برێتی لە فرەخۆر: کنایە از آدم پرخور].

**کەر بووە:** ١) برێتی لە یەکێك کە لە خشتەبراوە و لاس دراوە: ١) [کنایە از کسی کە فریب دادە شدە است] ٢) توورە بووە و زمانلرێژی دەکات: ٢) [کنایە از خشمگین شدە و زبان‌درازی می‌کند] ٣) هەڵسوکەوتی کەرانەیە (جلال محمود. بەرگی ١. ٢٧٠)؛ ٣) [کنایە از رفتاری احمقانە دارد].

**کەر تەمەڵ ماتڵ چۆشە:** [واتە مرۆڤی تەمەڵ دەبێ گرژی بکەینەوە و نەقیزەی دەوێ]: کنایە از این کە آدم تنبل سیخک می‌خواهد. (حیرت. ٢٨٩)

**کەر ڕەنگ ئەکا:** برێتی لە شتێکی بەرچاو کە بۆ خەڵەتاندنی یەکێکی ساویلکە کە کەڵکی لێ وەردەگرن: کنایە از هر چیز کە ظاهر فریبندە دارد و برای گول زدن یا تلکە کردن اشخاص سادەلوح بە کار می‌برند.

**کەر ڕەنگ ئەکەن:** کڵاوبەرداری کردن و خڵەتاندنی خەڵك: کنایە از گول زدن و کلاە برداری.

**کەر کۆپان ئەکەن:** برێتی لە چەوساندنەوە بە فێڵبازی: کنایە از فریبکارانە ستم نمودن.

**کەر لە چاویدا قازییە:** برێتی لە مرۆڤێکی بێ‌مێشك و کەودەن (جلال محمود. بەرگی ١. ٢٧٠)؛ [کنایە از آدم بی‌مغز و کودن است].

**کەر لە کاروان گل ئەداتەوە:** برێتی لە خاوەن قەرزی ناپیاو و بێ‌ویژدان (خال. ٣٤٤)؛ [کنایە از صاحب قرض بی‌انصاف بی‌وجدان].

**کەر لە ماڵیاندا بکەوێت دانی دەشکێت:** واتە زۆر هەژارن و ماڵەکەیان ڕووتە (جلال محمود. بەرگی ١. ٢٧١)؛ [کنایە از شخص بسیار درماندە و فقیر و بی‌چیز].

**کەر لە هەرگا، ئەگێ:** برێتی لە یەکێك کە لە تەنگـانەدا زۆر بۆ کەسێك بێنێ و تەنگی پێ هەڵچنێ، هەلپەرەست؛ (خال. ٣٤٣) [کنایە از کسی کە در تنگنا بر شخص دیگری فشار بیاورد و او را در مضیقە قرار دهد، فرصت‌طلب].

**کەر و خۆڵەمێش؟:** [برێتی لە دووکەس خزماتیەکیان بە یەکەوە نەبێ یا پێوەنی دووریان بێ]: کنایە از دو تن است کە با هم نسبت فامیلی نداشتە باشند و یا نسبت خیلی دور و فراموش شدە داشتە باشند. (فتاحی قاضی. بەرگی ١. ٣٢١)

**کەر و گا لە یەك جیا ناکاتەوە:** [بە یەکێکی گێژ و نەزان دەڵێن]: کنایە از آدم بی‌نهایت نادان و ابلە. (حیرت. ٢٩٢)

**کەر و کوولەکە:** [برێتی لە هەژاری و دەس تەنگی]:

کنایه از درماندگی و گدایی. (فتاحی قاضی. بەرگی ۱. ۳۲۱)

**کەراوکەر کەوتوون:** بریتی لە دووکەس کە هەڵسوکەوتیان لەگەڵ یەکدا ناتەواو بێت و لە هۆشەوە نەبێت (جلال محمود. بەرگی ۱. ۳٦۹)؛ [کنایه از دو نفر که معاشرتشان با هم ناتمام و ناجور و فاقد عقل باشد].

**کەربازارە:** بریتی لە کارێکی بێسەروبەر، بەرەڵایە، هیچی بەسەر هیچەوە نییە (جلال محمود. بەرگی ۱. ۳٦۹)؛ [کنایه از کاری بی سر و سامان و بی نظم و قاعده که بر هیچ پایه و اساسی نباشد].

**کەر بگێت سەقەتی دەکات:** بو گاڵتەیە واتە نەزانە، دەست بۆ هەر کارێك ببات چەواشەی دەکات و تێکی ئەدات (جلال محمود. بەرگی ۱. ۳۷۰)؛ [برای شوخی و مسخره است کنایه از آدم ناآگاهی که دست به هر کاری بزند آن را بر هم می‌زند].

**کەربوون:** بریتی لە زۆر ساردبوونی ئاو بە بەفر یا سەهۆڵ تێکردن (خاڵ.ف.۱۲۸)؛ [کنایه از آب بسیار سرد].

**کەرە پۆسەر:** بریتی لە پیری سەرسپی کەم فام: کنایه از پیر نفهم. (مەژار.٦٥٥)

**کەرتر:** بریتی لە مەردومی نەزان و فرەدووی قسەرەق (خاڵ.ف.۱۲۷)؛ [کنایه از آدم وراج].

**کەرترێنە:** بریتی لە سەربەرەوژوورەیی زۆر ڕژد: کنایه از سربالایی سخت، بریتی لە دوامین کایەی گۆرواباز: کنایه از آخرین دور جوراب‌بازی. (مەژار.٦٥٢)

**کەرمگا:** بریتی لە زۆرداری زاڵم: کنایه از آدم زورگو. (مەژار.٦٥٥)

**کەرمکە کۆپانی لار کردووە:** [بریتی لە ژنێك کەوتبێتە نێو کاری خراپەوە]: کنایه از زنی که بدکاره شده باشد. (حیرت.۳۹۲)

**کەرە مەمرەیان پێ خست:** زۆریان لێ دا و خستیانە مردن ئەمە لەوەوە هاتووە کە دەڵێن: کەرە مەمرە بەهارە کورتانت بۆ دێنم لەو شارە: کنایه از کسی که تا حد مرگ او را بزنند که در اثر زدن شدید نزدیک به مرگ باشد: خره نمیر بهار است پالانی از آن شهر برایت می‌آورم.

**کەرەو سیراج لە وەخت خۆیا خۆشە:** [واتە: هەر کارێ لە کاتی خۆیا و هەر شتێك لە جێگەی خۆیا باشە]: کنایه از این که هر کار به موقع خود و هر چیزی بجای خویش نیکوست. (حیرت.۳۹۲)

**کەرسەگ:** بریتی لە بەدیەمن گێلی بە دڵ لەسەرهۆش: کنایه از ظاهر احمقانه و باطن دانا داشتن. (مەژار.٦٥٣)

**کەرسواری ئەکا:** [دەسەڵاتداری زاڵم و چەوسێنەر]: کنایه از کسی که بر جمعی نادان و ابله حکومت کند. (حیرت.۳۹۰)

**کەرگاکۆرە:** بریتی لە کەمووسکە، زۆرکەم: کنایه از بسیار اندک. (مەژار.٦٥٤)

**کەرفام ئەکەن:** بریتی لە بە باشی تێنەگەیەنن: کنایه از کسی را درست و کامل حالی کردن.

**کەرمجینی:** بریتی لە زۆر چەپەڵی و گەماری: کنایه از بسیار آلوده. (مەژار.٦٥٤)

**کەرویشك بە عەرەبانە دەگرێ:** بریتی لە یەکێکی فێڵاوی و بەسیاسەتە کە کارەکەی بە هێوری بەرەوپێش دەبات (جلال محمود. بەرگی ۲. ۱۲۰)؛ [کنایه از آدم نیرنگ‌باز و سیاستمدار که کارش را آهسته و از روی نقشه به پیش می‌برد].

**کەری ئەم بارە نییە:** بریتی لە یەکێك کە دەرەقەتی ئیشێك نەیەت، واتە: ئەم کارە بەو ناکرێت (جلال محمود. بەرگی ۱. ۳۷۱)؛ [کنایه از کسی که توانایی انجام کاری را نداشته باشد، یعنی این کار توسط او انجام نمی‌گیرد].

**کەری بە پێغام ئاو ئەخواتەوە:** [بریتی لە یەکێك کە بە شۆن ئیش و کاری خۆیدا نەچێت و بە کەسێکیتر

بسپێرێت کە بیکا بۆی]: کنایە از کسی خود دنبال کارش را نگیرد و بە دیگری بسپارد کە انجام دهد. (حیرت.۳۹۳)

**کەری خۆی بەستۆتەوە:** بریتی لە یەکێك کە کارەکەی خۆی بنجبەست کردووە و دڵنیایە (جلال محمود. بەرگی۱. ۳۷۱): [کنایە از کسی کە کار خویش را تثبیت و محکم کردە و نسبت بە درستی و بی‌نقصی آن مطمئن است].

**کەری خۆیەتی و گوێی ناڵ دەکات:** واتە ماڵی خۆیەتی و چی لێ دەکات دەیکات، کار بە ئارەزووی خۆی دەکات (جلال محمود. بەرگی۱. ۳۷۲): [کنایە از کسی کە مالك اموال خویش است و هرچە دلش می‌خواهد می‌کند انجام می‌دهد و بە میل خود عمل می‌کند].

**کەری کێ توپیوە!؟:** بۆ سەرسوڕمان و تەوەسە، بریتی لە یەکێك کە کارێکی باش بکات و لێی نەوشێتەوە (جلال محمود. بەرگی۱. ۳۷۲): [از روی تعجب و طعنە بە کسی گفتە می‌شود کە کاری آنچنان خوب انجام دهد و آن را رها نکند].

**کەری لە پرد پەڕیگەسەو:** واتە گیروگرفتی یەکێك لابردن و بە ئاوات خۆ گەیین: کنایە از مشکل کسی را رفع کردن و بە مراد خود رسیدن.

**کەری نێر نایکێشێ:** بریتی لە یەکێکی بەفیز و دەعیە (جلال محمود. بەرگی۲. ۱۲۰): [کنایە از آدم متکبر].

**کەریاوی پێ ئەکا:** [بریتی لە یەکێك کە لە وەرزی گەرما جلوبرگی زۆر لەبەر بکا]: کنایە از پوشیدن لباس در فصل گرما. (حیرت.۳۹۳)

**کەس بە کەس نییە:** [بریتی لە جێگایەکی قەرەباڵغ و ئاڵۆز]: کنایە از هرج و مرج. (حیرت.۳۹۵)

**کەس خەتی ناخوێنێتەو:** [واتە کەس بایخ بە قسەی نادات و ڕێزی بۆ دانانێ]: کنایە از سخنش بی اثر است و احترامی در میان مردم ندارد. (حیرت.۳۹۶)

**کەس شان لە شانی نادات:** بریتی لە مرۆڤێکی پایەبەرز و بەدەسەڵات (جلال محمود. بەرگی۱. ۳۷۳): [کنایە از فرد والامقام و قدرتمند].

**کەس کاغەزی کەس ناخوێنێتەوە:** کەس گوێ لە قسەی کەس ناگرێت کەس بە تەنگ کەسەوە نایەت. بە دانیشتنێك دەڵێن کە هەموویان قسە بکەن کەس گوێ لەوی تر نەگرێت (جلال محمود. بەرگی۱. ۳۷۳): [کنایە از کسی کە گوش بە حرف کسی دیگری ندهد و در تنگنا کسی بە یاری و کمك دیگری نشتابد و کنایە از مجلس و محفلی کە همە سخن می‌گویند ولی هیچ کس حرف دیگری را گوش نمی‌کند].

**کەس نایژێت خاڵۆکەرت بە چەند:** کەس لێی ناپرسێتەوە، گوێی ناداتێ. یەکێك ئەمە دەڵێت کە بە دەست شتێکەوە دامابێت، بیەوێت بیفرۆشێت. یان لێی قەومابێت و کەسێك نەبێت لایەکی لێ بکاتەوە. ئائومێدانە ئەوە دەڵێت: کنایە از فردی کە هیچ‌کس بە او توجهی نمی‌کند بە کسی این سخن را می‌گویند کە چیزی روی دستش ماندە باشد و بفروش نرسد یا حادثەای بر او واقع شدە باشد و کسی بە کمك او نشتابد.

**کەسا:** بریتی لە کورتەبنەوی قەڵەو: کنایە از تپولی. (مەژار.٦٥٧)

**کەسکون:** بریتی لە تەڕدەماخ: کنایە از دلخوش. (مەژار.٦٥٧)

**کەسێك دادرین:** فێربوون و ڕەچاوکردنی کردەوە و ئاکاری کەسێك وەکوو نموونەیەکی باش: کنایە از یاد گرفتن و تقلید کردن اعمال و اخلاق کسی بە عنوان الگو.

**کەشخەیی:** بریتی لە فیز و دەعیە: کنایە از متکبر. (معژر. ٦٥٨)

**کەشك ساوین:** بریتی لە یەکێك کە ئیش و کاری بێکەڵك ئەکات: کنایە از کار بیهودە.

**کەشکە ساوێکی ماگە:** [واتە ماوەیکی زۆر ناخایەنێ]: کنایە از زمان زیادی نمی‌برد. (حیرت. ٣٩٧)

**کەشکی خۆی لێناوەتەوە:** بریتی لە یەکێك کە ئیشی خۆی جێبەجێ کردووە (جلال محمود. بەرگی٢. ١٢١)؛ [کنایە از کسی کە کار خویش را بە اتمام رساندە است].

**کەشکیان پێکەوە ناکوڵێت:** ناتەبان، پێکەوە ناگونجێن. دانوویان پێکەوە ناکوڵێت (جلال محمود. بەرگی٢. ١٢١)؛ [کنایە از ناسازگارند و با هم نمی‌سازند].

**کەچەڵ و کوونی:** بریتی لە هاوقسە و ڕاز: کنایە از همراز.

**کەچەڵی کرد:** واتە مێشکی برد هێندە ئەو شتەی خواست، دای بە گوێیدا (جلال محمود. بەرگی١. ٣٦٩)؛ [کنایە از تکرار بیشتر از حد یک خوبی یا یک خواهش].

**کەڤەندەکۆ:** بریتی لە ئاسمان: کنایە از آسمان. (معژر. ٦٦١)

**کەڤنەشۆپ:** بریتی لە سەگوروشتە و چیرۆك: کنایە از قصە و سرگذشت. (معژر. ٦٦١)

**کەفتکە سەر زوانگەل:** [واتە: ناوبانگی دەرکردووە]: کنایە از بلندآوازە و مشهور شدە. (حیرت. ٣٩٧)

**کەفتگە سەری:** واتە دڵی پێوەیە و مەیلی لە سەرکردنی هەیە: کنایە از تمایل داشتن، قصد و میل انجام کاری را پیدا کردن.

**کەفتگە ناو دەس و دەم (کەوتۆتە بەر چاو و دەم):** بریتی لە یەکێك کە خەڵکی بە خێلی پێ دەبەن، پیادا هەڵدەکفێن، چاوی پێ هەڵدەهێنن (جلال محمود. بەرگی١. ٣٧٤)؛ [کنایە از کسی کە مردم بە او حسودی می‌برند].

**کەفتن:** بریتی لە بێحورمەتبوون: کنایە از بی‌قدر شدن، بریتی لە نابووتبوون: کنایە از ورشکست شدن. (معژر. ٦٥٩)

**کەفەن:** بریتی لە شتی زۆر چەرمگ بۆ وێنە: کەفەنی کردووتە بەر: کنایە از چیز بسیار سفید. (معژر. ٦٦٠)

**کەفوکوڵ:** بریتی لە کینە و ڕق: کنایە از قهر و غضب. (معژر. ٦٦٠)

**کتك ئەخەمە شواڵت:** [واتە تۆڵەت لێ ئەستێنم]: کنایە از انتقام گرفتن. (حیرت. ٣٧٤)

**کتك سەرچنار بوون:** بریتی لە یەکێك کە ببێتە گاڵتەی ئەم و ئەو و تیزی پێ بکەن: کنایە از آلت دست و تمسخر دیگران قرار گرفتن.

**کتك لەماڵیا بە چێوشەقەو نەگەڕێ:** [بریتی لە یەکێکی ڕژد و بەرچاوتەنگ]: کنایە از آدم خسیس و نان‌نخور. (حیرت. ٣٧٤)

**کتك لە ماڵیا سەفرا هەڵنێرێ:** [بریتی لە یەکێکی ڕژد و چاوچنۆك]: کنایە از آدم خسیس. (حیرت. ٣٧٤)

**کتکە نەفتینە:** بریتی لە یەکێك کە ببێ بە هۆی ئاژاوە و هەرا (خاڵ.ف. ٧٩)؛ [کنایە از کسی کە موجب آشوب و بلوایی شود].

**کەلەبەر:** بریتی لە دەرەتانی تەنگ: کنایە از راه نجات دشوار. (معژر. ٦٦٥)

**کەلە پاچەکردن:** بریتی لە شەقوپەقکردنی گیاندار (خاڵ.ف. ١٤٠)؛ [کنایە از لت و پار کردن جاندار].

**کەڵەشاخ لێگرتن:** [بریتی لە خوێن گرتن و دووبەدووبوون]: کنایە از حجامت کردن و جماع کردن. (فتاحی قاضی. بەرگی١. ٢٣١)

**کەڵەشێر ناوەخت:** بریتی لە یەکێکی وەخت نەناس (رخزادی. ٢٨٧)؛ [کنایە از کسی کە بی‌موقع و ناوقت بە هر

جایی سربزند].

**کەڵەشێر یەکێکە و تۆ سواری بویتە:** واتە لە خۆشیدایە، بە هەرکەسێ کە لە بارودۆخێکی چاکدا بێت: (جلال محمود. بەرگی٢. ١٢١) [کنایە از شادمان، کسی کە وضعش توپ باشد].

**کەڵەشێرەی خومندگیە:** [واتە گەورە بووگە و بە تەمەنی جوانی گەیشتووە]: کنایە از کسی کە بە حد بلوغ رسیدە. (حیرت.٣٩٨)

**کەڵەگایی:** برێتی لە زۆرگوتن و سەرەڕۆیی: کنایە از زور گویی. (مەژار.٦٦٦)

**کەڵەگەرم:** برێتی لە چلەی هاوین: کنایە از چلەی تابستان. (مەژار.٦٦٦)

**کەڵەکەترە:** ١) برێتی لە سەریەك کەڵەکەکراوی لەرمان نزیك: ١)کنایە از بر هم انباشتەی سست بنیان، ٢) برێتی لە کارێ کە ناشێ سەربگرێ: ٢)کنایە از کاری کە عملی نمی شود. (مەژار.٦٦٦)

**کەڵەکی دا:** فێڵی لێ کرد، درۆی لەگەڵدا کرد (جلال محمود. بەرگی١. ٣٧٥): [کنایە از فریبش داد، بە او دروغ گفت].

**کەڵەمەکردن:** برێتی لە بەیدەستکردنی گیاندار (خال.ف.١٤٢): [کنایە از رام کردن حیوان].

**کەڵکەڵەیە:** [واتە دڵی ئەخوازێ و مەیلی لێیە کارێك بکا]: کنایە از هوس کاری را کردن. (حیرت.٣٩٧)

**کەڵلە رەق:** برێتی لە مەردومی رەق ئەستور (خال.ف.١٣٩): [کنایە از لجباز].

**کەڵلەبۆش:** برێتی لە مەردومی بێتاوەز (خال.ف.١٣٨): [کنایە از آدم تهی مغز بی‌عقل].

**کەڵلەبا:** برێتی لە مەردومی خودسەری کەڵلەڕەق (خال.ف.١٣٨): [کنایە از آدم لجوج].

**کەڵلەتەزێن:** برێتی لە خواردن و خواردنەوەی زۆر سارد: کنایە از خوردن و آشامیدنی بسیار سرد. (مەژار.٦٦٤)

**کەڵلەزاور:** برێتی لە مەردومی ترسەنۆك (خال.ف.١٣٩): [کنایە از آدم بزدل].

**کەڵلەگەرم:** برێتی لە مرۆی تووڕە و تۆسن: کنایە از آدم عصبانی. (مەژار.٦٦٤)

**کەڵلەکۆن:** برێتی لە مەردومی کۆنەپەرست (خال.ف.١٣٩): [کنایە از آدم مرتجع].

**کەڵلەیی:** برێتی لە مەردومی شێت (خال.ف.١٣٩): [کنایە از آدم دیوانە].

**کەڵی شەمیلەخواردوو:** [برێتی لە یەکێکی خۆ بە زلزان و ملهوڕ]: کنایە از آدم مغرور و سرکش. (فتاحی قاضی. بەرگی١. ٣٣١)

**کەم بڕێسە:** [واتە کەم درۆ بێژە]: کنایە از این کە کم دروغ سرهم کن. (حیرت.٣٩٩)

**کەم جیقلدان:** برێتی لە یەکێك کە زۆر زوو تووڕە ئەبێ (خال.ف.١٤٤): [کنایە از کسی کە بسیار زود عصبانی می‌شود].

**کەم چیقڵدانە:** برێتی لە بێسەبر و حەوسەڵە: کنایە از ناشکیبا. (مەژار.٦٦٨)

**کەمتەرخەم:** [بە یەکێکی تەمەڵ و بێ تاقەت دەڵێن]: کنایە از آدم بی‌توجە و تنبل. (حیرت.٤٠٠)

**کەمەر بەستەیە:** پەنابەرە. هانابەرە. لە گۆرانییەکی فۆلکلۆریدا دەڵێ (جلال محمود. بەرگی٢. ١٢١): [کەمەر بەستەی خەلیلم]: (کنایە از پناهندە، دادخواە، متکی].

**کەمەربەستە:** برێتی لە پەنابەر: کنایە از پناهندە. (مەژار.٦٦٩)

**کەمەندکێش:** برێتی لە عاشقبوونی شێخی تەریقەت یا کچی جوان: کنایە از مجذوب پیر طریقت و عرفان یا

عاشق دختر جوان شدن. (معزبر.٦٦٩)

**کەموکوڕی:** بریتی لە ناداری (خال.ف.١٤٤): [کنایە از فقیری].

**کەناراو:** بریتی لە جێگەی دەستبەئاو: کنایە از مستراح، توالت. (معزبر.٦٦٩)

**کەنلووەکۆن:** [بریتی کە یەکێکی پێیەوبووگ و قەڵەو]: کنایە از آدم چاق و خپلە. (قتاحی قاضی. بەرگی١. ٣٣٢)

**کەو لە بگارا دەگیرێ** (مردوخ.١٨): [بریتی لە هەل و دەرفەتی شیاودا کەڵك وەرگرتن: کنایە از استفادە درست از فرصت‌ها].

**کەو لە کۆیە کەفی لە سەرسەختی خوەی نییە کەفی:** بریتی لە یەکێکی زۆر سەرسەخت و کەللەڕەقە. کەو لە کێو دەکەوێتە خوار بەڵام لە سەر سەختیی خۆی وازناهێنێ (جلال محمود. بەرگی٢. ١٢٢): [کنایە از فرد بسیار سرسخت و لجباز. کبک از کوە بە پایین می‌افتد امّا از سرسختی خویش دست برنمی‌دارد].

**کەوا سوور بەرتیپ:** [بریتی لە یەکێك کە کارێ پێکەنینی بکات تا خەڵك پێ بکەنن و شاد بن یان کەسێك کە گاڵتەی پێ بکرێ]: کنایە از دلقك، شخص مورد تمسخر. (حیرت.٤٠٢)

**کەوتۆتە بەرچاوودەم:** خەڵکی چاوی پێدا هەڵ دەکفێنن. لێی دەڵێن (جلال محمود. بەرگی٢. ١٢٢): [کنایە از کسی کە مورد حسد قرار گیرد].

**کەوتۆتە پینەوپەڕۆ:** ١) بریتی لە یەکێك کە هەژار کەوتوبێت و کارەکەی کورتی هێنابێ: ١) [کنایە از کسی کە فقیر شدە باشد و در کارش کم آوردە باشد] ٢) کەم و کوڕیی هەیە، هەوڵی چارەسەری ناتەواوییەکانی ئەدا (جلال محمود. بەرگی٢. ١٢٢): ٢) [کنایە از ناقص است، کوشش می‌کند نواقص و نارسایی ها را جبران نماید].

**کەوتۆتە خاك و پای:** دەست دامانیەتی، لێی دەپاڕێتەوە، خۆی داوە بە سەر خاکی بەرپێیدا (جلال محمود. بەرگی١. ٣٧٨): [کنایە از دست بە دامانش شدە از او التماس می‌کند، بە خاك پایش افتادە].

**کەوتۆتە ژێر دەست و پێوە:** بریتی لە یەکێك کە تووشی گاشە، سزا یان فەوتان بوو‌بێت بە هۆی دەستەولایەکەوە (جلال محمود. بەرگی٢. ١٢٢): [کنایە از کسی کە از طرف عدەایی گرفتار آشوب و بلوا و آزار شدە باشد].

**کەوتۆتە ساجی عەلی:** بریتی لە یەکێك کە هیچی بە دەستەوە نەماوە (خال.٢٥٧): [کنایە از کسی کە چیزی برایش نماندە].

**کەوتە خۆی:** ١) فریای خۆی کەوت و خۆی ڕزگار کرد: ١) [کنایە از بە داد خویش رسید و خود را نجات داد] ٢) خۆی گورج و ئامادە کرد (جلال محمود. بەرگی١. ٣٧٨): ٢) [کنایە از خویشتن را آمادە کرد].

**کەوەخنکێ:** واتە ئاو نییە: کنایە از بی‌آبی.

**کەوەر دەیجنێت:** شێنەبییە، لە ڕۆیشتن و لە کاردا (جلال محمود. بەرگی١. ٣٧٧): [کنایە از آدم شکیبا در راه رفتن و در کار کردن].

**کەوتووە بەر چاو و دەم:** بریتی لە ئێرەیی پێ دەبەن: کنایە از کسی کە زبان و چشم حسودان بر او باز شدە.

**کەوتووەتە بەر چنگی:** کەوتووەتە ژێر دەسەڵاتی، کەوتووەتە بەر دەستی (جلال محمود. بەرگی١. ٣٧٩): [کنایە از بر او غلبە کردە، بر او مسلط شدە].

**کەوتووەتە خوار و ژووری:** خەریکە ڕازی دەکات تا فریوی بدات. ملی پێ بدات بۆ ئەو ئامانجەی ئەم کۆششی بو دەکات (جلال محمود. بەرگی١. ٣٧٨): [کنایە از دارد راضیش می‌کند تا فریبش دهد و تسلیم

خواستەاش کند].

**کەوتووەتە داویەوە:** ١) دڵی تێی چووە و حەزی لێ کردووە: ١) [کنایە از عاشقش شدە و دوستش دارد] ٢) توشی بووە بە تووشیەوە و گرفتار بووە، بە فێڵ لە خشتە براوە (جلال محمود. بەرگی١. ٣٧٨)؛ ٢) [کنایە از گرفتارش شدە و با نیرنگ او را از راە بدر بردە است].

**کەوتووەتە دەراوی تەنگەوە:** گرفتار بووە و دەرهاتنەوەی ستەمە (جلال محمود. بەرگی١. ٣٧٨)؛ [کنایە از گرفتار مصیبت یا بلایی شدە کە خارج شدن از آن بسیار دشوار است].

**کەوتووەتە ژێرەوە:** دۆڕاندوویەتی و نوشوستی هێناوە (جلال محمود. بەرگی١. ٣٧٩)؛ [کنایە از شکست خوردە است].

**کەوتووەتە سەر زمان:** ناوی زڕاوە و بۆتە بنێشتە خۆشەی سەر زمانی ئەم و ئەو (جلال محمود. بەرگی١. ٣٧٩)؛ [کنایە از کسی کە بە واسطەی رویدادی یا کار بدی نامش بر سر زبانها افتادە و رسوای خاص و عام شدە است].

**کەوتووەتە سەر و کڵاوی خۆی:** بە یەکێکی هەوسارداماڵیاگ و بەرەڵا دەڵێن کە گەورەیەکی نەبێ بەرگری لێوە بکات: کنایە از کسی کە بر اثر بی‌سرپرستی افسارش گسیختە شدە.

**کەوتووەتە چەناکە کوتێ:** بریتی لە یەکێك کە لە گیانکەنشتدایە، لە سەرەمەرگدایە (جلال محمود. بەرگی١. ٣٧٨)؛ [کنایە از کسی کە در لحظات آخر عمرش بە سر می‌برد، حالت احتضار].

**کەوتووەتە گێرەوکێشە:** ١) لە هاتوچۆ دایە و ماندووە: ١) [کنایە از آدمی کە در رفت و آمد است و خستە شدە] ٢) تووش بووە (جلال محمود. بەرگی١. ٣٨٠)؛ ٢) [کنایە از گرفتار شدە است].

**کەوشسواربوون:** [بریتی لە ڕۆیشتن بو سەفەر]: کنایە از نشانەی رفتن بە سفر. (فتاحی قاضي. بەرگی١. ٣٣٤)

**کەوچکی تێ ناگەرێ:** [بریتی لە چڕوپڕبوون]: کنایە از تراکم و انبوهی. (فتاحی قاضي. بەرگی١. ٣١٧)

**کەوچکی نییە بۆ (...) دەخوات:** کە قسەی باش نازانیت خراپیشی مەکە (جلال محمود. بەرگی١. ٣٨١)؛ [کنایە از اگر نمی‌توانی سخن خوب بر زبان آوری بد نیز مگو].

**کەولەکۆن:** بریتی لە مەردومی پیری قرخنی پەككەوتە (خاڵ.ف.١٥٠)؛ [کنایە از پیر لکنتە].

**کەوڵی دەڵەکی:** [بریتی لە شتی بەنرخ و پربەها]: کنایە از چیز گرانبها و با ارزش. (فتاحی قاضي. بەرگی١. ٣٣٤)

**کەوڵی کرد:** واتە: ١) زەبوون و بێهێزی کرد: ١) [کنایە از این کە او را بیچارە و ناتوان کرد] ٢) بێزاری کرد (جلال محمود. بەرگی١. ٣٨١)؛ ٢) [کنایە از بیزارش کرد].

**کەینوبەین:** واتە هەزار تەگبیر و ڕایان بە نهێنی هەیە (جلال محمود. بەرگی١. ٣٨١)؛ [کنایە از داشتن ارتباط یا داشتن توطئە و نقشەی مشترك میان دو یا چند نفر].

**کێژ کردن:** بریتی لە چەقەی زۆر بۆ کەسێ کردن: کنایە از اصرار ورزیدن زیاد. (هەژار.٧٤٢)

**کیسەڵ ناوبێستان:** بریتی لە یەکێکی ناشیرین و کوڵ: کنایە از آدم زشت و کوتاەقد.

**کیسەلەمل:** بریتی لە کچی جوان لە ماڵی باوکی (خاڵ.ف.١٥٧)؛ [کنایە از دختر زیبا در خانەی پدری].

**کیسەهەڵدروون:** بریتی لە تەماداری یەکێك بو شتێك (خاڵ.ف.١٥٧)؛ [کنایە از منتظر بودن برای چیزی].

**کیسەی بۆ هەڵدرووە:** چاوەڕێیە ئەو شتەی دەست بکەوێت (جلال محمود. بەرگی١. ٣٩٥)؛ [کنایە از منتظر است از گرفتار شدە است].

که به دستش برسد].

**کیسکردن:** برێتی لە پیشخواردنەوەی یەکێك لە ڕقانا (خال.ف.١٥٦): [کنایە از خشم را فرو خوردن].

**کێشایە بەر یەخەیا:** [بۆ گەورە کردن و بارهێنانی هەوڵی دا]: کنایە از این کە در تربیت و پرورش او اقدام کرد. (حیرت.٤٠٤)

**کێشەوبەرە:** دەڵێن ئەم کێشەوبەرەیە بە من ناکرێت. واتە ئەم هاتوچۆ و ئەرکە گرانە بە من ناکرێت. ئەمە لە کرشەکێشان و بردنی بۆ سەرخەرمانەوە هاتووە: کنایە از این وظیفەی سنگین از عهدە ی من برنخواهد آمد.

**کێچ ئەخەمە شواڵت:** [واتە سەر لێ شێواو و ئاوارەت دەکەم]: کنایە از این کە ترا پریشان و سرگردان می کنم. (حیرت.٤٠٤)

**کێچ ناڵ ئەکا:** بە یەکێکی فێلباز و ساختەچی ئەوترێ (رخزادی.٣٠٨): [کنایە از نیرنگ‌باز و کلاهبردار].

**کێچان ئەگرێ:** برێتی لە یەکێکی بێکار و داکەوتووە: کنایە از آدم بیکار و واماندە.

**کێچکەوتنەکەوڵ:** برێتی لە پەلەپەل پێکەوتنی یەکێك (خال.ف.١٥٢): [کنایە از عجلە کردن].

**کێچهەڵهێنان:** برێتی لە پەلەپەل پێکەوتنی یەکێك بۆ بەجێهێشتنی شوێنێك (خال.ف.١٥٢): [کنایە از شتابزدگی].

**کێفەکەی گوم کردووە:** ١) [واتە گێچەڵ دەرتێرێ]. ٢) [برێتی لە یەکێك شەڕ و ئاژاوە بنێتەوە]: کنایە از کسی کە بازی درآورد، کنایە از کسی شر و آشوب بە پا اندازد. (حیرت.٤٠٥)

**کێو لە بن دەرتێرێ:** ١) [برێتی لە خەم و کەسەری زۆر]. ٢) [برێتی لە مرۆڤی بەهێز و ئازا]: ١) کنایە از غم و غصەی ممتد. ٢) کنایە از انسان قوی و زورمند. (حیرت.٤٠٥)

**کێوی:** برێتی لە مەردومی سرکی سڵ‌کردوو لەشت (خال.ف.١٥٦): [کنایە از آدم مردم‌گریز].

# گ

**گا بە پێوە قووت دەدات:** برێتی لە یەکێکی بەرتیلخور یان دزێکی چابوك کە ماڵی میری یا هی ئەم و ئەو بێ سڵ دەماشێتەوە (جلال محمود. بەرگی۱. ۳۹۶): [کنایه از آدم رشوه‌خوار یا دزد ماهری که دارایی و ثروت پادشاهی یا حاکمی یا کس دیگر را بدون هیچ ترسی ببرد].

**گا بە دەنگی ناڕوات:** بێ‌دڕکە، کەس بە هیچی نازانێت، بوودەڵە و بێ‌دەسەڵاتە (جلال محمود. بەرگی۲. ۳۹۵): [کنایه از آدم بی‌آزار و تنبل و ناتوان].

**گا بە گوندا دەناسێتەوە:** بۆ تەوس و گاڵتە پێ کردنە واتە زۆر نەزان و ناشارەزایە (جلال محمود. بەرگی۱. ۳۹۶): [برای طعنه و مسخره است و کنایه از آدم بسیار نادان].

**گا بە کلك ئەگرێ:** واتە ناشییە (معروف.۸۳): [کنایه از ناوارد].

**گا گووی کرد:** لە ڕووی سووکییەوە برێتی لە یەکێك کە قسەیەکی ناپەسەند بکات (جلال محمود. بەرگی۱. ۳۹۶): [برای تحقیر است و کنایه از کسی که حرف زشت و ناپسندی بزند].

**گا لە کولاو ڕۆژنەوە سەر دەخات:** برێتی لە دزێکی شارەزا و چابوك (جلال محمود. بەرگی۱. ۳۹۷): [کنایه از دزد آگاه و ماهر].

**گاپێ:** برێتی لە مەردومی تەمەڵ لە ڕۆینا: کنایه از سست و تنبل در راه رفتن. (مەزن.۶۸۱)

**گاگوو:** برێتی لە یەکێکی ئەحمەق و هیچ نەزان: کنایه از آدم نفهم و جاهل. (مەزن.۶۸٤)

**گاڵەی پێ کرد:** حەشری پێ کرد، زۆر لە گەڵیدا خەریك بوو، دەڵێن گاڵەی بە خواردنەکە کرد. واتە زۆری خوارد، گاڵەی بە کارەکە کرد: زۆر لە گەڵیدا خەریك بوو (جلال محمود. بەرگی۱. ۳۹۸): [کنایه از کار را با کمال نشاط انجام داد، بسیار مشغولش شد].

**گاڵیش زادی خوایە:** بە یەکێك دەڵێن کە بە چاوی سووك تەماشای خزمێکی خۆی بکات (جلال محمود. بەرگی۱. ۳۹۸): [به کسی گفته می شود که با چشم حقارت به فامیل نزدیک خویش بنگرد].

**گانەکۆڵ:** برێتی لە بەزم و هەرا (خاڵ.ف.۱۶۳): [کنایه از همهمه و شلوغی].

**گاور (دوژمن) بە جەستەی بێت:** ۱) برێتی لە یەکێك کە زۆر پەرێشانە و ئازارێکی زۆری هەیە: ۱) [کنایه از فرد بسیار اندوهگین که رنج و آزار بسیاری دارد] ۲) بارێکی نالەبار و شپرزەی هەیە (جلال محمود. بەرگی۱. ۳۹۹): ۲) [کنایه از وضعی ناهموار و پریشان دارد].

**گاوری سەرکوێ پێ موسلمان دەبێت:** برێتی لە یەکێك کە زۆر شپرزەیە و هەموو کەسێك بەزەیی پێدا دێتەوە، سا یا کۆستێکی گەورەی کەوتووە و لە شیندایە یان ئازارێکی زۆری هەیە و لە چەپۆکاندایە (جلال محمود. بەرگی۱. ۳۹۹): [کنایه از کسی که بسیار پریشان حال است و همه کس بر او ترحم می‌کنند ممکن است عزیزی را از دست داده باشد یا بیماری لاعلاجی داشته باشد و در دست و پا زدن باشد].

**گای بنە:** [برێتی لە پیاوێکی کەم دەردسەر و کەم ئەرك]: کنایه از مرد بی‌آزار و کم‌زحمت. (حیرت.۴۰۸)

**گای بێ شاخ:** [برێتی لە مرۆڤی گێژ و نەزان]: کنایه از آدم ابله و نادان. (حیرت.۴۰۸)

**گای بێ گاوانە:** برێتی لە یەکێك کە کەسێکی نەبێت

سەرپەرشتی بکات، پشتگیری و ڕاوێژی بۆ بکات (جلال محمود. بەرگی١. ٣٩٧)؛ [کنایه از کسی که مسئول و سرپرستی نداشته باشد تا او را راهنمایی و پشتیبانی کند].

**گای خۆش دۆ:** بە یەکێکی خێر و بەرەکەتدار ئەوترێ (رخزادی.٣١٣): [کنایه از شخص پرمنفعت].

**گای خۆی ئەڕانی:** واتە مافی خۆی لە بەرچاو ئەگرێ: کنایه از کسی که نفع خویش را در نظر دارد.

**گای خۆی و گارام خۆی:** برێتی لە یەکێك کە تەنیا بژیت و پێویستی بە یاری کەس نەبێت: کنایه از کسی که تنها زندگی کند و احتیاج به کمک کسی ندارد.

**گای مارۆیە:** ١) برێتی لە یەکێك کە لە هەموو شوێنێك دەناسرێتەوە: ١) [کنایه از کسی که در هر جا و مکانی شناخته شده است] ٢) چارەڕەشە و بە گوناهکاری بزانن و بێگاری پێ دەکەن (جلال محمود. بەرگی١. ٣٩٨)؛ ٢) [کنایه از آدم بدبختی که او را گناهکار بشناسد و او را به بیکاری وادار کنند].

**گای ناو گوێرەکەیە:** برێتی لە مرۆڤی گەورەساڵ کە هەمیشە لەگەڵ منداڵاندا یاری بکات (جلال محمود. بەرگی١. ٣٩٨)؛ [کنایه از آدم بزرگی که همیشه با بچه‌ها بازی کند].

**گای یەك ئاخورە:** برێتی لە یەکێك کە بیەوێت هەر بە تەنها بژی و لەگەڵ کەسدا نەبێت (جلال محمود. بەرگی١. ٣٩٨)؛ [کنایه از کسی که میل دارد تک و تنها زندگی کند و با کسی نباشد].

**گڕاندن:** برێتی لە ئاژاوە نانەوە: کنایه از آشوب به پا کردن. (معزز.٦٩٦)

**گڕ گرتن:** برێتی لە سووربوونەوە و تووڕەبوونی کەسێك (خال.ف.١٦٨): [کنایه از به خشم آمدن زیاد].

**گرانبار:** برێتی لە کەسێك کە باری ژیانی قورس و گران بێ (خال.ف.١٦٥): [کنایه از کسی که بار زندگی بر دوشش سنگینی کند].

**گرمو لە شەیتان ئەباتەوە:** برێتی لە یەکێکی زۆر فێڵباز (خال.٣٦٦): [کنایه از آدم نیرنگ‌باز].

**گرموبردنەوە:** برێتی لە سەرکەوتنی یەکێك لە کارێکی گرنگا (خال.ف.١٧١): [کنایه از پیروز شدن کسی در کاری].

**گرموی لە شەیتان بردۆتەوە:** واتە زۆر زانێکی ئەوتۆیە کەس نایگاتێ (جلال محمود. بەرگی١. ٤٠٣)؛ [کنایه از آدم نیرنگ‌باز و بسیار زیرک که کسی به پای او نمی‌رسد].

**گرتیە دەستی خۆی:** ١) خۆی کارەکەی کرد: ١) [کنایه از خود آن کار را انجام داد] ٢) خۆی سەرپەرشتی کرد(جلال محمود. بەرگی١. ٤٠٤)؛ ٢) [کنایه از خود سرپرستی و مسئولیتش را قبول کرد].

**گرداف بوون:** برێتی لە کارەسات و بەڵا: کنایه از بلا، مصیبت. (معزز.٦٨٩)

**گردگیەسە دەمەو:** [برێتی لە یەکێکی شەڕاشۆ و بێ باك کە لە سەر ئاژاوەگێڕی بەردەوام بێت]: کنایه از شخصی که در خرابکاری جری شده باشد و به آن ادامه دهد. (حیرت.٤٠٩)

**گروبەندە:** برێتی لە پیاوی زۆر ئازا لە شەڕ و جەنگ: کنایه از شجاع و جنگاور. (معزز.٦٩٢)

**گروپف کردن:** برێتی لە تووڕەبوون و زوو پەشیمان بوونەوە: کنایه از برآشفتن و به سرعت آرام شدن، برێتی لەپڕ دوڵەمەندبوون و زوو نابوودبوون: کنایه از دولت مستعجل. (معزز.٦٩٢)

**گڕی تێ بەربوو (ئاگری گرت):** ١) ئارەزوویەکی

تەواوی جوولا، سا بۆ هەر شتێك بێت: [کنایە از اشتیاق فراوان] ٢) سۆزی جوولا و بۆی شپرزە بوو، بەزەییەکی زۆری پێدا هاتەوە (جلال محمود. بەرگی١. ٤٠٣): [کنایە از دلش برایش سوخت، ترحم بسیاری بر او کرد].

**گڕی دامردەوە:** واتە ئارەزوو حەزەکەی شکا و تێربوو. بۆ خواردن بێت. سێکس بێت. گەڕان بێت (جلال محمود. بەرگی٢. ١٢٨): [کنایە از کسی کە بە آرزوی یا امیال خود برسد چە خوردن باشد، سکس باشد یا تفریح].

**گڕی گرت بۆی:** واتە بەزەیی پێداهاتەوە: کنایە از دلش بە حالش سوخت.

**گڕی گرتووە:** [واتە لە بەخێلیدا ئەسووتێ]: کنایە از حسادت دارد می‌سوزد. (حیرت.٤٠٩)

**گرێ گوێرە:** برێتی لە کارێکی دژوار کە جێ بە جێ نابێ: کنایە از کار دشواری کە حل نشود.

**گرێ کوێرمیە:** کارەکە ئالۆزە و چارەکردنی گرانە (جلال محمود. بەرگی١. ٤٠٤): [کنایە از کاری پرآشوب و بلوا کە راه‌حلش مشکل باشد].

**گرێوگۆڵ:** برێتی لە کارێ کە سەرەودەری لێ دەرناکرێ، بۆ وێنە: (وات کردە گرێوگۆڵ هەر سەر دەرناکەم): کنایە از سردرگمی. (مەژار.٦٩٤)

**گرێی بەختی کرایەوە:** برێتی لە کچێك کە شوو بکات، بە تایبەتی دەمێك بێت سەرعوزر شۆڕیش بێت و شووەکەیشی باش بێت (جلال محمود. بەرگی١. ٤٠٤): [کنایە از دختری کە شوهر کند بە خصوص مدتی هم از عوضر ماهانەاش گذشتە باشد و شوهرش هم خوب باشد].

**گزگە کۆتەرە بوون:** [بێ‌حورمەتبوون برێتی لە یەکێك کە ئیدی ڕێزی بۆ دانەنێن]: کنایە از بی‌حرمت شدن کسی در جایی. (حیرت.٤٠٩)

**گزگە کۆتەرە:** [برێتی لە ژنی پیر و پەککەوتوو]: کنایە از زن پیر و از کار افتادە. (حیرت.٤٠٩)

**گشتی کەشکە:** [واتە: هەمووی قسەی قۆڕە و گرینگ نییە]: کنایە از همەاش چرند و بی‌مورد و بی‌اهمیت است. (حیرت.٤١١)

**گشتیان پێ باڵق بوون:** [واتە: هەموو کەڵکیان لێ وەرگرت]: کنایە از همگی آن را مصرف کردە و بە کار بردند. (حیرت.٤١١)

**گلاندن:** برێتی لە خواردنی شت بە هەڵپە (خاڵ.ف.١٧٤): [کنایە از با عجلە چیزی را خوردن].

**گۆ بەل کردن:** برێتی لە کوڵەگردن: کنایە از تجسس و استراق سمع. (مەژار.٧٠٢)

**گوایە شەنە لە مەنە کەمترە:** [واتە من لە فلانی کەمترم]: گویا من از فلانی کمترم. (حیرت.٤١٢)

**گوپ گوشاد:** برێتی لە زار زل: کنایە از دهن گشاد. (مەژار.٧٠٢)

**گوپە سوورەکانی کاڵەو بوو:** [برێتی لە منداڵێك کە هەتیو بکەوێ یان لە شتێك بێ بەشی بکەن]: کنایە از بچەای کە بی‌سرپرست شود یا از چیزی محروم شود. (حیرت.٤١٢)

**گوپچڕ گوپچڕ:** [واتە بە کێشەکێش شتێك لە دەست کەسێ ڕفاندن]: کنایە از با کشمکش چیزی را از دست کسی ربودن. (حیرت.٤١١)

**گوجەدڵ:** برێتی لە ئەولاد: کنایە از اولاد. (مەژار.٧٠٣)

**گوڕەی داوێنی دێت:** ١) برێتی لە یەکێکی بەگوڕ بێت و هێشتا بە تینە و پیر نەبووە: ١) [کنایە از آدم باتوان کە هنوز سرحال است و پیر نشدە است] ٢) بۆ تەوەسە. واتە هەر لە هاتوچۆدایە، خۆی خەریك کردووە و کەسیش نازانێت بۆ (جلال محمود. بەرگی١. ٤٠٥): ٢) [برای

طعنه است یعنی در رفت و آمد است و خودش را مشغول کرده است و کسی هم نمی‌داند به چه علتی است؟].

**گورجوگۆڵە:** بریتی لە چابووك و بەدەستوبردە (جلال محمود. بەرگی١. ٤٠٧): [کنایه از آدم چابک و ماهر].

**گورز خۆی وەشاند:** ١) دەستی خۆی وەشاند و ئەوەی ویستی دەستگیری بوو: ١) [کنایه از ضربه‌ی خویش را زد و آنچه خواست دستگیرش شد] ٢) کارەکەی گەیاندە ئەنجام (جلال محمود. بەرگی٢. ١٣٠): ٢) [کنایه از کارش را به پایان رساند].

**گورزی ئاسیاو دەگێڕێ:** واتە زۆردار و ئازایە: کنایه از آدم قوی و شجاع.

**گورچکی بڕی:** ١) کوشتی: ١) [کنایه از کشتش] ٢) ئازارێکی زۆری پێ‌گەیاند: ٢) [کنایه از آسیب بسیاری به او رساند] ٣) تووشی گاشەی کرد (جلال محمود. بەرگی١. ٤٠٨): ٣) [کنایه از او را دچار آشوب و بلوا کرد].

**گورچکی قایمە:** بریتی لە بە هێز و پتەو (جلال محمود. بەرگی٢. ١٢٩): [کنایه از توانا و محکم].

**گورگ چوار چاو:** [بە کەسێك کە دەموچاوێکی ڕەش و چەپەڵی بێت دەڵێن]: کنایه از کسی که صورتی سیاه و کثیف داشته باشد. (حیرت.٤١٢)

**گورگ نەخۆرە:** بریتی لە کیژ و ژنی ناحەز: کنایه از زن بد گل. (مەژار.٧٠٥)

**گورگ و مەڕ پێکەوە ئاو دەخۆنەوە:** دنیا زۆر ئەمنە، دادپەروەری بەسەر هەموو لایەکدا باڵی کێشاوە (جلال محمود. بەرگی١. ٤٠٩): [کنایه از دنیا در امن و امان است و عدالت و دادگری در همه‌جا حکمفرماست].

**گورگ هار نایگرێ:** [بریتی لە پیرێکی بەگوڕوتین]: کنایه از پیری که خیلی سرحال باشد. (حیرت.٤١٣)

**گورگان خواردوو:** بریتی لە تووشی بەڵا بوونی بێ فریاڕەس: کنایه از بی‌یاور گرفتار شدن. (مەژار.٧٠٥)

**گورگەخەو دەکات:** واتە وەك گورگ خەوی سووکە. بەچاو نوستووە و بە دڵ وریایە (جلال محمود. بەرگی١. ٤٠٨): [کنایه از کسی که مانند گرگ خوابش سبک باشد چشمانش را بسته ولی در دل بیدار است].

**گورگەمێش:** بریتی لە زمانلووسی بەدئاکار: کنایه از منافق و چاپلوس. (مەژار.٧٠٦)

**گورگی باران دیدەیە:** بریتی لە یەکێك کە لە سەد ئاو بدات و قولی تەڕ نەبێت، واتە خاوەن ئەزموونێکی زۆرە، فێڵبازە و ناکەوێتە داوەوە: کنایه از فرد نیرنگ‌باز و مکار، که یک دفعه هم گرفتار نشده باشد. در کارش بسیار باتجربه است و به دام نمی‌افتد. (جلال محمود. بەرگی١. ٤٠٩/ مەژار.٧٠٦)

**گورگی پیرە:** بە کەسێك ئەوترێ کە ببێتە گاڵتەجاڕی خەڵك (جلال محمود. بەرگی٢. ١٣٠): [کنایه از کسی که مورد تمسخر دیگران قرار گیرد].

**گورگی هار:** بریتی لە پیاوی بەئازار و بەدکار: کنایه از مردم آزار. (مەژار.٧٠٦)

**گورێسی داوە بە دەستیەوە:** بریتی لە دەردسەر و گیروگرفت بۆ کەسێ دروستکردن: کنایه از کار دست کسی دادن.

**گوزەران ئەکا:** بە یەکێك ئەڵێن کە ژیانی پڕ لە خۆشی بێت. کنایه از کسی که زندگیش پر از شادکامی باشد.

**گوڵ دنیای چنیگە:** [بریتی لە یەکێك کە کەڵکی لە ژیانی وەرگرتبێ و خۆش ڕایبواردبێ]. کنایه از کسی که از زندگی بهره برده و خوش گذرانده است. (حیرت.٤١٦/ مەریوخ.١٨)

**گوڵ کردن:** بریتی لە کارێکی گرینگ دەسپێکردن: کنایه از کار مهمی را شروع کردن. (کریمپور.٧٦٤)

**گوڵ نیشاندان:** [داخوازکانی یەکێك قەبووڵنەکردن]: کنایه از درخواست کسی را قبول نکردن. (فتاحی قاضی. بەرگی١. ٣٥١)

**گوڵۆڵەبوون:** بریتی لە کرژبوونی جەستە لە بەر ئازارێك (خاڵ.ف.١٩١): [کنایه از جمع شدن و درهم رفتن بدن به واسطەی بیماری].

**گوڵۆڵەکردن:** بریتی لە کرژکردنی جەستەی گیاندارێك بە ئازار پێ گەیاندنی (خاڵ.ف.١٩١): [کنایه از جمع شدن و درهم رفتن بدن حیوانی به واسطەی آسیب رساندن به او].

**گوڵۆڵەی کەوتۆتە لێژی:** ١) کاری بەرەو خراپی دەروات، بۆی نایەت: ١) [کنایه از کسی که کارش رو به بدی رود و شانس نداشته باشد] ٢) چارەی رەش بووە: ٢) [کنایه از سیاەبخت شده] ٣) تەنی دروست نییە و هەمیشە نەخۆشە (جلال محمود. بەرگی١. ٤١٢)؛ ٣) [کنایه از بدنش سالم نیست و همیشه بیمار است].

**گوڵە:** بریتی لە کەسێ ژنی جوانی هەیە و ئێرەیی پێدەبەن: کنایه از مردی که زن زیبا داشته باشد و به وی رشک برند. (مەژار.٧١٦)

**گوڵك:** بریتی لە ئاوسان و با کردنی زك: کنایه از ورم کردن و بالا آمدن شکم. (مەژار.٧١٤)

**گوڵلەی گەرمت پێ ئەدەم:** [بریتی لە منداڵێك کە قینی کردبێت و پەشیمان بێتەوە و خواردەمەنی گەرەك بێ. دایکی دەڵێ گوڵلەی گەرمت پێ دەدەم لە خواردەمەنی هەواڵێك نییە. هەر کەسێك قینی کرد بەشی نامێنێ].
(حیرت.٤١٦)

**گوڵنگ برین:** بریتی لە هەڵخەڵەتاندن و دەستبڕینی یەکێك (خاڵ.ف.١٩١): [کنایه از فریب دادن کسی].

**گوڵۆڵەی کەوتووەلێژی** (مریوخ.١٨): [بریتی لە کەسێك کە بەڵا هاتبێ بە سەریدا و ژیانی بەرەو خراپە و نەمان بڕوات: کنایه از کسی که اوضاعش روبه نابسامانی است].

**گوڵی کاڵ ئەوێتەو:** [بۆ تانە و تەشەر، هیچی لێ نایەت و لێی کەمەو ناوێتەوە]: کنایه از این که ضرری به او نمی رسد. (حیرت.٤١٧)

**گوڵی کردووە:** [واتە خۆشحاڵ و بەکەیفە]: کنایه از کسی که خوشحال و سرزنده است. (حیرت.٤١٧)

**گوڵی مەجلیس:** بریتی لە مرۆی قسەخۆش و کۆڕڕازێنەوە: کنایه از مجلس آرا. (مەژار.٧١٧)

**گومڕا:** بریتی لە کەسێك کە لە دامودەستووری ئاسایی لای دابێ: کسی که از راه و رسم معمول منحرف شده باشد. (مەژار.٧١٧)

**گومڕە:** بریتی لە کەسێ لەبەر دەوڵەمەندی بایی بووبێ: کنایه از کسی که از ثروت زیاد مغرور شده باشد.
(مەژار.٧١٧)

**گون ئەتەقنێ:** بریتی لە یەکێکی بێکار و بەتاڵپا: کنایه از شخص بیکار و هرزەگرد.

**گون گەز کردن:** بریتی لە یەکێکی بێکار و بەتاڵپا: کنایه از شخص بیکار و هرزەگرد.

**گونگرتن:** بریتی لە هیچ بۆنەکران (ناتوانێ گونیشی بگرێ): کنایه از هیچ کاری نمی‌توانی بکنی. (مەژار.٧٢٠)

**گونکی سەر دڵە:** بریتی لە منداڵێك کە زۆر خۆشەویستە و یەکێك زۆر خۆشی بوێت دەڵێن ئەوە چییە ئەوەندە خۆشت دەوێت دەڵێی گونکی سەر دڵە (جلال محمود. بەرگی١. ٤١٣): [کنایه از بچەی عزیز که بسیار او را دوست داشته باشند].

**گونکژمێر:** بریتی لە یەکێك لە ناو ماڵ و منداڵیا ڕژد و چنۆك بێ و لە شت زۆر بپرسێتەوە (خاڵ.ف.١٩٦): [کنایه از

آدم خسیس].

**گونی بە سەردا شۆڕ کردۆتەوە:** بە سەریدا زاڵە، سەری پێ شۆڕ کردووە (جلال محمود. بەرگی٢. ١٣٠): [کنایە از بر او تسلط پیدا کرد، وادار بە اطاعتش کردە است].

**گونی پیشان (نیشان) دەدات (نەدا):** واتە هیچی ناداتێ. سا قەرزبێت یان قازانج بێت (جلال محمود. بەرگی٢. ١٣٠): [کنایە از چیزی بە او نمی‌دهد چە قرض باشد یا سود].

**گونی گوندار دەردێنێت:** ١) بریتی لە یەکێکی بەدەسەڵات و دەست ڕۆییو: ١) [کنایە از فرد قدرتمند و توانا] ٢) بریتی لە یەکێکی زۆردار (جلال محمود. بەرگی١. ٤١٢): ٢) [کنایە از شخص ظالم و ستمگر].

**گونی کردووە:** ١) بریتی لە یەکێك کە دەستی دابێتە بێحەیایی و لە خۆ بایی بووبێت: ١) [کنایە از کسی کە شروع بە بی‌حیایی و غرور و تکبر کردە باشد] ٢) ئاگری سێکسی تێ بەربووبێت (جلال محمود. بەرگی٢. ١٣٠): ٢) [کنایە از کسی کە آتش سکس در او شعلەور شدە باشد].

**گونی مێش دەخەسێنێت:** بە گاڵتەوە دەوترێت، بریتی لە یەکێك کە دەستبەتاڵە و کاری نییە (جلال محمود. بەرگی١. ٤١٣): [برای مسخرە. کنایە از آدم بیکار].

**گۆ بردنەوە:** بریتی لە پێشکەوتن لە هەواڵان: کنایە از سرآمد بودن. (مەزر٢.٧٠٢)

**گۆ گرتن:** بریتی لە رك هەستانی زۆر: کنایە از بە خشم آمدن زیاد. (مەزر٢.٧٠٣)

**گۆبەل:** بریتی لە مرۆی لە سەرهەست: کنایە از آدم حساس و تیزگوش در شنیدن. (مەزر٢.٧٠٢)

**گۆبەن بە شۆن:** بریتی لە ئاژاوەنانەوە: کنایە از آشوب بپا کن.

**گۆبەندی نایەوە:** ئاژاوەی خستەوە و ململانێی دروست کرد، هەراو گۆڵەمزی نایەوە دەڵێن قنگ بە گۆبەندە. واتە لە هەر شوێنێك بێت ئاژاوەیەك دەنێتەوە هەرایەك بەرپا دەکات (جلال محمود. بەرگی١. ٤٠٦): [کنایە از آشوب بپا ساختن و کشمکش و بلوا ایجاد کردن].

**گۆترمەکاری:** بریتی لە کاری بیرلێنەکراو: کنایە از کار نسنجیدە. (مەزر٢.٧٠٢)

**گۆڕ بە گۆڕ چوو:** بە ڕقەوە بریتی لە یەکێك کە مردبێت و حەز لە چارەی نەکرێت واتە ئەو چاکتر کە مرد و لە دەستی ڕزگار بووین (جلال محمود. بەرگی١. ٤٠٦): [از روی خشم گفتە می‌شود و کنایە از کسی کە مردە باشد و از دستش راحت شوند، چە بهتر کە مرد و از دستش نجات پیدا کردیم].

**گۆڕ نایگرێتە خۆی:** واتە ئەو کارە بکات زۆر گوناهبار دەبێت. یان زۆر گوناهبارە (جلال محمود. بەرگی١. ٤٠٦): [کنایە از اگر آن کار را انجام دهد بسیار گناهکار خواهد شد یا بسیار گناهکار است].

**گۆڕ هەڵناخنین:** بریتی لە جنێودانی زۆر بە گۆڕی یەکێك (خاڵ.ف.١٨١): [کنایە از دشنام زیاد بە مردە].

**گۆڕ هەڵتەکێنە:** بریتی لە مردوویەك کە لە دوای ئەو شتێکی ئەوتۆ ڕوویدابێت کە لە کاتی خۆیدا ئەو نەیهێشتبێت بکرێت، نەیویستبێت بە تەوەس یان ڕقەوە دەوترێت واتە وەرە و ببینە کار بە چی گەیشتووە (جلال محمود. بەرگی١. ٤٠٦): [کنایە از مردەای کە بعد از او کاری انجام گیرد کە در زمان حیاتش او نمی‌گذاشت انجام گیرد با طعنە و کینە گفتە می‌شود یعنی حال بیا و ببین کە کار بە کجا کشیدە است]. یا (گۆڕت بگرە بە کوڵەوە).

**گۆڕەی داوێنی دێت:** گڤەی داوێنی دێت، هێشتا بەتینە

و پیر نەبووە (جلال محمود. بەرگی ۱. ۴۰۷): [کنایه از آدم توانا و سرحال].

**گۆڕگومبوون:** ۱) برێتی لە ونبوون و نەمانی ناونیشانی یەکێك و حەز لە مردنی و تیاچوونی: ۱) [کنایه از نابود و سربه نیست شدن کسی]، ۲) برێتی لە ونبوونی ناو و نیشانی یەکێك (خاڵ.ف.۱۸۱): ۲) [کنایه از گم شدن یا مردن کسی که دوستش نداشته باشند].

**گۆڕی گوم بووە:** برێتی لە یەکێك کە دیار نەبێت و بەرچاو نەکەوێت. دەیشوترێت گۆڕی گوم بێت. واتە بڕوا و نەیەتەوە (جلال محمود. بەرگی ۲. ۱۲۹): [کنایه از کسی پیدایش نباشد همچنین گفته می‌شود (گۆڕی گوم بیت) یعنی برود و دیگر برنگردد].

**گۆڕی گومە:** بە تەوەسەوە بۆ سووکی بە یەکێك دەوترێت کە دیار نەبێت (جلال محمود. بەرگی ۱. ۴۰۷): [به عنوان تحقیر گفته می‌شود و کنایه از کسی که پیدایش نباشد].

**گۆڕی هێناوەتە گۆڕخانە:** برێتی لە یەکێك کە یەکێکی گەمارۆ دابێت و بە هەموو ڕەنگێك ئازاری بدات و تەنگی پێ هەڵچنێت (جلال محمود. بەرگی ۱. ۴۰۷): [کنایه از کسی که دیگری را به تنگ آورده باشد و به هر نوعی او را آزار و شکنجه دهد].

**گۆشت پارە:** برێتی لە زارۆی ڕۆح نەگەڕاو: کنایه از جنین جان نگرفته. (مەزهەر.۷۱۰)

**گۆشت خۆی تاڵ ئەکا:** [برێتی لە یەکێك کە کردەوە و ئاکاری ناپەسەند و ناخۆش لە خۆی دەربێنێ]: کنایه از کسی که از او رفتار ناخوشایند سرزند. (حیرت.۴۱٤)

**گۆشت ماسی ئەخوا:** واتە لسەرخۆ و بە وردی نان خواردن: کنایه از فرد بادقت و پرصبر و حوصله.

**گۆشتپیس:** برێتی لە کەسێك کە برینی درەنگ چاك بێتەوە (خاڵ.ف.۱۸٦): [کنایه از کسی که زخمش دیر التیام پذیرد].

**گۆشتخۆش:** برێتی لە کەسێك کە برینی زووخۆش ئەبێتەوە: کنایه از کسی که زخمش زود التیام پذیرد. (مەزهەر.۷۱۰)

**گۆشەگیری:** برێتی لە سۆفیەتی و تەرکە دنیایی: کنایه از زاهد. (مەزهەر.۷۱۱)

**گۆشتی ئەخوریٚ:** برێتی لە زۆر بەسەزمان و کەڕەواڵەیە (خاڵ.۳۷۲): [کنایه از آدم بیچاره و ساده‌لوح].

**گۆشتی خۆ خۆشکردن:** برێتی لە خۆ خۆشەویست کردن (خاڵ.ف.۱۸۷): [کنایه از خود را پیش دیگران عزیز کردن].

**گۆشتی خۆش بووە:** کچەکەی پێ گەییوە و هەرەتی ئەوەی هاتووە کە لە بەرچاوان بنوێنێت (جلال محمود. بەرگی ۲. ۱۳۰): [کنایه از دختری که به سن بلوغ رسیده باشد و زیبایی و طنازی خویش را نشان دهد].

**گۆشتی سەرچەپەر:** برێتی لە هەرزان قیمەت: کنایه از ارزان قیمت. (مەزهەر.۷۱۱)

**گۆشتی قیمەت ناکات:** برێتی لە کەسێکی ناشیرینە کە کەس نایخوازێت (جلال محمود. بەرگی ۱. ۴۱۲): [کنایه از آدم زشت که کسی او را به همسری برنمی گزیند].

**گۆچان بە دەسیەوە (داکەفت) داکەوت :** [برێتی لە یەکێك کە بە هۆیەك ماڵ و سامانی لە دەست بدا یان ماڵێك کە گەورەکەی بمریٚ]: کنایه از کسی که به علتی دارایی و ثروتش را از دست بدهد و یا خانواده‌ای که بزرگش بمیرد. (حیرت.۴۱۲)

**گۆهبەلی:** برێتی لە جاسوسی: کنایه از جاسوسی. (مەزهەر.۷۲۱)

**گۆهپان:** ۱) برێتی لە تەنبەل: ۱) کنایه از تنبل، ۲) برێتی لە بێئاوەز: ۲) کنایه از نفهم. (مەزهەر.۷۲۱)

**گۆهپیل:** برێتی لە تەسلیم بووگ: کنایه از تسلیم شده.

(معزبر.۷۲۱)

**گۆهرەپ:** برێتی لە نەزان و ئەحمەق: کنایە از نادان. (معزبر.۷۲۱)

**گۆهشۆر:** برێتی لە خەجاڵەت، چاوشۆڕ: کنایە از شرمسار. (معزبر.۷۲۱)

**گۆهنەسمتی:** برێتی لە گوێنەبیس: کنایە از حرف نشنو. (معزبر.۷۲۱)

**گوو بە خۆدا کردن:** برێتی لە کار بە خراپی کردن: کنایە از بی‌هنری در انجام کار. (معزبر.۷۰۲)

**گوو بە کڵاوی کەس ناپێوێت:** واتە پرس بە کەس ناکات و ڕای کەس وەرناگرێت، لاسارە، قسە هەر قسەی خۆیەتی، کەس بە هیچ نازانێت (جلال محمود. بەرگی۱. ٤٠٥)؛ [کنایە از آدم خودرای و متکبر].

**گوو بە کڵاوی ناپێون:** [برێتی لە یەکێك کەسێ گوێ پێ نادا و بە قسەی ناکەن]: کنایە از کسی کە بە او اعتنا نمی کنند. (فتاحی قاضی. بەرگی۱. ۳۲۷)

**گوو بە کوڵاوی ناپێوێت:** لە ڕووی سووکییەوە بە یەکێك دەوترێت کە کەس بە هیچی نازانێ (جلال محمود. بەرگی۱. ۳۷۳)؛ [از روی تحقیر بە کسی گفتە می‌شود کە مردم اهمیتی بە او نمی‌دهند].

**گوو خواردن:** گوو پێ خوران: کنایە از پشیمانی. (معزبر.۷۰۲)

**گوو کوڵاندنەوە:** برێتی لە ڕژدی زۆر دەسقووچاو: کنایە از خسیس. (معزبر.۷۱۲)

**گوو ناکات نەك برسی بێت:** برێتی لە یەکێکی زۆر چرووك و پیسکەیە (جلال محمود. بەرگی۱. ٤٠٥)؛ [کنایە از آدم بسیار خسیس].

**گوواوی:** برێتی لە شتی زۆر پیسی خراپ: کنایە از چیز بسیار آلودە.

**گووتێکردن:** برێتی لە کارتێکدان و خەراپکردن: کنایە از بە هم زدن و خراب کردن. (معزبر.۷۰۳)

**گووپێ:** برێتی لە بەڵێنی بێ‌کردار: کنایە از قول بی‌عمل. (معزبر.۷۰۲)

**گووپێ خوران:** برێتی لە پەشیمانی لە کارێ کە ئاکامی باش نەبووە: کنایە از پشیمانی از کار بدفرجام. (معزبر.۷۰۲)

**گووپێ خوراو:** برێتی لە کەسێ کە لە کاری خراپی خۆی پەشیمان بێ: کنایە از آدم پشیمان از کار بد خود. (معزبر.۷۰۲)

**گووخارن:** برێتی لە پەشیمانی، گوو پێ خوران: کنایە از پشیمانی. (معزبر.۷۰۳)

**گووشێلان:** برێتی لە کەوتنە دەردیسەر لە سەر کەسێ: کنایە از بە دردسر افتادن بە خاطر کسی. (معزبر.۷۱۱)

**گووشیویانە:** ۱) هیچیان پێ نەهێشتووە: ۱) [کنایە از چیزی برایش نگذاشتەاند] ۲) بێ‌دەسەڵاتیان کردووە (جلال محمود. بەرگی۲. ۱۳۰)؛ ۲) [کنایە از ناتوانش کردەاند].

**گووگرە:** برێتی لە سێڵی تازە دەرهاتگ: کنایە از سبیل تازەدرآمدە کە بە طعنە گویند. (معزبر.۷۱۲)

**گووی پێ خوراوە:** [برێتی لە پەشیمان بوونەوەی یەکێك لە کارێ]: کنایە از آدم نادم و پشیمان. (فتاحی قاضی. بەرگی۲. ۲۲۳)

**گووی پێ کرد:** ۱) شپرزەی کرد: ۱) [کنایە از پریشان حالش کرد] ۲) ترساندی، تۆقاندی (جلال محمود. بەرگی۱. ٤٠٥)؛ ۲) [کنایە از او را ترساند].

**گووی خۆی گێرە دەکا:** [برێتی لە یەکێك کە گیروودەی کردەوەی خراپی خۆی بێت]: کنایە از کسی اسیر و گرفتار اعمال بد خود باشد. (فتاحی قاضی. بەرگی۲. ۲۲۳)

**گووی دەرخوارد دا:** ۱) تەریقی کردەوە قسەکەی بە درۆ خستەوە: ۱) [کنایە از او را شرمسار و حرفهایش را دروغ پنداشت] ۲) هەڕەشەی لێ کرد توخنی ئەو

کەسە، ئەو کارە نەکەوێت، ئەو قسەیە نەکات و نەڵێتەوە (جلال محمود. بەرگی٢. ١٢٩)؛ ٢) [کنایه از او را تهدید کرد که نزدیک آن فرد یا آن کار نشود و یا آن سخن را بازگو نکند].

**گووی قیرینی پێ کرد:** ١) زۆر چەرمەسەری دا: ١) [کنایه از بسیار او را رنج و مشقت داد] ٢) ئازاری دا (جلال محمود. بەرگی١. ٤٠٦)؛ ٢) [کنایه از او را آزار و اذیت کرد].

**گوێ بەل:** برێتی لە شۆفار: کنایه از جاسوس. (مەژار.٧٢٢)

**گوێ بیس:** برێتی لە کوڵەگر: کنایه از خبرچین، جاسوس. (مەژار.٧٢٢)

**گوێ زرینگان:** برێتی لە هۆش هاتنەبەر و بەئاگابوون: کنایه از شست بیدار شدن و هوشیار شدن. (مەژار.٧٢٣)

**گوێ شلکردن:** برێتی لە گوێگرتن (خاڵ.ف.٢٠٢): [کنایه از گوش فرا دادن].

**گوێ گران:** برێتی لە مەردومی کەڕ (خاڵ.ف.٢٠٢): [کنایه از سنگین گوش].

**گوێ قولاغ وێسیاگە:** [برێتی لە یەکێك کە ئامادە بێت بۆ بیستنی قسەیەك یا بینینی شتێك یا گەیشتن کەسێك، چاوەڕوان]: کنایه از گوش به زنگ و آماده برای شنیدن یا دیدن چیزی یا رسیدن کسی. (حیرت.٤١٩)

**گوێ لە مست:** برێتی لە یەکێك کە قسەی هەموو کەس بچێ بە گوێچکەیا (خاڵ.ف.٢٠٢): [کنایه از کسی که سخن همه کس را می‌پذیرد].

**گوێ لە مشتە:** خۆش بڕوایە. چی پێ بڵێن دەیکات، بێ ئەوەی بیر لە نەنگی و سەربەرزی خۆی بکاتەوە (جلال محمود. بەرگی١. ٤١٤)؛ [کنایه از آدم خوش‌باور که هر چه بگویی انجام می‌دهد بدون این که به عیب و عار یا پیروزی خویش بنگرد].

**گوێ مشکەبوون:** برێتی لە تازە گەڵادەرکردنی درەخت (خاڵ.ف.٢٠٢): [کنایه از درختی که تازه جوانه بزند].

**گوێلدرێژ:** برێتی لە کەر (خاڵ.ف.٢٠٠): [کنایه از خر].

**گوێز نەکاتە هەوانە:** [برێتی لە یەکێك کە هەر لە پەسا تڕ بداتەوە]: کنایه از کسی که پشت سر هم تیز زند و باد در کند. (حیرت.٤١٩)

**گوێز بە گومەزدا هەڵدەخات:** ئەو ئامۆژگارییەی دەیکات جێ ناگرێت و لە گوێ ناگیرێت، کارەکەی بێ ئەنجامە (جلال محمود. بەرگی١. ٤١٥)؛ [کنایه از آن نصایحی را که می‌کند به گوشش فرو نمی‌رود و کارش بی‌سرانجام است].

**گوێزی ناو بێژنگ بوون:** برێتی لە بزۆزی ئۆقرەنەگر: کنایه از آدم ناآرام. (مەژار.٧٢٣)

**گوێزی ناو بێژنگ:** برێتی لە یەکێك بە ناچاری هەردەمە و لە شوێنێك بێ (خاڵ.ف.٢٠١): [کنایه از آدم ناآرام].

**گوێزی ناو دەخڵبوون:** برێتی لە کورتە باڵای زرنگ: کنایه از کوتاەقد چست و زرنگ. (مەژار.٧٢٣)

**گوێچکەنەلەقیان:** برێتی لە گوێ نەدانی یەکێك بە کارێك (خاڵ.ف.٢٠٠): [کنایه از گوش ندادن به حرف کسی یا انجام کاری].

**گوێچکەی پڕە:** [واتە بۆ ئەم قسە قۆڕانە ڕێز دانانێت]: کنایه از کسی که بدین یاوه‌گویی‌ها وقفی نمی‌نهد. (حیرت.٤١٨)

**گوێلەق:** برێتی لە مرۆڤی کەڕ و نەفام: کنایه از آدم احمق. (مەژار.٧٢٤)

**گوێلەقبوون:** برێتی لە بنیادەمی کەر و نەفام: کنایه از احمق. (مەژار.٧٢٤)

**گوێی بۆ لەقاند:** بۆ سووکیە، بریتی لە یەکێك کە زوو قسەی یەکێك مۆر بکات و ملی بۆ شۆڕ بکات (جلال محمود. بەرگی۲. ۱۳۱)؛ [برای تحقیر است و کنایە از کسی کە زود سخن دیگران را تایید بکند و تسلیمش شود].

**گوێی بری:** ۱) فێڵی لێ کرد و لە خشتەی برد: ۱) [فریبش داد و او را از راه برد] ۲) بە گران شتەکەی پێ فرۆشت بە هەرزان شتەکەی لە دەست دەرهێنا: ۲) [کنایە از بە قیمت هنگفتی بە او فروخت و بە ارزان از دستش بیرون آورد] ۳) تەمێی کرد (جلال محمود. بەرگی۱. ٤١٤)؛ ۳) [کنایە از او را تنبیە کرد].

**گوێی تەپە:** بریتی لە مرۆڤێکی سەرشۆڕە. کە بە هەموو نەنگییەك قایلە، واتە گوێ شۆڕە و هەرچی پێ بکەن و لێ بکەن نقە نەکات (جلال محمود. بەرگی۱. ٤١٤)؛ [کنایە از آدم شرمسار، کە رازی بە همە ننگی است. گوش بە فرمان است و هر بلایی بر سر او بیاورند صدایش درنمی‌آید].

**گوێی خۆی لێ ئاخنیوە:** خۆی لێ کەڕ کردووە. نایەوێت ئەو باسە، ئەو قسەیە ببیسێت بە تەنگ و دەربەسەوە نایەت (جلال محمود. بەرگی۲. ۱۳۱)؛ [کنایە از کسی کە خود را بە ناشنوایی زدە و نمی‌خواهد آن سخن یا قصە را بشنود و بە آن علاقەمند نیست].

**گوێی خۆی لێ خەفاندووە:** شتەکەی لە بیر خۆی بردۆتەوە و بەتەنگەوە نایەت سا قەرز بێت یان بارمتە (جلال محمود. بەرگی۲. ۱۳۱)؛ [کنایە از کسی کە چیزی را عمداً فراموش کند و نسبت بە پرداخت یا اجرای آن اقدام نکند حال چە قرض باشد یا چیزی را بە گروگان گرفتە باشد].

**گوێی خۆی لێ خەفاندووە:** چاوەڕوانی خراپەیان لێ دەکرێت، ئامادەن بۆ خراپەکردن (جلال محمود. بەرگی۱. ٤١٤)؛ [کنایە از انتظار بدی از آنها می‌رود، آمادەی بدی کردن می‌باشند].

**گوێی شل کرد:** هەرچی وترا داخوازیی لێ کرا بیستی و جێبەجێی کرد (جلال محمود. بەرگی۲. ۱۳۱)؛ [کنایە از کسی کە هرچە گفتە شد و هر چە از او خواستە شد گوش کند و انجام دهد].

**گوێی نالْ دەکات:** بو هەڕەشەیە. واتە تەمێی دەکات (جلال محمود. بەرگی۱. ٤١٥)؛ [برای تهدید است کنایە از تنبیە می‌کند].

**گەدگیر:** بریتی لە سەرسەخت و پەلْپگر: کنایە از لجاجت پیشە. (مەزهەر.۷۲۵)

**گەڕ بووە:** ۱) بریتی لە یەکێك کە بە بۆنەی کردنی کارێکی خراپەوە ڕسوای بەر چاوی خەڵك بووبێت ۲) یان هەژار کەوتبێ (جلال محمود. بەرگی۱. ۳۹۹)؛ ۱) [کنایە از کسی کە بە علت انجام دادن کاری بد در میان جامعە رسوا و بی‌آبرو شدە باشد] ۲) [کنایە از تنگدست شدە است].

**گەڕاوە:** بریتی لە مردومی سەرەی تێگەیشتوو (خالْ.ف.۲۰٦)؛ [کنایە از آدم باتجربە و فهمیدە].

**گەڕەلاوژەیە:** واتە هەر یەکە بۆ خۆی دەنگی لێ هەڵبڕیوە، سا یا قسە دەکات یان گۆرانی دەڵێت و کەس گوێ لەویتر ناگرێت و ژاوە ژاوە ئەکات و کەس لە هیچ ناگات (جلال محمود. بەرگی۱. ۳۹۹)؛ [کنایە از همهمە، جایی کە هر کسی بدون توجە بە دیگری مشغول حرف زدن است و نظمی در کار نیست].

**گەرداو:** بریتی لە بەلاّ و تووشهاتن: کنایە از ورطە. (مەزهەر.۷۲٦)

**گەردەنگرتن:** بریتی لە پێداگری و گرتنی شتێك بە کەسێك (خالْ.ف.۲۰۵)؛ [کنایە از اسرار برای گرفتن

چیزی از کسی].

**گەردن کەچە (لارملە):** ١) بارکەوتووە: ١) [کنایە از بدبخت شدە] ٢) خەفەتبارە ٢) [کنایە از غمگین شدە] ٣) بێکەس و پشتیوانە: ٣) [کنایە از تنهــاست] ٤) هــەژارە (جلال محمود. بەرگی١. ٤٠١): ۴) [فقیر است].

**گەردن لە موو باریکتر:** برێتی لە مەردومی گەردن کەچ (خاڵ.ف.٢٠٥): [کنایە از فرمانبر].

**گەردنکەچ:** برێتی لە مەردومی فەرمانبەر (خاڵ.ف.٢٠٥): [کنایە از گوش بە فرمان].

**گەردنکەچی:** برێتی لە فەرمانبەری (خاڵ.ف.٢٠٥): [کنایە از فرمانبرداری].

**گەرما و سەرمای زۆری دیوە:** برێتی لە یەکێك کە قاڵبووی ژیانە و شتی زۆری بە سەرهاتووە و دنیادیدەیە (جلال محمود. بەرگی١. ٤٠٠): [کنایە از آدم باتجربە و دنیادیدە].

**گەرمبوون:** ١) برێتی لە تازە (گەرمەبڕین): ١) کنایە از نو، ٢) برێتی لە پەلە و زوو (گەرماوگەرم گەیشتە سەری): ٢) کنایە از عجلە و زود، ٣) برێتی لە بەکار (تاژیەکی دەم گەرمە): ٣) کنایە از کاری و مؤثر. (مەژار.٧٢٧)

**گەرمەبڕین:** برێتی لە کەسێك کە تازە بە تازە خەفەتێکی زۆر قورسی تووش بووبێ (خاڵ.ف.٢٠٨): [کنایە از کسی کە لحظە بە لحظە با غم و اندوە بزرگی روبرو شود].

**گەرمکردن:** برێتی لە قسە زۆر کردنی یەکێك (خاڵ.ف.٢٠٨): [کنایە از آدم پرحرف و وراج].

**گەڕوگول بووە:** ١) پیس و بۆخڵ بووە: ١) [کنایە از کسی کە کثیف و چرکین شدە] ٢) هەژار و ڕیسوا بووە (جلال محمود. بەرگی٢. ١٢٧): ٢) [کنایە از فقیر و بی‌آبرو شد].

**گەڕوگێچەڵ:** برێتی لە فڕوفێڵ و تەشقەڵە کردن (جلال محمود. بەرگی١. ٤٠٠): [کنایە از آدم نیرنگ‌باز و آشوبگر].

**گەروو درێژ کردن:** برێتی لە گەزارە کێشان (خاڵ.ف.٢٠٩): [کنایە از زبان درازی کردن].

**گەزارە کێشان:** برێتی لە زبان درێژی (خاڵ.ف.٢٠٩): [کنایە از زبان درازی کردن].

**گەزگەز باڵا کردن:** برێتی لە زۆر پێخۆشبوون: کنایە از بسیار خوش آمدن. (مەژار.٧٣٠)

**گەزوقەیچی:** برێتی لە یەکێك کە دەسەڵات بە دەستی بێ: کنایە از صاحب اختیار.

**گەسکدان:** برێتی لە بردنی هەمووشتێ لە ماڵدا: کنایە از بردن همە چیز. (مەژار.٧٣١)

**گەسکی مزگەوتی دزیوە:** برێتی لە یەکێکی هەژار، هیچی نییە برێتی لە یەکێکی زۆر ناڕەسەن و ناتەواو (جلال محمود. بەرگی٢. ١٢٨): [کنایە از آدم فقیر کە هیچی نداشتە باشد کنایە از کسی کە بسیار بدگهر و ناتوان باشد].

**گەسکیان لێ دا:** هیچیان تێدانەهێشت، ئاشەکەیان تاڵان کرد. گەسکیان لێ دا (جلال محمود. بەرگی٢. ١٢٨): [کنایە از جایی کە هیچ چیزی از آن باقی نگذارند و همە را بە تاراج ببرند].

**گەشبوونەوە:** برێتی لە کەیفخۆشی و بەدەقی یەکێك (خاڵ.ف.٢١١): [کنایە از خوشحال و منظم بودن].

**گەمبۆڵ:** برێتی لە زۆر پیری موی توێڵ و برۆ چەرمگ: کنایە از آدم کهنسال. (مەژار.٧٣٤)

**گەنەی گون گا:** برێتی لە یەکێك کە دەس لە یەخەی مرۆڤ هەڵ نەگرێ: بە کسی اسرار باز گفتە می‌شود کە دست‌بردار نیست.

**گەندەخۆرە:** ۱) برێتی لە یەکێك کە بە شتی هەرزانەوە دەنیشیت گەرچی گەندیش بێت دەیکرێت: ۱) [کنایە از کسی که چیزهای ارزان را می‌خرد اگر چه بد هم باشد] ۲) برێتی لە یەکێك کە لە کاری سووك و بێنرخ بگەرێت (جلال محمود. بەرگی‌ا. ٤٠١)؛ ۲) [کنایە از کسی که به دنبال کار بی‌ارزش و بی‌بها می گردد].

**گەندوگوو:** برێتی لە شتی هیچوپووچی ناپوخت (خال.ف.۲۱۵): [کنایە از چیزی بی‌ارزش و پوچ].

**گەنم گەنمی چیتە:** واتە ئەم هەموو پرس و وەڵام و قسە کردنەت لە چییە (جلال محمود. بەرگی‌ا. ٤٠١)؛ [کنایە از این همه سؤال و جواب و جر و بحث برای چیست؟].

**گەنم گرد و جۆ بلاو:** واتە هیچ نەماوە، بلاوەی لێ بکەن لە کاتی شەڕ یان بۆ یاری منداڵان دەوترێت (جلال محمود. بەرگی‌ا. ٤٠١)؛ [کنایە از چیزی نمانده و پراکنده شوید هنگام جنگ و دعوا یا برای بازی کودکانه گفته می‌شود].

**گەوڵەچاندن:** برێتی لە ماتڵ بوون و زۆر مانەوە لە جێگایکا (گەوڵە: جورێکی جۆوە): (کنایە از معطل شدن).

**گەوهەرشناس:** برێتی لە مەردومی وریای دانای ژیر (خال.ف.۲۱۸): [کنایە از آدم هوشیار و عاقل].

**گەییگە گیانم:** واتە داماو و شەکەت بوم: کنایە از به ستوه آمده‌ام، به تنگ آمده‌ام.

**گەییگە گیانم:** [واتە: تاقەتم پێ نەماوە و گیان گەییگە لێوم]: کنایە از تحملم نمانده و کارد به استخوانم رسیده. (حیرت.٤٢٤)

**گیان بەدەستەوەدان:** برێتی لە سازان و گونجان: کنایە از سازش در معامله، [گیان بە دەستەوە نادا، گیانی دا بە دەستەوە]: کنایە از جاسپردن. (مەزیر.٧٤٠)

**گیانبەر:** برێتی لە ئازا لە جەنگ: کنایە از آدم شجاع. (مەزیر.٧٤١)

**گیانەسەر:** برێتی لە کەسێك کە لە کارێك وەڕس بووبێ (خال.ف.۲۲۱): [کنایە از کسی که در انجام کاری عاجز باشد].

**گیانەگونیە:** برێتی لە کاتێك کە گیاندار نووزەیەکی تیا مابێ (خال.ف.۲۲۱): [کنایە از آخرین رمق].

**گێچ ئەسکەندرە:** بە کارێکی قوڵ پڕخەتەر ئەوترێ (رخزادی.۳۲٤): [کنایە از کار مهم و پرخطر].

**گێژوویژ:** برێتی لە مرۆڤی وڕی بێ هۆشە: کنایە از آدم گیج و منگ.

**گێرشێوێن:** برێتی لە کەسێك کە کاری مەردوم تێك بدا (خال.ف.۲۲۲): [کنایە از کسی که کار مردم را بر هم بزند].

**گێرشێوێنە:** تەگەرە دەخاتە کارەوە، کارەکە تێك دەدات (جلال محمود. بەرگی‌ا. ٤١٦)؛ [کنایە از مانع ایجاد می کند و کار را بر هم می‌زند].

**گێرمنەکەر:** برێتی لە تەمەڵ: کنایە از تنبل. (مەزیر.٧٤٢)

**گێرمنەکەر:** برێتی لە مەردومی تەنبەل (خال.ف.۲۲۲): [کنایە از آدم تنبل].

**گێرموکێشە:** برێتی لە دەردیسەری (خال.ف.۲۲۲): [کنایە از گرفتاری].

**گێرەی پێ دەکات:** واتە بە سەری دەگێرێت بۆ شتێك کە دیار نییە و نادۆزرێتەوە، زۆر دەیهێنێت و دەیبات (جلال محمود. بەرگی‌ا. ٤١٦)؛ [کنایە از بیهودە سرگردان کردن کسی و او را به دنبال چیزی که نامعلوم و نامشخص فرستادن].

**گیرفانمان یەکێکە:** [برێتی لە دوو کەس کە دۆسی گیانی گیانی بن]: کنایە از دو نفر که با هم دوست

صمیمی باشند. (حیرت.٤٢٥)

**گیرفانی قووڵە:** برێتی لە یەکێکی زۆر چرووکە (جلال محمود. بەرگی١. ٤١٦/خاڵ٣.٢٨٢)؛ [کنایە از آدم بسیار خسیس].

**گیسوبڕی:** برێتی لە ژنی خراپ: کنایە از زن بدعمل. (هەژار٣.٧٤٢)

**گیفان پڕکردن:** برێتی لە ماڵ و سامان کۆ کردنەوە: کنایە از مال اندوختن معمولاً از طریق نامشروع.

**گیفان هەڵدووراندن:** برێتی لە بە تەمای شتێك بوون (خاڵ٣.٢٨٢): [کنایە از چشم انتظار چیزی بودن].

# ل

**لاترقەچەپێچ:** ١) برێتی لە بەتەنگەونەهاتن ٢) قسەیەکیان کردەوەیکی بێتامی ناتەواو و نەفامانە (جلال محمود. بەرگی١ .٤١٨): ١) [کنایه از در تنگنا به یاری نشتافتن] ٢) [کنایه از سخنی یا رفتاری نفهمانه انجام دادن].

**لاترقەوچەپێچ:** برێتی لە شتی نارێکی نالەبار و خوار و حیچ (خال.ف.٢٢٩): [کنایه از چیز کج و کوله و ناهموار].

**لاتفرۆشتن:** برێتی لە شەرفرۆشتنی لات بە مەردوم بۆ ئەوەی شتێکی دەستکەوێ (خال.ف.٢٢٩): [کنایه از شرخر و شرلاتان].

**لاخۆر:** برێتی لە چەورە و ماڵانگەڕ: کنایه از سورچران. (مەزڕ.٧٥٠)

**لادان:** برێتی لە دیەنی و میوان بوون: (فەرموون لادەن، لای ئەوان لاماندا): کنایه از مهمان شدن و اقامت کردن. (مەزڕ.٧٥٠)

**لاربوونەوە:** برێتی لە مردن، بۆ سووکی ئەوترێ (خال.ف.٢٣١): [کنایه از مردن، برای تحقیر گفته می‌شود].

**لارەمل:** برێتی لە مەردومی بێ دەسەڵات (خال.ف.٢٣١): [کنایه از ناتوان].

**لارەملە:** ١) دڵ شکستە ٢) نوشوستی هێناوە و باری کەوتووە ٣) بێنەوایە (جلال محمود. بەرگی١ .٤١٩): ١) [دل شکسته] ٢) [بدبختی به او روی آورده] ٣) [فقیر].

**لاسامە داگیە لێ:** [برێتی لە یەکێکی بێ کەیف و بێ مەیل]: کنایه از وصف آدم بی‌حال و بی‌اراده.

(حیرت.٤٢٧)

**لاشخۆر:** برێتی لە پارەداری پیسکەی پارەبەسوودەر: کنایه از خسیس، رباخوار. (مەزڕ.٧٥٢)

**لاق گرتن:** برێتی لە پشتە سەر قسە کردن و خراپە وتن، ون بوونی شتێك: کنایه از غیاباً به کسی بد و بیراه گفتن، غیبت کردن، گم شدن چیزی.

**لاکەی سەر هاتن (لاکەی سەری دێ):** ١) برێتی لە ماندوبوونی زۆر: ١) [کنایه از خستگی بسیار]، ٢) برێتی لە کز بوون و زراو بوون: ٢) [کنایه از لاغر مردنی شدن]. (مەزڕ.٧٥٣/ جلال محمود. بەرگی٢ .١٣٢)

**لالامو کردن:** برێتی لە زۆر مەست و سەرخۆشی بێهۆش (هێندە مەستە لالامو دەکا): کنایه از مست خراب. (مەزڕ.٧٥٣/ جلال محمود. بەرگی١ .٤١٩)

**لالیکردنەوە:** برێتی لە یارمەتی و دەستگیرۆیی یەکێك (خال.ف.٢٢٥): [کنایه از کمك مالی به دیگران].

**لام لێ ناکاتەو:** [واتە یارمەتیم نادات و رووم تێ ناکات]: کنایه از به من التفاتی نمی کند. (حیرت.٤٢٧)

**لامسەرلایی:** برێتی لە کردنی کارێك بە نابەدڵ و ناپوختی و بێ گوێ پێدان (خال.ف.٢٢٥): [کنایه از کسی که کاری برخلاف میل انجام دهد و چندان به آن اهمیت ندهد].

**لاموجیم:** ١) برێتی لە سەرپێچی و بەهانە هێنانەوە: ١) [کنایه از تمرّد و بهانه آوردن]. ٢) برێتی لە کەمترین قسە لە جوابدا (خال.ف.٢٢٥): ٢) [کنایه از کمترین میزان سخن در هنگام پاسخ].

**لای سمێلی سووزیاگە (لای سمێلی پرووزیاگە):** [برێتی لە مرۆڤێك کە ژنەکەی زاییێت و کچی بووبێ]: کنایه از مردی که زنش دختر زاییده. (حیرت.٤٢٨)

**لای لێ براوە:** دەرەتانی نییە، تووشی بووە یان زۆر

نەخۆشە، یان تووشی چوتورمێکی قورس بووە (جلال محمود. بەرگی۲. ۱۳۲)؛ [کنایە از گزیری ندارد و گرفتار شدە یا بسیار بیمار است و دچار مصیبت سنگینی شدە است].

**لای لێ دەکاتەوە:** یارمەتی دەدات (جلال محمود. بەرگی۲. ۱۳۲)؛ [کنایە از کمکش می کند].

**لچ خوارکردنەوە:** برێتی لە ناڕەزایی و قەڵسی: کنایە از اظهار ناخشنودی. (معزی.۷۵۷)

**لچ گەستن:** برێتی لە پەشیمان بوونەوە: کنایە از پشیمان شدن و اظهار شگفتی نمودن.

**لچ هەڵقرچان:** برێتی لە پیشاندانی تووڕەیی: کنایە از اظهار ناخشنودی. (معزی.۷۵۷)

**لچە کرۆژێ:** [برێتی لە ئالۆز و تووڕە بوون]: کنایە از ناراحت و منقلب شدن. (حیرت.٤۲۸)

**لچەلەرزێ:** [برێتی لە یەکێك کە دڵی پڕ بووە و هاکا بگری]: کنایە از آمادەی گریستن. (حیرت.٤۲۸)

**لچی داهێشتووە، لچی شۆڕ کردۆتەوە:** لووتی بەیەکداداوە ۱) پەستە ۲) تۆراوە ۳) تووڕە بووە (جلال محمود. بەرگی۱. ٤۳٦): ۱) [پست] ۲) [قهر کردن] ۳) [عصبانی و خشمگین شدە].

**لچی لێ هەڵقورتاند:** ناڕەزایی و قەڵسیی خۆی بەرامبەری دەربڕی. بە سووکی تەماشای کرد. بە سووکی هاتە بەرچاوی (جلال محمود. بەرگی۲. ۱۳۷): [کنایە از نارضایتی و خشمگینی خود را نسبت بە او نشان داد از روی تحقیر او را نگاە کرد. بی‌اهمیت در نظرش ظاهر شد].

**لك بان چاو:** [برێتی لە تووشی تەگەرە و تەنگوچەڵەمەبوون لە کار و ژیاندا]: کنایە از مانعی یا بروز اشکالی در راە امیال و آرزوهای زندگی.

(حیرت.٤۲۸)

**لنگ مەتك:** برێتی لە شووم: کنایە از شوم. (معزی.۷٦۰)

**لنگی جووت کرد:** لە ڕووی سووکییەوە دەوترێت واتە (جلال محمود. بەرگی۱. ٤۳۷): مردن: [کنایە از مردن].

**لنگی یا گونی بە سەردا شۆڕ کردۆتەوە:** واتە بە سەریا زاڵە، سەری پێشۆڕ کردووەوە و دەسەڵاتی بڕیوە (جلال محمود. بەرگی۱. ٤۳۷): [کنایە از بر او مسلط است و او را سرافکندە نمودە است. کنایە از این کە بر او پیروز شد وادار بە تسلیمش کردە و قدرتی برای او نگذاشتە].

**لۆتەخۆر:** بابۆڵە بادەر، پارووی زل خۆر: (وا خوانی کەناری من بۆ نوقڵی دەم و ماچە)/(ئەی لۆتەخۆری تەکیە سا تۆ لە کەنارت چی؟) «نالی»: کنایە از بی‌احترام. (معزی.۷٦۱)

**لۆتەخۆر:** برێتی لە مەردومی پیس خۆری پاشماوە خۆر. (خال.ف.۲٤۱)

**لۆچ لە ناو چاوانیدا نییە:** بێشەرمە و ڕوو هەڵماڵراوە (جلال محمود. بەرگی۲. ۱۲۸)؛ [کنایە از آدم بی‌شرم و پروا].

**لۆکاندن:** برێتی لە گایین (خال.ف.۲٤٤): [کنایە از گاییدن].

**لۆکەی لە گوێدایە ـ گوێی خۆی ئاخنیوە (گوێچکەی خۆی نیاگە سەو):** برێتی لە یەکێك کە خۆی کەڕ کردووە، نایەوێت ئەو قسە و باسە ببیسێت (جلال محمود. بەرگی۱. ٤۳۹): [کنایە از کسی کە خود را بە کری زدە و نمی‌خواهد آن سخنان را بشنود].

**لووت بە بەرخۆداهاتنەوە:** برێتی لە عار نان و پەشیمان بوونەوە لە شتێك (خال.ف.۲٤٤): [کنایە از خجلت‌زدگی و پشیمانی].

**لووت پروانن:** برێتی لە ناڕەحەت کردن: کنایە از افسردە خاطر کردن. (معزی.۷٦۱)

**لووت خوریان:** برێتی لە خەیاڵ کردنی کارێ کردن (بۆ

چوونە سەفەر لووتی ئەخوریٚ): کنایه از هوس کردن. (مەزهر.761)

**لووت زل:** بریتی لە لووت بەرز؛ کنایه از متکبر. (مەزهر.761)

**لووت لێخوران:** بریتی لە ئارەزووکردنی شتێك (خاڵ.ف.245): [کنایه از هوس و آرزوی چیزی کردن].

**لووت و پووت:** بریتی لە یەکێکی بەبیانوو و بەفیزە (جلال محمود. بەرگی1 .439): [کنایه از آدم بهانه‌گیر و متکبر].

**لووت هاتنە خوارەوە:** بریتی لە واز هێنان لە فیز؛ کنایه از تکبّر دست برداشتن و پست شدن. (مەزهر.761)

**لووت هەڵکردن:** بریتی لە زویری و دڵگیری لە لالووتبوونی یەکێك (خاڵ.ف.245): [کنایه از قهر کردن].

**لووتە لووتیە:** [بریتی لە یەکێك کە بە بەشی خۆی دڵخۆش نەبێ]: کنایه از کسی که از وضع و سهم خود ناراضی باشد. (حیرت.429)

**لووتەلایە:** بریتی لە یەکێك کە دڵگیرە و لووتی لێ هەڵکردووە (جلال محمود. بەرگی1 .437): [کنایه از کسی که ناراحت و قهر کرده].

**لووتخواری:** بریتی لە دڵگیری و نارەزایی لە شتێك (خاڵ.ف.244): [کنایه از قهر کردن و ناراضی شدن از چیزی].

**لووتداژەندن:** بریتی لە ماتی و زویری (خاڵ.ف.244): [کنایه از کز کردن و غم خوردن].

**لووتچووزانەوە:** بریتی لە زۆر پێناخۆشبوونی قسەیەك (خاڵ.ف.244): [کنایه از بسیار ناراحت شدن از حرفی].

**لووتوپووت:** بریتی لە برتوبۆڵ، بۆڵەوپرتە (خاڵ.ف.245): [کنایه از غرولند].

**لووتی بە لووتیەوە بوو:** یەکانگیربوون. تووشی یەك بوون (جلال محمود. بەرگی1 .437): [کنایه از با هم برخورد کردن].

**لووتی بەرزە:** بریتی لە یەکێك کە بادی هەوایە و بەفیز و بەعیەو دەمار: (ئەمومن.68/ جلال محمود. بەرگی1 .437) [کنایه از متکبر.]

**لووتی بگرە گیانی دەرئەچێ:** بریتی لە یەکێکی لەڕ و لاواز (جلال محمود. بەرگی1 .437): [کنایه از آدم لاغر و مردنی].

**لووتی پیا نایەن:** [واتە ڕێز و حورمەتی بۆ دانانێن]: کنایه از کسی که برای او اهمیتی قائل نیستند. (حیرت.429)

**لووتی پیاتێڕێ** (ئەمومن.68): [بریتی کە نەرخ دانان و ڕازی بوون لە کەسێ: کنایه از خشنود بودن از کسی و، ارج نهادنش].

**لووتی پێدا ناژەنێت:** پێی قایل نییە و حەز بە هاوسەریی ناکات. دەڵێن ئەو کچە لووت بەو کوڕەدا ناژەنێت واتە نایەوێت (جلال محمود. بەرگی2. 127): [کنایه از از او خوشش نمی‌آید].

**لووتی دەژەنێت:** 1) بریتی لە سووسە دەکات تا لە نهێنیەکە ئاگادار بێت: 1) [کنایه از این که تلاش می‌کند راز را بفهمد] 2) بریتی لە یەکێك کە دەست دەخاتە کاری ئەم و ئەوەوە (جلال محمود. بەرگی1 .438): 2) [کنایه از کسی که در کار دیگران مداخله می‌کند].

**لووتی دەشکێنێت:** 1) بەرەنگاربوون و بەربەستبوون. 2) تەریقی دەکاتەوە و لە دەماخی دەدات 3) دەیبەزێنێت و لە فیزی دەخات (جلال محمود. بەرگی1 .438): 1) [کنایه از این که با او گلاویز می‌شود و سد راهش می‌شود] 2) [شرمسارش می‌کند] 3) [کنایه از این که او را شکست می‌دهد].

**لووتی ڕەق بوو:** [واتە لە ناراحەتییا وشك بوو، سەری

سوورِ ما]: کنایه از خشکش زد و یکه خورد. (حیرت.٤٢٩)

**لووتی سووزیا:** برێتی لە یەکێکی نائومێد (جلال محمود. بەرگی٢. ٨١): [کنایه از شخص ناامید است].

**لووتی شۆڕەو بوو:** [واتە شەرمەزار و ناهومێد بوو]: کنایه از این که از رو رفت و مأیوس شد. (حیرت.٤٢٩)

**لووتی چووەزایەوە:** تەریق کرایەوە، بە قسەیەك پەست و دڵگیر کرا (جلال محمود. بەرگی٢. ١٣٧): [کنایه از شرمسارش کردند، با حرفی پکر و دلتنگ شد].

**لووتی گرتگە (گرتووە):** [واتە: دەماری زل بووە، قینی کردووە]: کنایه از حالت تکبر و غرور، کنایه از قهر کردن. (حیرت.٤٢٩)

**لووتی لە ئاسمانە:** برێتی لە بەدعیەو دەمار (خال.ف.٢٨٦): [کنایه از بسیار متکبر].

**لووتی لێ خوارە:** ١) واتە دڵی ساردە، حەزی لێ ناکات ٢) لێ دڵگیرە (جلال محمود. بەرگی١. ٤٢٨): ١) [کنایه از دل‌سرد و بی‌اشتیاق است] ٢) [از او دلگیر است].

**لووتی‌شکیا:** برێتی لە ناهۆمێدبوون (خال.ف.٢٤٥): [کنایه از ناامید شدن].

**لوولبوون:** برێتی لە قەڵەوبوون (خال.ف.٢٤٦): [کنایه از چاق شدن].

**لوولدان:** برێتی لە بە پەلە خواردن: کنایه از با شتاب خوردن. (مەزهەر.٧٦٥)

**لوولینەی ئافتاوەی ئاو هەڵئەگرێ:** [برێتی لە یەکێکی دەوڵەمەند و دارا]: کنایه از آدم متمول ثروتمند. (حیرت.٤٢٩)

**لە ئاسن خوێن ئەوارێ:** [برێتی لە لایەك کە لە جەنگدا تێك شکابێ و کوشتە و برینداری زۆر بێ]: کنایه از جنگ مغلوبه و پر از خونریزی. (حیرت.٤٣٠)

**لە ئاشی سەرێی لێ دەکا:** [برێتی لە یەکێکی بەرزەفڕە کە دەیەوێ پێش بکەوێ]: کنایه از برتری‌جویی و بلندپروازی کسی. (حیرت.٤٤٧)

**لە ئاو پەڕیگەسەو:** [برێتی لە یەکێك کە لە کارێکا سەرکەوتبێت و ڕزگار بووبێت]: کنایه از کسی که در کارش پیروز شده و از غم رسته. (حیرت.٤٣٠)

**لە ئاو دان:** برێتی لە بەفیڕۆدانی شت (خال.ف.٢٤٧): [کنایه از به هدر دادن چیزی].

**لە ئاو دەرهاتووە:** برێتی لە شتێکی هەڵبژاردە کە تاقی‌کرا بێتەوە (جلال محمود. بەرگی١. ٤٢٠): [کنایه از چیز مرغوب و آزمایش شده].

**لە ئاو شەومەنە خۆی دەپارێزی:** برێتی لە پیاوێکی موسوڵمانە، دنیای خستوتە لاوە، تەنانت ئاو شەویش کە دکرێتە گوزەوە نایخوات نەفس و ئارەزوی خۆی تا ئەو ڕادەیە دەمرێنێت واتە، لە حەڵاڵ و حەرام زۆر دپرسێتەوە: کنایه از آدم متقی و پرهیزگار.

**لە ئاو لێڵ ماسی ئەگرێ:** واتە بۆ دەرفەتێ ئەگرێ کە سوودی خۆی لێ وەرگرێ (رخزادی.٣٢٩): [کنایه از به دنبال فرصتی می‌گردد تا از آن سودی ببرد].

**لە ئاوی ساردوگەرم دەترسێت:** برێتی لە یەکێك کە سڵ لە هەموو شتێك دەکاتەوە و هەمیشە لە پارێزدایە (جلال محمود. بەرگی١. ٤٢٠): [کنایه از آدم پرهیزگار و باایمان].

**لە ئەقڵا ئامۆزاگ کەرە:** [واتە وەك کەر نەزانە]: کنایه از این که مانند خر نفهم است. (حیرت.٤٣١)

**لە باتی ناوکێ کێریان بڕی:** [برێتی لە یەکێك کە لە کارێکا سەری دەرنەچێ و ناشارەزا بێت]: کنایه از ناوارد بودن در کار. (فتاحی قاضی. بەرگی٢. ٢٢٩)

**لە بار بوونەوە:** برێتی لە منداڵبوونی ئافرەت

(خاڵ.ف.248): [کنایه از زاییدن].

**لە باڵ کەوت:** واتە پەکی‌کەوت (جلال محمود. بەرگی2. 132): [کنایه از کار افتاد].

**لە باڵیان دا:** 1) پەکیان خست: 1) [کنایه از بیچاره‌اش کردند] 2) لە کارەکەی دەریان کرد، لێیان خست: 2) [کنایه از او را اخراج کردند] 3) تووشی زیانیان کرد (جلال محمود. بەرگی2. 132) 3) [او را دچار آسیب و زیان کردند].

**لە بەر باجی لە پشت قەیچی:** بریتی لە یەکێك کە لە ڕووبەڕووە دۆستە و لە پاشملەش دەمی وەك مەقەست لێت دەخاتەکار (جلال محمود. بەرگی1. 421): [کنایه از کسی کە بە ظاهر دوست است ولی در باطن دشمن است].

**لە بەر چاوی نییە:** سپڵەیە و پێ نازانێت (جلال محمود. بەرگی1. 421): [کنایه از آدم ناسپاس].

**لە بەرمو باجی، لە پشتەو قەیچی:** [بریتی لە یەکێکی دووڕوو]: کنایه از آدم منافق. (حیرت.423)

**لە بەرد دان:** بریتی لە بە فیڕۆ دان و لەناوبردنی دارایی (خاڵ.ف.249): [کنایه از نابود کردن سرمایه].

**لە بەردی دا:** بریتی لە شتێك کە بە فیڕوی دا و لە ناوی برد (جلال محمود. بەرگی1. 421): [کنایه از چیزی که بیهوده از بین برود].

**لە برسانا ناو نەکوڵێنێ:** بە یەکێکی زۆر هەژاری نەدار ئەوترێ کە خواردن لە ماڵیا نەبێ (خاڵ.288): [کنایه از آدم بسیار فقیر].

**لە برساندا سکی قوڕەی دێت:** بریتی لە یەکێکی زۆر هەژار (جلال محمود. بەرگی1. 421): [کنایه از آدم بسیار فقیر].

**لە بن دانیشتن:** بریتی لە ڕێ لادان و فریودانی کەسێك: کنایه از منحرف کردن و فریب دادن کسی.

**لە بن کوولەکە دان:** هەموو شتێك دەربڕین و ئاشکرا کردن: کنایه از همه چیز را بیان کردن و آشکار ساختن.

**لە بن هاتن:** تەواو بوون، دوایی هاتن، بنلێهاتن، بنلێبڕان: کنایه از تمام شدن، پایان یافتن، ریشه‌کن شدن.

**لە بن هامانەکەی دا:** واتە هەموو شتێکی وت و هەموو نهێنییەکی ئاشکرا کرد (جلال محمود. بەرگی2. 132): [کنایه از همه چیز را گفت و همه چیزی را آشکار ساخت].

**لە بن هێنان:** تەواو کردن، دوایی لێهاتن بنلێبڕین: کنایه از تمام شدن، به آخر رسیدن و ریشه‌کن شدن.

**لە بنی کوولەکەی دا:** بریتی لە نهێنیەکەی ئاشکرا کرد (جلال محمود. بەرگی1. 422): [کنایه از کسی که کاری یا رازی را آشکار کرد].

**لە بوو دویدی (دووکەڵ) ڕەس. ڕۆیشت:** بریتی لە یەکێکی نەوسن و چڵێس (جلال محمود. بەرگی2. 133): [کنایه از آدم شکم‌پرست و حریص].

**لە بێخە بەران کەشکەك سەڵەوات:** لە ڕووی تیتاڵییەوە بە یەکێك دەوترێت کە ئاگای لە کارێك نەبێت (جلال محمود. بەرگی1. 423): [برای شوخی و مزاح است، کنایه از کسی که از کاری بیخبر باشد].

**لە تامی دەرکرد:** واتە زێدەڕۆیی لە هەر شتێك (جلال محمود. بەرگی1. 422): [کنایه از کسی که بیش از اندازه در کاری یا چیزی زیاده‌روی بکند].

**لە تای ترازوویەکدان:** هاوتای یەکن و بۆ یەك باشن (جلال محمود. بەرگی1. 422): [همال هم هستند و برای همدیگر خوبند].

**لە تەك ناو گەنیگا هەڵ نەکا!:** بە یەکێکی بەتاقەت و

ئەهوەن ئەوترێ کە لە گەڵ هەموو کەسا بسازێ (وخزادی،٢٢٢): [کنایە از آدم آرام و صبور کە با همە کس بسازد].

**لە تری لۆتی سازترە:** لە ڕووی سووکیەوە، بە یەکێك ئەوترێ کە خۆی زۆر زوو ئامادە بکا بۆ کارێك (معروف،٨٦): [برای تحقیر است، کنایە از کسی کە زود خود را برای انجام کاری آمادە کند].

**لە پۆتی دا:** ١) بەزاندی، شکاندی: ١) [کنایە از شکستش داد] ٢) نابووتی کرد: ٢) [کنایە از ورشکستش کرد] ٣) تەریقی کردەوە (جلال محمود. بەرگی٢. ١٣٣): ٣) [کنایە از او را شرمسار کرد].

**لە پا کەفتن:** برێتی لە زۆر ماندوبوون، پیربوون: کنایە از خستە شدن، پیر شدن.

**لە پا کەوتووە:** برێتی لە یەکێك لە پیر و ناتەوان کەوتبێت و هێزێکی نەمابێ: کنایە از پیر و ناتوان شدن. (کریمپور،٤٦٤)

**لە پارەوە دوو ساڵە:** لە ڕووی تیتاڵییەوە بە یەکێك دەوترێت کە خۆی بە منداڵ بداتە قەڵەم (جلال محمود. بەرگی١. ٤٢٢): [کنایە از آدمی کە خود را کم سن و سال جلوە دهد].

**لە پەروپۆ کەوتن:** [برێتی لە نابووت بوون]: کنایە از افتادن، ورشکست شدن. (فتاحی قاضی. بەرگی١. ٢٦٢)

**لە پەلوپۆ کەوتووە:** ١) زۆر ماندووە: ١) [کنایە از بسیار خستە است] ٢) زۆر کەشەنگی نەخۆشییەکەیەتی: ٢) [کنایە از بسیار گرفتار بیماریش است] ٣) زۆر پیرە: واتە ناتوانێت پەلوپۆ بهاوێت (جلال محمود. بەرگی٢. ١٣٣): ٣) [بسیار پیر است یعنی دیگر نمی‌تواند حرکت و نایی داشتە باشد].

**لە پەنجەی ساغ کرم دەردێنێت:** برێتی لە یەکێك کە ئەوندە دانایە لە هەمووشت ڕەخنە دەگرێت (جلال محمود. بەرگی١. ٤٢٢): [کنایە از آدم بسیار دانا و زیرک کە از همە چیز عیب و ایراد می گیرد].

**لە پێست چوونەدەرەوە:** برێتی لە تووڕە بوون و دڵتەنگ بوون لە شتێك (خاڵ.ف.٢٥٠): [کنایە از خشمناک و نگران بودن از چیزی].

**لە جێگەیەکەوە ئاو ئەخواتەوە:** برێتی لە کەسێك هانی داوی یان مەبەستت شتێکی دیکەیە: کنایە از کس دیگری تو را تحریک کردە یا منظورت چیز دیگری است.

**لە جێی خۆی وشك بوو:** ١) واتە زۆر ترسا و سام گرتی، ٢) حەپەساو داخ دڵی گرت (جلال محمود. بەرگی١. ٤٢٤): ١) [کنایە از بسیار ترسید] ٢) [مبهوت و غمگین شد].

**لە حاڵی خۆیدایە:** برێتی لە یەکێك کە لە گیانکەنشتدایە، لە سەرەمەرگدایە و خەریکە دەمرێت (جلال محمود. بەرگی١. ٤٢٥): [کنایە از آدمی کە آخرین لحظات عمرش را می گذراند].

**لە حەوت ئاسیاو مشتێك ئاردی نییە:** برێتی لە یەکێکی دەست بڵاو و هەڵەخەرج (جلال محمود. بەرگی١. ٤٢٥): [کنایە از آدم ولخرج و اسراف کنندە].

**لە خۆ دەرچوون:** برێتی لە فیز بەپاکردن (خاڵ.ف.٢٥٢): [کنایە از مغرور شدن].

**لە خۆ ڕیان:** برێتی لە سەر نەکەوتن لە کارێ کە خەریکی بووە: کنایە از موفق نشدن در کار. (مەزەر،٧٦٩)

**لە خۆ گۆڕان:** برێتی لە فیز پەیا کردنی یەکێك (خاڵ.ف.٢٥٢): [کنایە از مغرور شدن].

**لە خاك هەڵساگە:** برێتی لە یەکێك کە لە خۆیەوە پێگەییوە (جلال محمود. بەرگی١. ٤٢٦): [کنایە از آدمی کە

خودبخود بارآمده بدون کمک و یاری دیگران].

**لە خەم ڕەخسین:** برێتی لە کزربوون و پێگەیشتنی شتێك (خاڵ.ف.۲۵۳): [کنایه از رسیدن به حد خود و از مراقبت بی‌نیاز شدن].

**لە خشتە بردن:** برێتی لە هەڵخەڵەتاندن و لەرێدەرکردنی یەکێك (خاڵ.ف.۲۵۲): [کنایه از فریب دادن کسی].

**لە خوا بێخەوەر:** برێتی لە یەکێکی زاڵم و دڵڕەق: کنایه از ظالم، شقی و بی‌رحم.

**لە خوێن سەری دەگەڕێت (بۆ خوێن سەری ئەگەڕێت):** دوژمنیەتی دەیەوێت بیفەوتێنێت (جلال محمود. بەرگی۲. ۱۳۲): [کنایه از دشمنش است و می‌خواهد او را نابود سازد].

**لە دەس دان:** برێتی لە کەسێك کە خۆشەویستێکی تیاچووبێ و مردبێ: کنایه از مردن.

**لە دەست دەرچوون:** ۱) بەرەڵا بووە و پەکی کەوتووە: ۱) [کنایه از آزاد و رها شده و درمانده شده] ۲) خێری بەخشراوتەوە لە ژێر رکێفیدا نەماوە: ۲) [کنایه از خیرش را بخشیده. تابع و مطیع نیست] ۳) زیانە و کەوتووە (جلال محمود. بەرگی۲. ۱۳٤): ۳) [کنایه از ضرر و زیانی است که آمده و چاره‌ای نیست].

**لە دەست کەوتووە:** برێتی لە یەکێکی زۆر دەوڵەمەند (جلال محمود. بەرگی۱ .٤۲٦): [کنایه از آدم بسیارثروتمند].

**لە دەست و پێکەوتن:** [برێتی لە پیرێکی بێهێز و ناتوان]: کنایه از پیر و ناتوان. (فتاحی قاضی. بەرگی۱. ۳٦۷)

**لە دەستدان:** برێتی لە، لەناوبردنی شتێك (خاڵ.ف.۲۵۳): [کنایه از، از بین رفتن چیزی].

**لە دەستچوون:** برێتی لە نەمان و لەناوچوونی شتێك (خاڵ.ف.۲۵۳): [کنایه از دست رفتن چیزی].

**لە دەستکەوتن:** برێتی لە دەوڵەمەند بوون (خاڵ.ف.۲۵۳): [کنایه از ثروتمند شدن].

**لە دەستی دا:** ۱) واتە بە فیڕۆویدا ۲) لە ناوی برد (جلال محمود. بەرگی۱ .٤۲٦): ۱) [کنایه از بیهوده آنرا از میان برد] ۲) [از میان بردش].

**لە دەم کەوتووە** (مەمومن.۷۰): [برێتی لە ساردەوبونەوەی چایێك یا چێشتێ: کنایه از سرد شدن چایی یا غذای گرم].

**لە دەمدان:** برێتی لە ڕووشکاندن: کنایه از رو بردن، خجل کردن. (مەژار.۷۷۰)

**لە دەمی خۆی دەگرێتەوە:** دەست دەگرێتەوە و پاشەکەوت دەکات (جلال محمود. بەرگی۲. ۱۲٤): [کنایه از پس‌انداز می‌کند].

**لە دەمی خۆی گرتەوە:** واتە پاشەکەوتی کرد (جلال محمود. بەرگی۱. ٤۲٦): [کنایه از پس‌انداز کردن].

**لە دەم ودوو کەوتن:** [برێتی لە پیرێکی بێ هێز و توان و حەوسەڵە بەسەرچوو]: کنایه از پیر و فرسوده و بی‌طاقت اختیار شده. (فتاحی قاضی. بەرگی۱ .۳٦۷)

**لە دوای کەرەوە بووە:** برێتی لە یەکێکی تێنەگەیشتوو و نەزان (جلال محمود. بەرگی۱ .٤۲٦): [کنایه از آدم ناآگاه و بی‌تجربه].

**لە دوودان:** برێتی لە ئازادی دان بە ژێر دەست کە کار بە ئارەزووی خۆی بکا: کنایه از آزاد گذاشتن زیر دست که خودسرانه کار کند. (مەژار.۷۷۰)

**لە دووی سەری دەگەڕێت:** ۱) واتە دەیەوێت تووشی بکات: ۱) [می‌خواهد او را گرفتار کند] ۲) دیەوێت بیفەوتێنێت (جلال محمود. بەرگی۱ .٤۲٦): ۲) [می‌خواهد او را نابود سازد].

**لە ژێر بار دەرئەچێت:** ۱) یاخی دەبێت ۲) بەرگەناگرێت ۳) تەمەڵی ئەکات (جلال محمود. بەرگی۱.

٤٢٨): ۱) [عصیان می‌کند] ۲) [تحمل نمی‌کند] ۳) [تنبلی می‌کند].

**لە ژێر رکێفی کەسدا نییە:** برێتی لە یەکێك کە لە ژێر دەسەڵاتی کەسدا نییە (جلال محمود. بەرگی۱ .٤٢٨): [کنایە از کسی کە تحت تسلط کسی دیگر نباشد].

**لە رووم هەڵنایێ:** [واتە شەرم ئەکەم]: کنایە از این کە شرم می کنم. (حیرت.٣ ٤٤٣)

**لە رێ دەر بردن:** برێتی لە هەڵخەڵەتاندن و هەڵفریودانی یەکێك (خال.ف.٢٥٤): [کنایە از فریب دادن].

**لە رێ دەرچوون:** برێتی لە لادانی یەکێك لە رەوشت و خۆی جوان: (خال.ف.٢٥٤) [کنایە از منحرف و گمراه شدن].

**لە رێگە دەرچووگە:** برێتی لە هەڵخەڵەتان و خۆ بە زل-زانین: کنایە از فریب خوردن و غرە شدن.

**لە سەر ئاگر دانیشتن:** بێئۆقرەبوون و بەپەلەبوون بۆ رۆیشتن سەقام نەگرتن لە شوێنێك و بە تەمای هەستان و رۆیشتن بوون، دانەسەکنین (نانوزانە.١٠٤): [کنایە از آرام و قرار نداشتن در جایی و تعجیل در رفتن داشتن].

**لە سەر ئاوگەران:** زۆر نوێژ کردن و موسڵمانی چاك و خاوەن کەرامەت بوون، پیرۆز بوون: کنایە از بسیار نماز خواندن و مسلمان خوب و صاحب کرامت، مبارك و خجستە بودن.

**لە سەر بەردی رەق نان پەیدا دەکات:** برێتی لە یەکێکی زۆر بەکار و چالاك (جلال محمود. بەرگی۱ .٤٢٨): [کنایە از آدم زرنگ و کاری].

**لە سەر پارە دەنوێت:** زۆر دەوڵەمەندە (جلال محمود. بەرگی۲. ١٢٤): [کنایە از بسیار ثروتمند است].

**لە سەر دەست رای دەگرێت:** ۱) رێزی زۆری لێ دەگرێت ۲) نازی ئەداتێ و بە تەنگیەوە دێت (جلال محمود. بەرگی۱ .٤٢٨): کنایە از ۱) [احترام بسیاری بە او می‌گذارد] ۲) [کنایە از نازش را می‌کشد و بە کمکش می‌شتابد].

**لە سەر دەست رایدەگرێت:** ۱) زۆر رێزی هەیە: ۱) [کنایە از بسیار بە او احترام می‌گذارد] ۲) زۆر بە تەنگیەوە دێت (جلال محمود. بەرگی۲. ١٣٥): ۲) [کنایە از بسیار بە کمك او می‌شتابد و مواظبش است].

**لە سەر دەستان:** برێتی لە برەودار، رەواج: کنایە از رایج. (مەزهر.٧٧٢)

**لە سەر دەستانە:** برێتی لە ئافرەتێ کە لە منداڵ بووندا بێت (جلال محمود. بەرگی۱ .٤٢٨): [کنایە از زنی کە زایمانش نزدیک است].

**لە سەر رۆیشتن:** برێتی لە درێژەدان بە قسەیەك (خال.ف.٢٥٥): [کنایە از ادامە دادن بە حرف یا سخنی].

**لە سەر رەنگی ئەو دەروات:** ۱) برێتی لە یەکێك کە شوێنکەوتووی کەسێکیتر بێت ۲) واتە بە پیلانی ئەو کار دەکات (جلال محمود. بەرگی۱ . ٤٢٩): ۱) [کنایە از آدمی کە دنبالەرو کسی دیگر باشد] ۲) [کنایە از این کە طبق طرح و نقشەی او پیش می‌رود].

**لە سەر گوان بوون:** [برێتی لە مانگا یان پەزێ کە زایینی نزیك بێ]: کنایە از زایمانش نزدیک است. (فتاحی قاضی. بەرگی۱. ٣٧٢)

**لە سەر گورێس ئارد هەڵدەخات:** برێتی لە یەکێك کە بە بێ لێکدانەوە دەست دەداتە کار (جلال محمود. بەرگی۱ .٤٢٩): [کنایە از کسی کە نسنجیدە و بدون بررسی بە کاری دست بزند].

**لە سەر وەستایە:** واتە خەریکە بمرێت لە گیانەڵا دایە: کنایە از در حال مردن است.

**لە سەر:** برێتی لە قەرز (دینارێکم لە سەرە): کنایە از

وام. (مەزبور.٧٧١)

**لە سەری دەرناچێ:** [واتە لە مێشکی دەرناچێ، واتە دەست هەڵناگرێ]: کنایه از این که از این که یادش نمی‌رود./ دست‌بردار نیست. (حیرت.٧٤٤)

**لە سەگ سواڵ ئەکا:** برێتی لە یەکێکی نەدار و رجاڵە: کنایه از فقیر و تنگدست. (حیرت١. ٣٩٩/ جلال محمود. بەرگی١ ،٤٢٩)

**لە سك وێسیاگەسەوە** (ئەمومن.٧٣): [برێتی لە ژنێك کە ئیتر منداڵی نابێت و سکموزا ناکات: کنایه از زن نازا که دیگر بچه‌ای به دنیا نمی‌آورد].

**لە شای تەککەی هێناوە:** [برێتی لە یەکێکی زۆر سەرکەوتوو]: کنایه از آدم بسیار موفق. (فتاحی قاضی. بەرگی٢. ٢٢٩)

**لە چۆمی وشك ماسی دەگرێ:** واتە کاری بێ کەڵك و پرپوچ کردن: کنایه از کار عبث انجام می دهد.

**لە چاڵ دەرهێنان:** بۆ وێنە دەڵێن سەرەڕای بێگارییەکە دایك و باوکیشم لە چاڵ دەردێنن واتە: جنێو و قسەی ناشیرین بە مردوو وتن (جلال محمود. بەرگی٢. ١٢٣): [کنایه از فحش و ناسزای زشت به مرده دادن].

**لە چاوگیران:** برێتی لە پێ‌نەزانی و سپڵەیی: کنایه از حق ناشناسی. (مەزبور.٧٦٩)

**لە گەڵ سای خۆیا شەڕ دەکات:** برێتی لە مرۆڤێکی تووڕە و شەڕاشۆ کە لە گەڵ کلکی خۆیدا شەڕ دەکات (جلال محمود. بەرگی٢. ١٧): [کنایه از آدم خشمگین و عصبانی و ستیزه‌جو که با خود نیز سر جنگ دارد].

**لەگەڵ سێبەری خۆی شەڕ دەکات:** ١) برێتی لە یەکێك کە کەم جیقڵدان بێت و بە گژوفشێ بە ئاسمانە بچێت: ١) [کنایه از آدم کم حوصله و ناشکیبا که زود عصبانی شود] ٢) هەرزەیە (جلال محمود. بەرگی١ .٤٣٢): ٢) [جلف و سبکسر].

**لەگەڵ مانگدا شەڕ دەکات:** برێتی لە یەکێك کە وەك مانگ، رۆژ، جوانە و بگرە لەویش جوانترە (جلال محمود. بەرگی١ .٤٣٢): [کنایه از کسی که مثل ماه، زیباست و بلکه زیباتر هم هست].

**لە گورێسی ناو هەمانە بە پێچترە:** برێتی لە یەکێکی چەوت و چەوێڵ و بەفروفێڵە (جلال محمود. بەرگی١ .٤٣٣): [کنایه از آدم کج رفتار و نیرنگ‌باز].

**لە گوڵ تەڕی پێ نایژێ:** قسەیەکی وای پێ نایژێ کە دڵی گەرد بگرێت (خاڵ.٤٠٤): [کنایه از چیزی به او نمی گوید که ناراحت شود].

**لە گوڵ پاکترە:** برێتی لە یەکێك کە گوناهێکی درابێتە پاڵ بەڵام بێ‌گوناه بێت. واتە: بێ‌تاوانە، پاکە (جلال محمود. بەرگی١ .٤٣٣): [کنایه از کسی که خطایی یا گناهی را به او نسبت داده باشند در حالیکه او بی گناه باشد].

**لە گون بەرانا پەنێر دروس ئەکا** (مەریوخ.٢٠): [برێتی لە یەکێکی زۆر زیرك: کنایه از آدم بسیار زیرک].

**لە گون گا رووتترە** (مەریوخ.٢٠): [برێتی لە یەکێك کە زۆر رووت و ڕەجاڵ بێت: کنایه از آدم بسیار فقیر و درمانده].

**لە گوێچکەی گا خەوتووە:** برێتی لە یەکێکی نەزان و گێل (خاڵ.٤٠٥): [کنایه از غافل شدن].

**لە گیرفانی ئەهریمەندا هەڵدەپەرێت و لە توورەکەی جنۆکەدا سەما دەکات:** برێتی لە یەکێکی شەڕەنگێز کە رێی خراپەی گرتبێت و بە پارە بۆ ئەم و ئەو خراپە بکات (جلال محمود. بەرگی١ .٤٣٤): [کنایه از کسی آشوبگر است که راه خطا را در پیش گرفته باشد و در عوض گرفتن پول نسبت به دیگران بدی کند].

**لە قەڵەم دان:** [برێتی لە کەسێك یا شتێك خراپ بناسرێ]: کنایه از چیزی یا کسی را بد معرفی کردن.

(فتاحی قاضی. بەرگی ۱. ۳٦۷)

**لە قەڵەم کەوتن:** [بریتی لە لەبیرچوون و بەحەساو نەهاتن]: کنایە از فراموش شدە و بە حساب نیامدن.
(فتاحی قاضی. بەرگی ۱. ۳٦۷)

**لە قەڵەمی دا:** واتە ژماردی، دیاری کرد، ئاشکرای کرد: (جلال محمود. بەرگی ۱. ٤۳۰) [کنایە از شمارش کرد، نشانە کرد، آشکار ساخت].

**لە قەور نیان:** خەفەت و دێوەدان بە کەسێك: کنایە از اذیت و آزار دادن کسی.

**لە قسەی خۆی دەرناچێ:** [بەڵێندەری ڕاست و دروست]: کنایە از خوش قول. (حیرت. ٤٤۹)

**لە قنگەوە لەغاوی دەکات:** بریتی لە یەکێك کە کارەکەی پاش و پێش ئەنجام دەدات. (جلال محمود. بەرگی ۱ ٤۳۰.

**لە قنگی خۆی نەبوون (هەواڵی لە قنگی خۆی نییە):** وریا نەبوون و گێژ بوونێکی لە ڕادەبەدەر: کنایە از آدم ناآگاه و بی‌خبر: کنایە از هوشیار نبودن و بی‌اندازە گیج بودن.

**لە قوڕ تۆز هەڵ ناسێت:** بریتی لە یەکێکی ڕژدی چرووك کە هیچی لە دەست نەبێتەوە (جلال محمود. بەرگی ۱ ٤۳۰.): [کنایە از آدم خسیس کە چیزی از او بە دیگران نمی‌رسد].

**لە کۆپانی خۆی ئەخوا:** بریتی لە یەکێك لە بەر بێ‌قازانجی لە سەرمایەی خۆی ئەخوا (خال. ٤۰۲): [کنایە از کسی کە بە علت نبودن بهرە از دست‌مایە یا سرمایەاش می‌خورد].

**لە کۆڵ نەبوونەوە:** وازی لێ ناهێنێت، بەرۆکی بەرنادات لێی دوورناکەوێتەوە (رخزادی): [کنایە از دست از او برنمی‌دارد].

**لە کەفوکوڵ نیشتەوە:** [بریتی لە یەکێك کە لە کارێ یان شتێك سەرد بێتەوە و مەیلی پێ نەمێنێ]: کنایە از کسی دل سرد شدە و از شوق حرارتش را از دست داد. (حیرت. ٤٥۱)

**لە کراس خۆت دەرمەچۆ:** [بریتی لە خۆت مەگۆڕە و خۆبایی مەبە]: کنایە از مغرور مشو. (حیرت. ٤٥۱)

**لە کوڵ چوومەوە:** [واتە لە خۆشی و مەیل کەوتم]: کنایە از حرارت و شوق افتادم. (حیرت. ٤٥۱)

**لە کوڵ چوون:** [بریتی لە خۆشی و مەیل کەوتن]: کنایە از حرارت و شوق افتادن. (حیرت. ٤٥۱)

**لە کونای پلنگا ئەخەفێ:** [لە سەر ڕێگەی لافاوا خانوو دروست دەکات بریتی لە کارێکی پڕ مەترسی ئەکات]: کنایە از کسی کە خانە در گذر سیل می‌سازد. (حیرت. ٤٥۱)

**لە کوولەکەی تەرپشدا ناوی نییە:** واتە بە هیچ جۆرێك ناوی نییە، دیارە کوولەکەی تەڕ بانگی تێدا ناوترێت (جلال محمود. بەرگی ۲. ۱۳٦): [کنایە از اصلاً نام و آوازەای از او نیست].

**لە کیسەی خەلیفە ئەوخشێ:** بریتی لە بەخشینی بێ‌جێگە یان لە ماڵی خەڵك بەخشین: کنایە از بخشش بی‌پشتوانە کردن، از مال عاریە بخشیدن.

**لە لانەی پلنگدا دەخەفێت:** بریتی لە یەکێکی زۆر بەجەرگ و بێباك (جلال محمود. بەرگی ۱ ٤۲۳.): [کنایە از آدم بسیار شجاع].

**لە لووت فیلێ داکەوتووە** (ئەمومن. ٦۸): [بریتی لە یەکێکی بەدعیەو و دەمار: کنایە از آدم متکبر].

**لە مار رووتترە:** کنایە از آدم فقیر و ندار.

**لە ماسی نێر شەرم ئەکا:** بۆ تەوسە، بە ئافرەتێ کە دەعیەی پاکە بکا (رخزادی. ۳٤۲): [برای طعنە است و کنایە از ادعای پاکی و درستی کردن].

**لە مەحموودی بیزموار نەبوون:** تێنەگەیشتن، نەفامین، ئاگادار نەبوون (ئانەوزانە.١٠١): [کنایە از ناآگاه و بی‌خبر].

**لە ملیان دا:** بریتی لە کوشتیان، سەریان بری (جلال محمود. بەرگی١ .٤٢٤): [کنایە از او را کشتند، سرش را جدا ساختند].

**لە نالێش دەدات و لە بزماریش:** بریتی لە یەکێکی دووڕوو و دووپڵ (جلال محمود. بەرگی١ .٤٢٤): [کنایە از آدم منافق و دورو].

**لە ناو بردن:** بریتی لە نەهێشتنی شتێك لە ئارادا (خال.ف.٢٦٠): [کنایە از تمام کردن چیزهای موجود].

**لە ناو دوو ئاگردایە:** بریتی لە یەکێك کە لە نێوان دوو گاشەی گەورەدایە، کەوتووەتە چورتمەوە (جلال محمود. بەرگی١ .٤٢٥): [کنایە از آدمی کە میان آشوب و بلوا قرار گرفتە باشد، گرفتار مصیبت].

**لە ناو چاوا لووت دەردێنێ:** واتە زۆر دزە (معروف.٨٨): [کنایە از دزد ماهر].

**لە ناو گیرفانیەوە پووك ئەنێ!:** بریتی لە یەکێك کە لە بەر خۆیەوە تووڕەیی خۆی سەبارەت بە کەسێ دەربڕێ (رخزادی.٣٤٤): [کنایە از کسی کە در دلش خشم و عصبانیت خود را نسبت بە کسی بیان دارد].

**لە نەتاشیاگ ئەتاشێ:** واتە لە هیچ نەبوو، قسە دروس ئەکا (رخزادی.٣٤٤): [کنایە از هیچی نشدە پاپوش درست می‌کند و تهمت می‌زند].

**لە وەخت ڕاوا گووی تێ!:** بە یەکێکی وەختنەناس ئەوترێ: کنایە از کسی کە هنگام و زمان انجام کاری را بە درستی درک نمی‌کند.

**لە هۆجەنەی خۆی ئەتۆرێ!:** بریتی لە یەکێك کە لە خۆی یا لە ماڵ و منالی خۆی ئەتۆرێ (رخزادی.٣٤٦): [کنایە از آدم زودرنج].

**لە هەتاو نایخاتە بەر سێبەر:** خێرایی لە کار، واتە ناهێڵێت سێبەری بە سەردا بێت کە جێبەجێ دەکات (جلال محمود. بەرگی١ .٤٢٥): [کنایە از آدمی کە در کار کردن سریع باشد].

**لە هەر لایەکەوە با بێت ئەو شەن ئەکات:** بریتی لە هەلپەرەست کە لەگەڵ هەموو کەسێکدا بۆ بەرژەوەندی خۆی ڕێك بکەوێت (جلال محمود. بەرگی١ .٤٢٥): [کنایە از آدم فرصت‌طلب کە با همە کس بسازد و مطابق با روز رفتار کند].

**لە هەزار ئاوی داوە قولی تەڕ نەبووە:** ١) بریتی لە یەکێك کە زۆر فێڵبازە، زرنگە: ١) [کنایە از آدم زرنگ و بسیار نیرنگ‌باز] ٢) بریتی لە کەسێکی دنیادیدە: (جلال محمود. بەرگی١ . ٤٢٨) ٢) [کنایە از آدم باتجربە است].

**لە هەفت ئاسمان ئەستێرەیەك شك نابا:** ١) [بریتی لە یەکێکی زۆر نەدار و هەژار] ٢) [بێ‌کەسە] ٣) [نائومێد]: ١) کنایە از آدم فقیر ٢) بی‌پشتیبان ٣) ناامید. (فتاحی قاضی. بەرگی١ . ٣٦٤)

**لە هەفت ئاوی داگەو قولی تەڕ نەوگە:** بریتی لە یەکێکی زۆر زیرك و فێڵباز (خال.٣٩٥): [کنایە از آدم بسیار زیرک و نیرنگ‌باز].

**لە هەوار جێی ماگ:** بریتی لە کچێك کە دێر شو بکا: کنایە از دختری کە دیر شوهر کند.

**لە هیچ شوێنێك قنگی ئارام ناگرێ:** بریتی لە یەکێك کە لە بێ ئۆقرەیی خۆی ناتوانێ لە هیچ شوێنێ دانیشێ (جلال محمود. بەرگی١ .٤٣٦): [کنایە از آدمی کە آرامش نداشتە باشد و در هیچ جایی چندان نماند].

**لە هیچ شوێنێك قنگی توێتە ناخوات:** لە هیچ شوێنێك

ئۆقرەی نییە، ئارام ناگرێت تێر دانانیشێت (جلال محمود. بەرگی٢. ١٣٧): [کنایه از در هیچ جایی آرامش ندارد آرام و قرار ندارد و در هیچ جایی ساکن نمی‌شود].

**لە یەك پڕن:** برێتی لە دووکەس کە ڕقیان لە یەکە (جلال محمود. بەرگی١ .٤٣٦): [کنایه از دو نفر که نسبت به هم کینه دارند].

**لەبارە:** برێتی لە یەکێك کە گونجاوە ڕێکوپێکە: دەڵێن فسیارەکەس بۆئەوکارە زۆر لەبارە، واتە دەگونجێت ئەوکارەی پێ بکەن، توانای هەیە و قابلیشە و تیایدا سەردەکەوێت (جلال محمود. بەرگی١. ٤٢٠): [کنایه از مناسب بودن کسی برای انجام کاری: به این معنی که در آن کار موفق خواهد شد].

**لەبەر چاو قالاوو چاو دەرتێری:** [بە یەکێکی زیرەك و فێڵباز دەڵێن]: کنایه از آدم رند و مکار. (حیرت.٤٣٢)

**لەبەرچاوکەفتن:** برێتی لە بێئابڕوو و کەنەفت بوون: کنایه از بی‌اعتبار شدن، خوار و بی‌مقدار شدن.

**لە بەری تەشی ئەڕێسێ:** برێتی لە یەکێك کە بۆ کەسێکی‌تر خوڵتە بکا و خۆی بنوێنێ و لێ بترسی و حسێبی لی بباتێ کنایه از در برابر او تملق و ریاکاری می کند.

**لە جێیەك دانانیشێت ئاو بچێتە ژێری:** برێتی لە یەکێك کە زۆر دووربین و بەپارێزە (جلال محمود. بەرگی١ .٤٢٤): [کنایه از آدم عاقبت‌اندیش].

**لەرز بۆ بڕین:** برێتی لە تۆقاندنی یەکێك: کنایه از ترسانیدن. (خال.ف.٢٥٤/ مەزبر.٧٧٠)

**لەرزی لێ هاتووە:** زۆر دەترسێت، چاوەڕێی گاشەیەك، سزایەك، یان زیانێك دەکات (جلال محمود. بەرگی٢. ١٣٤): [کنایه از بسیار می‌ترسد، در انتظار آشوب و بلوا و رنج و آزار به سر می‌برد].

**لەرزی لێ هێنا:** واتە ترسی نایە بەر، ترساندی (جلال محمود. بەرگی١. ٤٢٨): [کنایه از ترس تو دل کسی انداختن].

**لەسەر تەوقی سەر ئەخولێتەوە (لەسەرحەوت سەرین جێی نابێتەوە):** برێتی لە ئەوپەڕی دەرد و ئازار (جلال محمود. بەرگی١ .٤٢٨): [کنایه از شدت درد و آزار].

**لەسەری ئەکاتەو:** [واتە لایەنگری لێ دەکات]: کنایه از از او طرفداری می کند. (حیرت.٤٤٧)

**لەش بەبارنەبی:** واتە ناخۆش نەبی: کنایه از بیمار نشوی.

**لەش قورس:** ١) برێتی لە مەردومی تەمەڵ: ١) [کنایه از آدم تنبل]. ٢) برێتی لە مەردومی لەش پیس (خال.ف.٢٥٦): ٢) [کنایه از جنابت دار، جُنُب].

**لەش:** برێتی لە شەرمی ژن: کنایه از شرمگاه زن. (مەزبر.٧٧٢)

**لەشبەبار:** برێتی لە کەسێك کە هەر نەخۆش و دەردەدار بێ (خال.ف.٢٥٦): [کنایه از آدم بیمار].

**لەشبەدۆشاو:** برێتی لە یەکێك کە بە بایەك نەخۆش بکەوێ و بو گاڵتە کردن بەکەسێ کە خۆی بە ناسك و نازدار دەژمێرێ (خال.ف.٢٥٦): [کنایه از نازك نارنجی].

**لەشکر بەزێن:** برێتی لە ژنی سەڵیتەی زمان درێژ: کنایه از زن زبان دراز بی‌حیا. (مەزبر.٧٧٢)

**لەشی سووکە:** برێتی لە یەکێکی ئیشکەر و ئازایە (جلال محمود. بەرگی١ .٤٢٩): [کنایه از آدم کاری و زبر و زرنگ].

**لەچك بە سەرە:** برێتی لە ئافرەت (خال.ف.٢٥٢): [کنایه از زن].

**لەچك لاوردن:** برێتی لە دەسدرێژی کردن بە یەکێك: کنایه از تجاوز کردن. (کریمپور.٨٠٧)

**لەگەڵ جێماگە:** واتە زۆر پەلەیەتی (رخزادی): [کنایە از عجلە کردن].

**لەگیجەنگەدەچووە (لە گرێژەنەچوو):** برێتی لە شتێك کە شیرازەی تێك چووە (جلال محمود. بەرگی١. ٤٢٣): [کنایە از چیزی کە چهارچوبش بهم خوردە باشد].

**لەعین:** برێتی لە زاڵم: کنایە از ستمگر. (مەزبر.٧٧٢)

**لەغاو بۆ شلکردن:** برێتی لە رێگەدان بە کەسێ کاری سەربەخۆ بکا: کنایە از آزاد گذاشتن آدم خودسر. (مەزبر.٧٥٨)

**لەغاوکردن:** برێتی لە جڵەوگرتنی یەکێك (خاڵ.ف.٢٣٩): [کنایە از منع کردن کسی].

**لەقە لە هەور دەدات:** واتە یاخی بووە و مل نادات (جلال محمود. بەرگی٢. ١٣٥): [کنایە از متمرد شدە و تسلیم نمی‌شود].

**لەقە:** [برێتی لە مرۆڤی گەنەڵ و ئاکار خراپ]: کنایە از فاسد و بدکردار. (حیرت.٤٥٠)

**لەقە لە بەخت خۆت مەدە:** واتە خۆت بێ بەش مە کە.یان ئەم هەل و دەرفەتە لە دەست مەدە. کنایە از خود را محروم مکن و این فرصت را از دست مده.

**لەقەلەق:** برێتی لە دژوار و زەحمەت (بە لەقەلەق دەرچووم): کنایە از دشواری. (مەزبر.٧٧٣)

**لەکۆڵخستن:** برێتی لە رزگار کردنی یەکێك لە شتێکی ناخۆش (خاڵ.ف.٢٥٨): [کنایە از رها نمودن کسی از مسألەای ناخوشایند].

**لەکۆڵکەوتن:** برێتی لە رزگاربوونی یەکێك لە شتێك (خاڵ.ف.٢٥٨): [کنایە از رهایی یافتن کسی از چیزی].

**لەناوچوون:** برێتی لە نەمانی شتێك (خاڵ.ف.٢٦٠): [کنایە از اتمام چیزی].

**لە نجەولار ئەکا:** [برێتی لە یەکێك کە بە ناز و ئینجە و فینجە بڕوات بە رێگا]: کنایە از کسی کە با ناز و ادا راە می‌رود. (حیرت.٤٥٥)

**لەنگەری داخستگە:** برێتی لە یەکێك کە لە جێگایەکدا خۆشی پێ ڕابوێرێت و پەلەی نەبێت: کنایە از آدمی کە در جایی یا منزلی بە او خوش بگذرد و عجلە ای برای رفتن نداشتە باشد.

**لەولای سفرەوە سێباز ئەکا:** واتە زۆر نەزانە (معروف.٨٩): [کنایە از کسی کە بسیار ناآگاە است].

**لێ برپیاگە:** [واتە: بە شێوەیەکی جیدی دەستی کردووە بە تێکۆشان]: کنایە از بە طوری جدی مشغول تلاش شدە است. (حیرت.٤٥٨)

**لێبردن:** برێتی لە هەڵخڵەتاندنی یەکێك (خاڵ.ف.٢٦٣): [کنایە از فریب دادن کسی].

**لێخورە دەشتە:** بە کارێك ئەوترێ کە گیروگرفتی لە رێدا نەبێ (خاڵ.٤١١): [کنایە از کاری کە با هیچ موانعی روبرو نشود].

**لیس تێکوتان:** برێتی لە زۆر هاتوچۆکردنی کەسێك بۆ شوێنێك (خاڵ.ف.٢٧٠): [کنایە از رفت و آمد زیاد کسی بە جایی].

**لێسە:** برێتی لە خواردەمەنی زۆری خۆڕایی: فسیارکەس هەر (لێسە)ی ببێ بسیەتی (خاڵ.ف.٢٦٦): [کنایە از غذای فراوان و رایگان].

**لێشاو:** برێتی لە زەحف، فرە (نان و ئاو لێشاوە): کنایە از فراوانی. (مەزبر.٧٨٢)

**لێچوون:** برێتی لە پەرینی وڵاخی یەك سم لە مێیەکەی (خاڵ.ف.٢٦٤): [کنایە از جفت گیری الاغ].

**لێگۆڕان:** برێتی لە بەدبەختبوون و رێ ون کردن (خوالێی گۆڕیوە): کنایە از بدبخت شدن. (مەزبر.٧٨٣)

**لێف شۆڕ:** برێتی لە ڕووگرژ: کنایە از اخمو. (مەزبر.٧٨٢)

**لێڵاو:** برێتی لە کوێربوون: کنایە از کور شدن. (مەژار.٧٨٤)

**لێو بەبارە:** برێتی لە یەکێك کە کۆستی کەوتووە. خەفەتبارە (جلال محمود. بەرگی١ .٤٤): [کنایە از کسی کە عزیزی را از دست دادە و غمگین است].

**لێو بردن بە دەما:** برێتی لە تووڕەبوون بە جۆرێك کە لە عەزرەتا لێو بەرێ بە دەما (خاڵ.ف.٢٦٩): [کنایە از خشمگین شدن بە گونەای کە لبانش را گاز بگیرد].

**لێوبەبار:** برێتی لە مرۆڤی خەفەتبار (خاڵ.ف.٢٦٩): [کنایە از آدم غمگین].

**لێوە لەرەیەتی:** واتە دەترسێت (جلال محمود. بەرگی١ .٤٤): [کنایە از این کە می‌ترسد].

**لێوەرگەڕاندن:** برێتی لە وەرام دانەوە: کنایە از پاسخ گفتن. (مەژار.٧٨٥)

**لێوەرگرتن:** برێتی لە پەند قبووڵ کردن: کنایە از اندرز گرفتن. (مەژار.٧٨٥)

**لێوەلەرە:** برێتی لە ترسان بە جۆرێك لێو بێتە لەرزین (خاڵ.ف.٢٦٩): [کنایە از لرزش شدید از ترس].

**لێوکوروشتن:** برێتی لە تووڕەبوونی زۆر یان عەزرەت و ئاوات: کنایە از خشم و حسرت زیاد. (مەژار.٧٨٥)

**لێوی خۆی گەست:** تێ گەیشت و هەستی بەکارەکە کرد، وریا بووەوە (جلال محمود. بەرگی١ .٤٤١): [کنایە از فهمید و کار را احساس کرد، هوشیار شدە است].

**لێوی لێ دەکرۆژێ:** ١) برێتی لە یەکێك کە لە کەسێکیتر قینی بێ و هەڕەشە و گوڕەشەی لێبکا: ١) کنایە ازکسی کە با دیگری دشمن باشد و او را تهدید کند ٢) ڕقی لێ هەستاوە و بۆ هەلێك دەگەرێت پێوەی بدات. زیانی پێ بگەیەنێت: ٢) کنایە از سخت از او خشمگین است و بە دنبال فرصتی است کە آسیبی بە او برساند. (فتاحی قاضی. بەرگی١ . ٣٨٤)/(جلال محمود. بەرگی٢ . ١٢٨)

**لێوی لێ نەداوە:** نەیخواردووە، نەیخواردۆتەوە (جلال محمود. بەرگی١ . ٤٤١): [کنایە از نخوردە است، ننوشیدە است].

**لێویاوە بە دڵما:** [واتە دڵم خەبەر ئەدا، خورپە کەوتووە دڵم]: بە دلم الهام شدە. (حیرت.٤٥٨)

# م

**مات کردن:** برێتی لە کوشتن (خاڵ.ف.٢٧٢): [کنایە از کشتن].

**ماتی بردگەسەو:** [برێتی لە یەکێك کە کەوتووەتە نێو خەم و پەژارە]: کنایە از آدم اندهگین. (حیرت.٤٥٩)

**ماخولان (ماخولانیەتی):** برێتی لە یەکێکی ئۆقرە لێبڕاو (جلال محمود. بەرگی١ .٤٤٣): [کنایە از آدم ناآرام کە در هیچ جای قرار نداشتە باشد].

**مادە:** برێتی لە شەق، (مادە)یەکی پیادا واتە شەقێکی تێ هەڵدا (خاڵ.ف.٢٧٢): [کنایە از لگد زدن].

**مار کوژیان کرد:** زۆریان لێدا (جلال محمود. بەرگی٢. ١٣٩): [کنایە از او را بسیار زدند].

**مارانگاز:** برێتی لە یەکێك کە لە ژیاندا بەپارێز بێت و هەمیشە سڵ بکاتەوە، مارانگازە: واتە چاوترسێن بووە (جلال محمود. بەرگی١ .٤٤٣/ خاڵ.ف.٢٧٣): [کنایە از کسی کە از اتفاق یا حادثەای عبرت گرفتە باشد و سعی کند کە دیگر برایش تکرار نشود].

**مارە بڕانەی دایکیەتی:** برێتی لە یەکێك کە داوای شتێك بکات و هی خۆی بزانێت، کە مافی ئەوەشی پێوە نەبێت (جلال محمود. بەرگی٢. ١٣٩): [کنایە از کسی کە خواهان چیزی باشد و آن را مال خویش بپندارد در حالی کە هیچ حقی نیز نسبت بە آن نداشتە باشد].

**ماری تێ زایگە** (ئەمومن.پ.٥٩): [برێتی لە کارێك یان کەسێك کە تووشی گیر و کۆسپ بووە: کنایە از کسی کە در زندگی با گرفتاری و مانع روبرو شود].

**ماری ڕەش ئێقی بۆ دەکاتەوە:** ١) برێتی لە یەکێکی زۆر هەژار. واتە: هێندە شایستەی میهرەبانی و بەزەیی پیاهاتنەوە و دەستگیرۆییە تەنانەت ماریش بەزەیی پێدا دێتەوە: ١) [کنایە از آدم بسیار فقیر و درماندە] ٢) واتە زۆر ڕەجاڵ و گەدا و داوەشاوە (خاڵ.٤١٤)/(جلال محمود. بەرگی١ .٤٤٣): ٢) [کنایە از آدم بسیار فقیر و تنگدست].

**ماری سکی خۆی دەخوات:** برێتی لە یەکێکی زۆر قینکەر و ڕق لە دڵ (جلال محمود. بەرگی١ .٤٤٣): [کنایە از آدمی کە از درونش خشم و کینە می‌بارد].

**ماری مردوو دەخاتە بەر پای:** برێتی لە ترساندن (جلال محمود. بەرگی١ .٤٤٤): [کنایە از این کە او را می‌ترساند].

**مازوو بەرەڵایە:** برێتی لە بەرەڵایی و بێسەرووبەری (جلال محمود. بەرگی١ .٤٤٤): [کنایە از جائیکە ورود بە آنجا آزاد است و هیچگونە قانون و قاعدەایی لازم ندارد].

**ماسە بە دەور دەمتا دیار بێ:** [برێتی لە یەکێك کە هیچی لەبەر چاو نەبێت و باشی کەسانیتر لە بیر باتەوە]: کنایە از شخص ناسپاس کە خوبیهای دیگران را فراموش کند. (حیرت.٤٦١)

**ماست نییە بە لێویەوە دیار بێت:** برێتی لە یەکێك کە هیچی لەبەر چاو نەبێت، بێئەمەك و وەفا (جلال محمود. بەرگی١ .٤٤٤): [کنایە از آدم بی‌وفا و ناسپاس و کسی کە نیکی‌های دیگران را فراموش کند].

**ماست و موو بژاردن:** برێتی لە بە وردی تۆژینەوە لە کارێ: کنایە از با دقت تحقیق کردن در کاری.

**ماستاو سارد دەکاتەوە:** مەرایی دەکات (جلال محمود. بەرگی٢. ١٣٩): [چاپلوسی می‌کند].

**ماستاو سارد کردنەوە:** برێتی لە ڕوپامایی کردن بۆ یەکێك (خاڵ.ف.٢٧٥): [کنایە از تملق و چاپلوسی].

**ماسماڵی کردن:** [برێتی لە سەرسەری کارێ کردن، شاردنەوەی ڕاستی]: کنایە از حقیقتی را پوشاندن یا

کاری را درست و اساسی انجام ندادن. (حیرت.٤٦١)

**ماسی دەریا دەبەخشێت:** برێتی لە یەکێك کە خاوەنی شتێك نەبێت و بیبەخشێت (جلال محمود. بەرگی ۱ .٤٤٥): [کنایە از کسی کە مالك چیزی نیست و آن را می‌بخشد].

**ماسی گەورە لە تاڤگەدا ئەگیرێ:** واتە پلە و مەقامی بەرز بە زەحمەت بەدەس دێ (رخزادی.۳۵): [کنایە از ارزش و مقام بلند با تلاش و کوشش بدست می‌آید].

**ماسی لە بگارا ئەگیرێ:** [واتە: هەر کارێ لە کاتی خۆیدا دەبێ بیکەی]: کنایە از کار را باید بە موقع انجام داد. (حیرت.٤٦١)

**ماشینەوە:** برێتی لە خواردنی یەکجار زۆر: کنایە از زیاد خوردن. (مەژار.٧٩٢)

**ماکەرە مەلەی بۆ دەکات:** خۆ نزیکەوکردنەوە بە ڕیایی و دووڕەنگی (جلال محمود. بەرگی ۱ .٤٤٥): [کنایە از چاپلوسی می‌کند].

**ماکەر و جاشێك بەرقلیانیەتی:** برێتی لە یەکێکی زۆرخۆر بە تەوس و گاڵتە پێکردنەوە دەڵێن (جلال محمود. بەرگی ۱ .٤٤٥): [کنایە از آدم پرخور، با طعنە گفتە می‌شود].

**ماڵ ئاوایی کردن:** برێتی لە مردن (جلال محمود. بەرگی ۱ .٤٤٥): [کنایە از مردن].

**ماڵ بە کۆڵ:** [برێتی لە نەدار، ئاوارەیەك کە تەواوی کەلوپەلی ژیانی لەگەڵ خۆیدا هەڵبگرێ و بیگوێزێتەوە]: کنایە از فقیر، آوارە و خانە بە دوش. (حیرت.٤٦٢)

**ماڵ بە ماڵ:** برێتی لە گشت خانوی ئاوایی: کنایە از خانە بە خانە. (مەژار.٧٩٤)

**ماڵ خراوکەرە:** [بە ژنێکی وێڵخەرج دەڵێن]: کنایە از زن ولخرج است. (حیرت.٤٦٤)

**ماڵ دنیا قەزاوکەڕێنە:** [واتە ماڵ و سامانی دنیا مرۆڤ لە چورتم و زیان ڕزگار دەکات]: کنایە از این کە بە وسیلە ثروت دنیایی می‌توان دفع بلا کرد. (حیرت.٤٦٦)

**ماڵ دنیا، چڵك دەسە:** [واتە شتی دنیایی بێ بایەخە]: کنایە از بی‌ارزش و فناپذیری مال دنیا. (حیرت.٤٦٦)

**ماڵ مەزنەی چاوە:** واتە هەرچیکت ویست بیکڕی باش سەرنجی لێ بدە (علی معروف.پ.۹٥): [کنایە از هرگاه خواستی چیزی را بخری اوّل دقت کن بعد آنرا بخر].

**ماڵت بڕمێ شلانەکوت بۆ بات:** [بە یەکێکی بای هەوا و خۆ بە زل زان دەڵێن]: کنایە از انسان بسیار متکبر و نخوت‌دار. (حیرت.٤٦٣)

**ماڵەبابیبوون:** برێتی لە مانەوە و شوونەکردنی کچ لە ماڵی بابیدا (ئانەوزادە.٣٤٣): [کنایە از ماندن دختر در خانە پدری و شوهر نکردن].

**ماڵەوە:** برێتی لە کەیوانو: (ماڵەوە ئەیان گوت): کنایە از همسر. (مەژار.٧٩٦)

**ماڵداری کەرە:** [بە ژنێکی دڵسۆز کە ماڵ کۆ ئەکاتەوە و ماڵ بەیەکەوە ئەنێ دەڵێن]: کنایە از زن دلسوزی کە در فکر زندگی و جمع کردن مال است. (حیرت.٤٦٥)

**ماڵی ئاوە:** برێتی لە شتێك کە بە مفت دەست کەوتبێت و بە هەوانتەش بڕوات (جلال محمود. بەرگی ۱ .٤٤٥): [کنایە از چیزی کە رایگان بە دست آمدە باشد و مفت هم از دست برود، بادآوردە را باد می‌آورد].

**ماڵی بە قوڕگرت:** واتە تووشی زیانێکی گەورەی کرد (جلال محمود. بەرگی ۱ .٤٤٥): [کنایە از این کە او را دچار ضرر و زیان و آشوب بزرگی کرد].

**ماڵی بێ دانە:** برێتی لە خواردنێکی نەرم و شل، بە کارێکی ئاسان دەوترێت. بە شتێکی هەرزان دەوترێت

کە بە هەموو کەس بکڕدرێت (جلال محمود. بەرگی٢. ١٣٩): [کنایە از غذای آبکی، بە کاری آسان و سادە گفته می‌شود. به چیزی ارزان گفته می‌شود که همه توانایی خرید آنرا داشته باشند].

**ماڵی خۆ نەخۆرە:** بریتی لە ڕژد و چنۆك (جلال محمود. بەرگی١. ٤٤٦): [کنایه از خسیس].

**ماڵی چووە سەربەشی ماڵان:** واتە مرد و میراتگر ماڵەکەی بەش کرد (جلال محمود. بەرگی١. ٤٤٦): [کنایه از این که مرد و وارثین ارثش را تقسیم کردند].

**ماڵی وێران بووە:** ١) بریتی لە زیانێکی گەورەی لێ کەوتووە ٢) بریتی لە کەسێك کە کۆستێکی کەوتووە ٣) نابووت بووە (جلال محمود. بەرگی١. ٤٤٦): ١) [کنایه از کسی که دچار ضرر و زیان بزرگی شده است] ٢) [کنایه از کسی که عزیزی را از دست داده باشد] ٣) [شکست خورده و نابود شده است].

**ماڵی ها بە کۆڵیەوە:** بریتی لە کەسێك کە جێگا و ڕێگایەکی نەبێ و هەر شەوە لە شوێنێك بێ (خال.٤١٩/ جلال محمود. بەرگی١. ٤٤٦): [کنایه از آدمی که خانه و کاشانه‌ای نداشته باشد و هر شب جایی باشد].

**مامە حوجی:** بریتی لە پاروی زل: کنایه از لقمه بزرگ. (هەژار.٧٩٧)

**مانگ دیارە و حەوەجەی بە ئەنگووس نییە:** واتە کارەکە ئاشکرایە پێویستی بەڕوونکردنەوە نییە (جلال محمود. بەرگی١. ٤٤٧): [کنایه از این که کارش آشکار است و لازم به توضیح نیست].

**مانگا ئەدۆشێ و قەزوان ئەکرۆژێ:** بریتی لە یەکێك لە گەڵ کارێکی گراندا بە کارێکی‌ترەوە خەریك بێت (جلال محمود. بەرگی١. ٤٤٧): [کنایه از کسی که همزمان با کار سنگینی که انجام می‌دهد مشغول کار دیگری نیز شود].

**مانگا بە کەڵە:** بۆ سووکی بە یەکێك دەوترێت کە هەمیشە خەڵکی بەدواوە بێت (جلال محمود. بەرگی١. ٤٤٧): [کنایه از آدمی که مردم همیشه به دنبالش باشند، سرشلوغ باشد].

**مانگای مردوو دۆی بڕا:** ١) بریتی لە یەکێك کە گەورەیەکی لە دەست بدات: ١) [کنایه از کسی که شخص بزرگی را از دست داده باشد] ٢) سەرچاوەی خێر و خۆشی وشك بووبێت، بڕا بێت (جلال محمود. بەرگی١. ٤٤٧): ٢) [سرچشمه خیر و نیکی و مایه‌ی خوشی را از دست داده باشد].

**مانگەشەو سەر لە ئێوارە دیارە:** بریتی لە هەموو شتێك لە سەرەتاوە باش و خراپی دیارە (جلال محمود. بەرگی١. ٤٤٧): [کنایه از هر چیزی که در آغاز خوبی و بدی آن معلوم است].

**مانگی دیگە (دیوە):** [واتە: کەوتووەتە بێنوێژی]: کنایه از قاعده بودن زنی. (حیرت.٤٧٠)

**مانگی شەرم:** بریتی لە مانگی هەوەڵی مارەبڕین: کنایه از اولین ماه عقد و نامزدی.

**مانگی شەرمێیەتی:** بریتی لە یەکێك کە یەکەم مانگی شووکردنیەتی بە یەکێك دەڵێن کە شەرم بکات و شەرمەکەی لە جێی خۆیدا نەبێت (جلال محمود. بەرگی١. ٤٤٧): [کنایه از عروسی که اولین ماه عروسی‌اش باشد یا به یکی گفته می‌شود که شرم کند اما شرمش بجا نباشد].

**مای دۆخوا تێرێتەو:** [بە یەکێك دەڵێن کە کارێك بە دوا بخاو تەفرەی بدا]: کنایه از کاری را به تأخیر انداختن، کش و لفت دادن. (حیرت.٤٧٠)

**مای دۆوەکەمان (دۆخواکەمان) هێنایەوە:** بریتی لە

کەسێك کە کارێك بکات پێچەوانەی خواستی تۆ بێت (جلال محمود. بەرگی۱ .٤٤٧): [کنایه از کسی که کاری را بر خلاف و میل تو انجام دهد].

**ماینەکەی بەحیلەیە:** بە شۆڕەژنێکی، ژیر و کارامە دەڵێن (جلال محمود. بەرگی۱ .٤٤٨): [کنایه از زنی که نجیب، عاقل و کارآمد باشد].

**ماینەکەی نژادە:** برێتی لە یەکێك لە کارەکەی لە برەو دایە و بێگیروگرفتە و دەگاتە ئاواتی خۆی (جلال محمود. بەرگی۱ .٤٤٨): [کنایه از کسی که کارش رو به پیشرفت است و روزگار به کامش است و به آرزوی خویش می‌رسد].

**مرۆچەی خواردووە:** ۱) [برێتی لە یەکێك کە زۆر بتڕێ] ۱) کنایه از کسی زیاد تیز بزند، ۲) [برێتی لە یەکێك کە پەلە بکاو بە تونلوتوڵی کار بکا]: ۲) کنایه از تند و چالاک. (حیرت.٤٧۱)

**مرۆڤ کەڕەتێ پای هەڵنەکەفێ:** مرۆڤ کەڕەتێ تووش زەرەر ئەبێت دەبێ پەندی لێوەرگرێ: کنایه از آدم یک بار صدمه و ضرر می‌بیند و باید از آن عبرت بگیرد.

**مرمری سەرلاکە:** بۆ سووکی بە هەرایەك دەوترێت کە لە سەر تەماعێك هەڵگیرسا بێت (جلال محمود. بەرگی۱. ٤٥٠): [برای تحقیر و کنایه از آشوبی است که به خاطر طمعی به پا شده باشد].

**مرخی لێ خۆش کردووە:** برێتی لە یەکێك کە زۆر تامەزرۆی دەستکەوتێکە (جلال محمود. بەرگی۱ .٤٥٠): [کنایه از کسی که زیاد در اشتیاق رسیدن به بهره و نصیبی باشد].

**مرداربوونەوە:** برێتی لە مردنی ئادەمی خراپ بە هۆی ڕیسوایی و بەوناوی (خاڵ.ف.٢٨٥): [کنایه از مردن آدم بدکار و فاسد به علت رسوایی].

**مردارکردنەوە:** دروست ئەنجام نەدانی کارێك (خاڵ.ف.٢٨٥): [کنایه از کاری که به طور ناقص انجام گیرد].

**مردگ لە چاڵ دێرێ:** بەو کەسە دەوترێ کارێك یان پێویستیەکی بکەوێتە لای کەسێکی تر (جلال محمود. بەرگی۲. ١٤٠): [کنایه از گیر بودن کاری یا احتیاجی نزد فرد دیگر].

**مردگ ماموٚخ:** [برێتی لە یەکێك کە بۆ ئەوە شتێك یا مافێکی خۆی بە دەست بهێنێ خۆی با لە مردن هەتا بە دەسی بێنێ]: کنایه از شخص ضعیف‌الحال برای پیش بردن مطامع و مقاصد خود زود زود خود را به مردگی بزند. (حیرت.٤٧۱)

**مردن و سووتان:** برێتی لە کۆشش کردن و تەقالای زۆر دان: (مردم و سووتام دەگەڵم نەهات): کنایه از کوشش و تمنّای زیاد. (مەزهەر.٨٠٤)

**مردن هەر جارێکە:** برێتی لە ئەوە کە مرۆڤ نابێت سەرشۆڕی قەبووڵ بکات یا بترسێت (جلال محمود. بەرگی۱ .٤٥۱): [کنایه از آدمی نباید شرمساری و تسلیم را بپذیرد و یا بترسد].

**مردنی لە بەر چاوە:** ۱) برێتی لە مرۆڤی موسوڵمان و خواترس. ۲) دەزانێت دەمرێت لە گەڵ ئەوەشدا واز ناهێنێت و سوورە لە سەرکارەکە (جلال محمود. بەرگی۱ .٤٥٠): ۱) [کنایه از مردم مسلمان و با ایمان] ۲) [کنایه از این که می‌داند که می‌میرد ولی باز هم دست بردار نیست و نسبت به آن پافشاری می‌کند].

**مردنی لە بیرچۆتەوە:** برێتی لە یەکێکی چاوچنۆك کە بیر لە حەڵاڵ و حەرام نەکاتەوە، هەر هەڵپەی ماڵی دنیای بێت (جلال محمود. بەرگی۲. ١٤٠): [کنایه از آدم خسیسی که به حلال و حرام نیندیشد و در فکر و

طمع مال دنیا باشد].

**مردوو لەمە پاکتر ناشۆرێت:** بە هەلێك دەوترێت کە هەلکەوتبێت. واتە هەلی چاکمو لە دەستی مەدە (جلال محمود. بەرگی١ .٤٥١): [کنایە از فرصتی کە پیش آمدە. فرصت خوبی است آن را از دست مدە].

**مردوو زیندوو کردن:** برێتی لە نوێکردنەوەی شتێك یا شوێنێك: (خال.ف.٢٨٦) [کنایە از بازسازی جایی یا چیزی].

**مڕی کردووە:** [واتە ناوچاوی تاڵ کردووە و تورشاندوویە]: کنایە از اخم کردە، ابرو در هم کشیدە است. (حیرت.٤٧٢)

**مریشکە ڕەشە:** برێتی لە سوورەتێکی گچکەی قورعان (نەسر): (کوڕەکەم تا مریشکە ڕەشەی خوێندووە): کنایە از سورە نصر در قرآن. (معزبر.٨٠٦)

**مزرەقی:** برێتی لە سەریەك بێ ماوەدان: کنایە از ناآگاهانە و بدون مهلت. (معزبر.٨٠٦)

**مس لە گوێ بوون:** برێتی لە کەسێك خۆی کەڕ بکات و نەیەوێت هیچ ببیسێت (جلال محمود. بەرگی١ .٤٥١): [کنایە از آدمی کە خود را بە کری بزند و نخواهد چیزی را بشنود].

**مشت قووچاو:** برێتی لە ڕژد و ڕەزیل: کنایە از خسیس. (معزبر.٨٠٨)

**مشت قووچیاگ:** برێتی لە یەکێکی ڕژد و چنۆك: کنایە از آدم خسیس.

**مشت لە درموش دان:** برێتی لە یەکێك کە بە گژ ئیشێکی گەورەدا چووبێت و زیانی لێوە تووش بووبێت (جلال محمود. بەرگی١ .٤٥١): [کنایە از کسی کە با کار دشواری روبرو شود و از آن دچار زیان و ضرر شود].

**مشتودرموش:** برێتی لە دەمقاڵییەکی سەخت لە ناو دووکەسدا (خال.ف.٢٩٢): [کنایە از بحث و مجادلە میان دو نفر].

**مشتومڕ کردن:** [برێتی لە گەمە و گاڵتەی نێوان چەن کەس]: کنایە از زد و خورد تفریحی و دوستانە و شلوغبازی درآوردن میان چند نفر. (حیرت.٤٧٣)

**مشتی مەلا:** برێتی لە ڕژد و چنۆك. (نالی): [کنایە از خسیس]. یا کۆمەڵە زیوی بوخەلا دوور لە سەخا بێ/ موغلەق بە بەخیلی بە مەسەل مشتی مەلا بێ.

**مشك لە ماڵیا بە چێوشەقە نەگەڕێ:** ١) [برێتی لە یەکێکی هەژار، ٢) برێتی لە یەکێکی نانەخۆر و ڕژد]: ١) کنایە از فقیر و نداری، ٢) کنایە از آدم خسیس. (حیرت.٤٧٤)

**مشك لە ماڵیا سەفرا دەکا یان مشکی کوێر لە ماڵیدا ناشتا ناکات:** برێتی لە یەکێکی زۆر ڕژد و چرووك، هەرچی خواردن بێت لە ماڵیدا نییە (جلال محمود. بەرگی١ .٤٥٢): [کنایە از شخص بسیار خسیس کە هیچگونە غذایی در منزل ندارد].

**مشك لە ماڵیا کلکی چەور نابێ:** واتە زۆر ڕژد و چرووکە، هەرچی خواردن بێ لە ماڵیا نییە (خال.٤٢٧): [کنایە از آدم خسیس کە هیچ گونە خوراکی در منزلش نباشد].

**مشکانە:** برێتی لە فێڵبازی و دەسبڕی بە نهێنی: کنایە از نارو زدن دزدکی. (م.م) چ٢.٤٠٨)(معزبر.٨٠٩)

**مل لە چەقۆ خستن:** برێتی لە کاری بقە کردن: کنایە از ریسک کردن. (معزبر.٨١٢)

**مل لە چەقۆ ساوین:** برێتی لە کاری پڕ لە مەترسی و بقە کردن: کنایە از ریسک کردن. (معزبر.٨١٢)

**مل لە چەقۆ هەڵسوون:** برێتی لە خۆ خستنە گێژاو و مەترسییەوە (خال.ف.٢٩٤): [کنایە از خود را بە خطر

ئانداختن و ریسک کردن].

**مل لە موو باریکتر:** برێتی لە ئامادە بۆ گشت فەرمانێ: آمادە برای هر گونە فرمانبرداری. (معژر.٨١٣)

**مل نایرێتە راسی:** برێتی لە یەکێك کە خۆ بەدەسەوە ندات بۆ شتێك یان لە سەر ئەنجام فرمانێك رەزامەند نەبێت: کنایە از آدمی کە تسلیم نشود و برای چیزی یا از آخر و عاقبت امری یا دستوری راضی نباشد.

**ملازی بردگەسەو:** [واتە: خۆی حەشارداوە و دەیەوێ هەڵمەت بدا]: کنایە از کسی کە کمین کردە و حالت تهاجمی بە خود گرفتە. (حیرت.٤٧٤)

**ملاك کردن:** برێتی لە چێشتی خواردەمەنی، من (ملاکی)ی نانەکەم نەکرد (خال.ف.٢٩٣): [کنایە از نخوردن غذا].

**ملەتاتێکردن:** برێتی لە یەکێك کە کوتبێتە نێو کاروباری خەڵك و شۆفاری بکا: کنایە از آدمی کە در کار دیگران دخالت و جاسوسی بکند.

**ملپان:** برێتی لە تەمەڵی قەڵەو: کنایە از چاق و تنبل. (معژر.٨١٢)

**مل پانە:** بە تەوەس و گاڵتە پێکردن بە یەکێك دەوترێت کە بۆ هەموو شتێك و هەموو کەسێك سەر شۆڕ بکات، قایلی هەموو نەنگی و نزمییەك بێت (جلال محمود. بەرگی١ .٤٥٢): [برای طعنە و شوخی کردن است و کنایە از کسی کە پیش همە چیز و همە کسی تعظیم می‌کند و راضی بە قبول هر نوع ننگ و بی‌آبروییست].

**ملپێوەنان:** برێتی لە کردنی کارێك و گوێ نەدان بە ئاکامی ئەو کارە: کنایە از ریسک کردن. (معژر.٨١٢)

**ملدان:** برێتی لە گوێ رایەڵی و فەرمانبەری (خال.ف.٢٩٤): [کنایە از اطاعت و فرمانبرداری].

**ملشکاندن:** ١) برێتی لە رۆینی یەکێك لە شوێنێك، ئەم وتەیە بۆ سووکی ئەوترێ: ١) [کنایە از رفتن مزاحم] ٢) برێتی لە خواردنی شتێك بە زۆری (خال.ف.٢٩٤): ٢) [کنایە از خوردن چیزی بە اجبار و زور].

**ملچەوت:** ١) برێتی لە فەرمانبەر و گوێبیس: کنایە از مطیع ٢) برێتی لە فێڵباز: کنایە از حیلە گر. (معژر.٨١٢)

**ملکەچە:** ١) لارەملە، خەفەتبار ٢) ناهومێدە ٣) شەرمەزارە ٤) باری کەوتووە ٥) ناچارە (جلال محمود. بەرگی١ .٤٥٢): ١) [کنایە از گردن کج و غمگین] ٢) [ناامید] ٣) [شرمسار] ٤) [بدبیاری آوردە] ٥) [ناگزیر].

**ملکەو:** برێتی لە جوان و خوەشك: کنایە از دلبر زیبا. (معژر.٨١٢)

**ملوومووش کردن:** ١) برێتی لە پەیجۆر شتێك بوون و بە شوێن شتێکا گەڕان: ١) کنایە از کنجکاوی کردن و دنبال چیزی گشتن ٢) برێتی لە یەکێك کە کەوتوێبێتە ملوومووش و بە دوای خواردندا مووشە بکا: ٢) کنایە از کسی کە حریصانە بە دنبال غذاست. (جلال محمود. بەرگی١ ٤٥٣)/ (حیرت.٤٧٤)

**ملی بە نۆ تەور نابڕێتەوە:** بۆ تەوەس و ڕقە، بە یەکێك دەوترێت کە بیەوێت لە سەر ورگی ئەم و ئەو بژی (جلال محمود. بەرگی١ .٤٥٢): [رای طعنە است کنایە از کسی کە سربار این و آن باشد].

**ملی شۆڕەوە کرد:** ١) واتە ڕازی بوو، شل بوو، رێکەوت ٢) بەزی هاتە ژێر بار و خۆی بەدەستەوەدا (جلال محمود. بەرگی١ .٤٥٢): ١) [کنایە از راضی شد، تسلیم شد، بە توافق رسید] ٢) [شکست خورد تسلیم شد].

**ملی لاربۆتەوە:** ١) مردووە: ١) کنایە از مردە است ٢) خەوتووە، دەڵێن: منداڵەکە ملی لاربۆتەوە: ٢) کنایە از خوابیدە است.

**من مردوو تۆ زیندوو:** پیشبینییەکەی تۆ ناڕاستە: کنایە از پیش‌بینی تو نادرست از آب درمی‌آید.

**منال و کاڵ:** بریتی لە ڕووت و ڕەجاڵ: کنایە از ضعیف و بیچارە. (مەژار.٨١٤)

**منداڵ بازاڕە:** بریتی لە کەسێك کە ئاکاری منداڵانەی بێت: کنایە از کسی کە رفتار بچگانە داشتە باشد.

**مۆرك لە خۆ نان:** بریتی لە خۆ بە زل زانین و تاریفی مۆخدەرهاتن: بریتی لە وەڕەزبوون و ماندووبوونی مەردوم لە شتێکەوە (خاڵ.ف.٢٩٨): [کنایە از خستە و بی‌حوصلە شدن از چیزی].

**مۆخ کێشان:** بریتی لە ئەرك پێدان و جاڕز کردن: کنایە از زحمت دادن و پکر کردن. (مەژار.٨١٦)

**مۆخی بە ناو کرد:** ١) پەرێشانی کرد ٢) تووشی زیانی مادی و مەعنەوی کرد ٣) زۆر ماندوی کرد. (جلال محمود. بەرگی١ .٤٥٤): ١) [غمگینی کرد] ٢) [او را دچار ضرر مادی و معنوی کرد] ٣) [بسیار او را خستە کرد].

**مۆرە بەسەرچووە:** بریتی لە یەکێك کە باوی نەمابێ: کنایە از آدمی یا چیزی کە از رونق افتادە باشد و بی‌اهمیت شدە باشد.

**مۆ کردن:** کنایە از لاف بی معنی زدن. (مەژار.٨١٧)

**موو بە بەینیانا ناچێ:** ١) [ئەو پەڕی دۆسایەتی و خۆشەویستی نێوان دوو کەس پیشان ئەدا]: ١) کنایە از اوج صمیمیت و علاقە میان دو شخص ٢) [بریتی لە دووکەس کە زۆر تێکەڵ بن، هیچ شتێك لە یەکیان ناکات]: ٢) کنایە از دو نفر کە یار و همدم هم باشند و هیچ چیزی آنها را از هم جدا نمی‌کند. (ئەمومن.پ.٦٤/ حیرت.٤٧٩)

**موو بە موو گەڕیان:** بریتی لە پشکنین بە شێوەیەکی زۆر ورد: کنایە از تفتیش دقیق. (مەژار.٨١٥)

**موو دەقلیشێت:** بە یەکێکی زۆر دانا دەوترێت کە هەموو شتێك لێك جیا بکاتەوە (جلال محمود. بەرگی١ .٤٥٣): [کنایە از آدم بسیار دانا کە قدرت تشخیص همە چیز را داشتە باشد].

**موو ڕاست بوونەوە:** بریتی لە تووڕەبوونی زۆر یان ترسانی زۆر: کنایە از سیخ شدن مو از خشم یا ترس زیاد. (مەژار.٨١٧)

**موو ڕاستەوە بوون:** بریتی لە زۆر تووڕەبوون، ترسان (خاڵ.ف.٣٠١): [کنایە از بسیار عصبانی شدن، ترسیدن].

**موو کردن:** بریتی لە مەمنوونبوونی کەسێك بۆ شتێك کە لە ڕواڵەتدا وا پیشان ئەدا کە پێ ڕازی نییە و لە دڵیشا زۆری پێ خۆش بێ (خاڵ.ف.٣٠٢): [کنایە از دوست داشتن زیاد چیزی امّا در ظاهر آن را نشان ندادن در حالی‌کە در باطن بە آن چیز علاقەمند باشد].

**موو لە بەری دەڕێسێت:** لێی دەترسێ و بە گوێی دەکا (جلال محمود. بەرگی٢. ١٤٢): [کنایە از، از او حساب می‌برند].

**موو لە زوانم دەرهات** (ئەمومن.پ.٦٤): [زۆر قسە کردن لەسەر چتێ: کنایە از زیاد حرف زدن در مورد چیزی].

**موو لە ماس کێشانە دەرەوە:** بریتی لە بە وردی توێژینەوە لە کارێ: کنایە از با دقت کاری را بررسی کردن.

**موورەغەی پشتی شکا:** ١) کۆستێکی گەورەی کەوت ٢) ماڵ ویران بوو (جلال محمود. بەرگی١ .٤٥٤): ١) [کنایە از کسی کە عزیزی را از دست دادە باشد] ٢) [پریشان حال شدە].

**مووڕنین:** بریتی لە دەربڕینی خەم یان تووڕەیی زۆر: کنایە از اظهار اندوە یا خشم بسیار. (مەژار.٨١٧)

**مووسایی بازی دەر تێری:** [برێتی لە یەکێك کە بەئەنقەست و بۆ فێڵ وەکوو ترسەنۆك خۆی ئەنوێنی]: کنایە از شخصی کە از ترس خود را گریان و نالان نشان دهد. (حیرت.٤٨٠)

**مووهەڵکزان:** بە یەکێك ئەوترێ بەکوتووپڕ لە جێگەیەکا حازر بێ (رخزادی): [کنایە از آدمی کە بە طور ناگهانی در جایی حاضر شود].

**مووی ڕاست بووەوە:** برێتی لە تووڕەبوون (جلال محمود. بەرگی١ .٤٥٢): [کنایە از خشمگین شدن].

**موویان هەڵ کزاندووە:** برێتی لە کەسێك کە لەو کاتەی کە پێویستە خۆی بگەیەنێ: کنایە از کسی در لحظەای کە حضور او ضروری باشد فرا برسد.

**مەتە وە خشخاش نیانن:** برێتی لە یەکێکی کولکوومووشیەوکەر، فرە لەسەر قسە چوون: کنایە از اصرار و پیگیری و بررسی امری بە صورت افراطی. (کریمپور.٨٦٤)

**مەردی بەر ئاگرە:** برێتی لە مرۆڤێکی هووشەکەر و ترسەنۆك، لە پەنای ئاگرەکەدا دانیشتووە و جێگای خۆشەو هووشە دەکات (جلال محمود. بەرگی١ .٤٤٨): [کنایە از آدم چاخان‌باز و ترسو].

**مەرگبڕین:** برێتی لە کردنی کارێك بە ڕێکوپێکی: وای دروست کردووە مەرگی بڕیوە (خال.ف.٣٠٦): [کنایە از انجام دادن کاری بە خوبی و موشکافانە بررسی کردن آن].

**مەزەبزووتن:** برێتی لە ئارەزووکردن و حەز کردن لە شتێك (خال.ف.٣٠٧): [کنایە از آرزو و میل بە چیزی داشتن].

**مەزەدار:** برێتی لە کەسێکی زۆر جوان: کنایە از جوان بسیار زیبا، برێتی لە قسەی خۆش: کنایە از سخن شیرین و جذاب. (معزز.٨٢٧)

**مەزگدار:** برێتی لە پیاوی زانا: کنایە از آدم هوشمند. (معزز.٨٢٨)

**مەزنەی دەمی کەسێ زانین:** برێتی لە زانینی مەبەستی یەکێك بە وتووێژێك کە لەگەڵیا دەیکەی: کنایە از گفتگو کردن با کسی و پی بردن بە هدف او.

**مەشکە ژەنێ پێ کردن:** [برێتی لە ئازار و ئەشکنجەدانی یەکێك و تووڕ کردنی]: کنایە از رنج و آزار دادن و عصبانی کردن کسی. (فتاحی قاضی. بەرگی١ .٤٠٤)

**مەشکە ژێنەی پێ دەکات:** ماندووی دەکا هێندە دەیهێنێت و دەیبات (جلال محمود. بەرگی٢ .١٤٠): [کنایە از خستەاش می‌کند آنقدر او را می‌آورد و می‌برد].

**مەشکە لە بەرماڵیاندا هەڵ ناخرێ:** واتە ئاژەڵیان نییە و بێ درامەتن (جلال محمود. بەرگی٢ .١٤٠): [کنایە از احشام ندارند و بی‌درآمد هستند].

**مەشکە (تاڵ) ڕەنگ ناکەم (نادەم):** کەسێك وا دەڵێت کە بە زۆر چایی زۆری دەرخوارد بدەن (جلال محمود. بەرگی٢ .٦٠): [کنایە از کسی کە بە اجبار چای بە او بنوشانند].

**مەچۆرە ژێر داری شکستە:** واتە ئیشێك کە زانیت پێت ناکرێ، دەستی مەدەرێ (خال.٤٣٢): [کنایە از کاری کە در توان تو نیست انجامش مده].

**مەچۆرە ژێر داری شکستەوە:** برێتی لە نەکردنی کارێك کە ئەنجامەکەی نادیارە یان ئەگەری شکستی هەیە. کە ئەنجامەکەیت نەزانی، یان تیایدا سەرکەوتنت بۆ مسۆگەر نەبوو مەیکە (جلال محمود. بەرگی١ .٤٤٨): [کنایە از انجام ندادن کاری کە پایان آن نامشخص است].

**مەگەز نەشمێرێ:** [واتە: بێکارە]: کنایە از بیکار است. (حیرت.٤٨٦)

**مەگەز نەکوژێ:** [واتە: بێکارە]: کنایە از بیکار است.

(حیرت.٤٨٦)

**مەگەس دەرکردن:** بریتی لە یەکێکی بێکار: کنایە از بیکار.

**مەقرِنە:** [واتە: نوقلانەی خراپ مەدە]: فال بد نزن. (حیرت.٤٨٥)

**مەکە نییە، مەدینە:** ئێرە خۆش نییە برِو بۆ شوێنێکیتر، هەر جێگا زۆرە (جلال محمود. بەرگی١ .٤٤٩): [کنایە از حال کە اینجا را دوست نداری هر کجا می‌خواهی برو].

**مەکەرمەلە:** بریتی دەڵەچەکێ و کلکە لەقێ بۆ مەردوم بەزمان (خال.ف.٢٧٧): [کنایە از تملق و چاپلوسی با زبان].

**مەل بە هەواوە وشك ئەکا:** ١) [بریتی لە یەکێك کە لە تیر هاوێشتندا چالاك و بەدەستوبرد بێت] ١) کنایە از تیرانداز ماهر، ٢) [بریتی لە یەکێك کە دەنگێکی زۆر خۆشی بێت]: ٢) کنایە از کسی کە صدای خوشی در آواز خواندن داشتە باشد. (حیرت.٤٨٧)

**مەلابانگدان:** بریتی لە کاتی نوێژی بەیانی: وقت اذان صبح، پگاه.

**مەلای شەو خۆشەویسە:** [واتە ژن خۆشەویستە]: کنایە از کسی کە زنش را زیاد از حد دوست دارد. (حیرت.٤٨٧)

**مەلابەزین:** بریتی لە یەکێك کە لە هەموو قسەیەکا بەرزە بڵێس بوەستێ (خال.ف.٣١٠): [کنایە از بسیار سخندان].

**مەلاخۆر بووە:** بریتی لە شتێك کە هێندە هەرزان بووە کە مەلاش دەتوانێ بیکرِێ: چونکە هەر خەریکی خواپەرستی بوون و هەوڵیماڵی دنیایان نەداوە (جلال محمود. بەرگی١ .٤٤٩): [کنایە از چیزی کە بسیار ارزان شدە و ملاها هم می‌توانند بخرند چون آنها بدنبال مال دنیا نرفتە‌اند].

**مەلای سەر دۆشەکی:** [بریتی لە ژنێك کە قسە قسەی خۆی بێت و شووەکەی لەبەرانبەریا بێ دەسەڵات بێ]: کنایە از زنی است کە حرف خود را در مقابل شوهر بە کرسی بنشاند. (فتاحی قاضی. بەرگی٢ . ٢٥٤)

**مەلی گۆشتخۆرە:** بریتی لە مروڤێك کە هەڵدەگرێت خزمەتی بکەیت و رێزی تەواوی لێ بنیت (جلال محمود. بەرگی١ .٤٥٠): [کنایە از کسی کە شایستە احترام است].

**مەلیچك (چۆلەکە) پەلاماری بنچك:** کاتێك بێدەسەلاتێك، پەنا بەرێتە لای کەسێ کە لە خۆی بێدەسەلاتتر بێ (جلال محمود. بەرگی٢. ١٤٠): [کنایە از موقعی است کە فرد ناتوانی کە بە فرد ناتوانتر از خود پناە ببرد].

**مەمکدەر:** بریتی لە ئافرەتێك کە شیر بدا بە مناڵ (خال.ف.٣١٢): [کنایە از زن شیردە بە بچە].

**مەنێ ماس چەنێ کەرەی ها تیا:** بریتی لە کەسێك کە لەو شتەی کە هەیەتی رێز ناگرێت و قانع نییە: کنایە از کسی کە قدر عافیت را نمی‌داند.

**مەیاندن:** بریتی لە یەخ کردن: کنایە از یخ زدن. (مەژار.٨٣٧)

**مەیە ئاوێتەی قۆزە:** [واتە: بۆ گۆرِینی باسەکە شتێکیتر مەهێنە پێشەوە]: کنایە از با پیش کشیدن بحثی موضوع را عوض مکن. (حیرت.٤٨٩)

**مەیکوتە جووتە:** بریتی لە یەکێك کە بە هیوایەك دوای شتێك بکەوێت و هیوا کەشی لە جێی خۆیدا نەبێت (جلال محمود. بەرگی١ .٤٥٠): [کنایە از آرزوی محال داشتن].

**مێخی کرد:** [وشکبوون و شەرمەسارکردنی کەسێك بە تانەوتەشەر]: کنایە از این کە با متلك کسی را سر جا نشاندن. (حیرت.٤٩٠)

**مێزاو:** بریتی لە ئاوێك کە کەم کەم برِوا (خال.ف.٣٢٢):

[کنایه از آب اندک که در جوی یا چشمه آید].

**میزی کەف ناکات:** واتە زوو کارەکەت جێبەجێ ناکات (جلال محمود. بەرگی۱ .٤٥٥): [کنایه از این که کارت را زود انجام نمی‌دهد و به تأخیر می‌اندازد].

**مێش خەساندن:** بریتی لە بە بێکاری ڕابواردن: کنایه از بیکاری. (مەژار.٨٤٣)

**مێش داویەتە دەمی:** بریتی لە یەکێکی دەستبەتاڵ و بێ‌ئیشە (جلال محمود. بەرگی۲. ۱٤۲): [کنایه از شخص بیکار].

**مێش قەپاندنەوە:** بریتی لە بێ‌ئیشی یەکێك (خاڵ.ف.۳۱۸): [کنایه از بیکاری].

**مێش لە بەردەمی هەڵنافڕێ:** [بریتی لە یەکێکی بێدەنگ و زۆر لێکراوە و فەقیرەحاڵ]: کنایه از آدم ساکت و مظلوم. (فتاحی قاضی. بەرگی۱ .٤٠٨)

**مێش لە دەمی خۆ دەرنەکردن:** بریتی لە گێلی و بەسەزمانی (خاڵ.ف.۳۱۸): [کنایه از ابله، کودن].

**مێشگر:** بریتی لە تەمەڵ و بێکار: کنایه از تنبل و بیکار. (مەژار.٨٤٤)

**مێشکی سەری بردین:** بریتی لە یەکێکی زۆرویژ و رینگەرینگکەر تووشی ژانە سەری کردین (جلال محمود. بەرگی۲. ۱٤۲): [کنایه از آدم پرحرف که مته به خشخاش می‌گذارد و زیاد پاپی می‌شود].

**مێشکی کەری خواردووە:** بە تەوەس و گاڵتە پێکردنەوە بە کەسێك دەوترێت کە درەنگ لە قسە بگات (جلال محمود. بەرگی۱ .٤٥٥): [به عنوان طعنه کنایه از آدم دیرفهم].

**مێشوولە دایگە دەور دەمی:** بریتی لە یەکێکی دەسبەتاڵ و بێکار: کنایه از آدم بیکار.

**مێشی لە بەردەمی هەڵنافڕێت:** بریتی لە یەکێکی بێدەنگ و بەسەزمان و بێدەسەڵات (جلال محمود. بەرگی۲. ۱٤۲): [کنایه از شخص آرام و بیچاره].

**مێشی لێ بۆتە گامێش:** بریتی لە یەکێکی سەرلێشێواو کە شتێکی زۆر کەمی لا زۆر گەورە بێت (جلال محمود. بەرگی۱ .٤٥٥): [کنایه از آدم پریشان و سرگردان که چیز بسیار کوچکی پیشش بزرگ جلوه نماید].

**مێشی لێ نانیشێ:** [بریتی لە شتێکی زۆر پارێزراو]: کنایه از چیزی که کاملاً محافظت شده باشد. (فتاحی قاضی. بەرگی۱ .٤٠٨)

**مێشیشی میوان نابێت:** ۱) بریتی لە یەکێك کە گوێ ناداتە قسە و ئامۆژگاری کەس و بەدەربەسەوە نایەت ۲) بریتی لە یەکێکی ڕووهەڵماڵڕاو کە لە هیچێ ناکات (جلال محمود. بەرگی. ٤٥٥): ۱) [کنایه از کسی که گوش به حرف دیگران نمی‌دهد و مقید نمی‌باشد] ۲) [کنایه از آدم گستاخ که از هیچ چیزی خجالت نمی‌کشد].

**میچی قومارخانە:** بریتی لە مەردومی زۆرزانی فێڵباز (خاڵ.ف.۳۲۱): [کنایه از شیاد و پررو، قاپ قمارخانه].

**مێمان، کەر ساحێو ماڵە:** [بۆ گاڵتەیە: واتە هەرچی ساحێو ماڵ دێنێت دەبێ بیخوا]: به مزاح: کنایه از این که هرچه را صاحب خانه بیاورد مهمان باید بخورد. (حیرت.٤٩٠)

**میوانی باینجانی:** بریتی لە کەسێك کە لە مەجلێسێکدا ڕووی نەدرێتێ، یان بانگ نەکرابێت و لە خۆیەوە چووبێت دەڵێن (جلال محمود. بەرگی۱ .٤٥٦): [کنایه از کسی که در مجلسی او را بی‌محل کنند یا دعوت نشده باشد و سرزده رفته باشد می‌گویند برای‌چه اخم کرده‌اید ما که مهمان بادنجانی نیستیم].

# ن

**ناتوانن گونیشی بگرن:** ۱) برێتی له یەکێکی بەدەسەڵات و پشت قایم: ۱) [کنایه از آدم قدرتمند و بانفوذ] ۲) فێڵباز و وریا *(جلال محمود. بەرگی۲. ١٤٤)*: ۲) [کنایه از آدم نیرنگ‌باز و زیرک].

**ناخوێن وشك:** برێتی له کەسێکی زۆر ڕژد و چنۆك: کنایه از آدم خسیس.

**ناخوێنێك ئەوشێ:** برێتی له یەکێك که به ماڵ و سامانی کەسانیتر دەسدرێژی ئەکا: کنایه از این که به حق دیگران تجاوز می کند.

**نارێك بوون:** ۱) برێتی له کەسێك که لێت دڵگیر بێ: ۱) [کنایه از کسی که از تو دلگیر شده باشد] ۲) برێتی له ناکۆکی دووکەس *(خاڵ.ف.٣٢٧)* ۲) [کنایه از کدورت میان دو نفر].

**ناسراو:** برێتی له خاوەن دەنگ و ناو: کنایه از مشهور بودن. *(مەزیر.٨٥٣)*

**ناچێته سەری:** [واته لێ نازانێ و نایدۆزێتەوە]: کنایه از این که آن را درک نمی‌کند، آنرا درنمی‌یابد. *(حیرت.٤٩٢)*

**نافەکبڕین:** برێتی له بێ‌حورمەتی کردن به یەکێك *(خاڵ.ف.٣٣٠)*: [کنایه از هتك کردن].

**ناکەوێته زەوی:** زوو دەفرۆشرێت بازاڕی گەرمه بۆ منداڵێش، واته زۆر خۆشەویسته نازداره *(جلال محمود. بەرگی۲. ١٤٤)*: [کنایه از اجناس مرغوب که زود فروخته می‌شود یا بچه محبوب و دوست‌داشتنی].

**ناڵبەندت کوێر بێت:** بۆ سووکیی یان به ڕقەوه، یان بۆ گەمه، به یەکێك دەڵێن که له ڕۆیشتندا شەق له شتێك هەڵ بدات، یان زیانێك به شتێك بگەیەنێت، بێ ئاگایانه هەنگاو بنێت: از روی تحقیر یا خشم و یا شوخی به کسی گفته می‌شود که در راه رفتن لگدپرانی کند یا زیان و ضرر به چیزی برساند و نسنجیده گام بردارد.

**ناڵکردن:** برێتی له هەڵخەڵەتاندنی یەکێك *(خاڵ.ف.٣٣١)*: [کنایه از فریب دادن کسی].

**ناڵی کرد:** [واته: به تانەوتەشەر یان به بەڵگەی پتەو دایمرکاند و نیایه سەر جێگەی خۆی]: کنایه از مسکوت و محکوم نمودن کسی با طعنه یا استدلال قوی. *(حیرت.٤٩٥)*

**نان بۆ خۆی و جۆ بۆ کەرەکەی:** به تەوس و سەرزەنشتەوه به یەکێك دەوترێ که هەر بەو شته خۆی دەیخوازێ داناکەوێ بەڵکوو کۆشش بۆ یەکێکی تریش دەکات *(جلال محمود. بەرگی۲. ١٤٤)*: [برای طعنه و تحقیر به کسی گفته می‌شود که علاوه بر خود برای دیگران هم کوشش می‌کند].

**نان به مەزنەی ڕۆژ ئەخوا:** به یەکێکی ساختەچی ئەوترێ که له هەرلایەکەوه بای بێ بەو باره شەن ئەکا *(ڕخزادی.٣٧٣)*: [کنایه از آدم کلاهبردار که از هر طرفی که منافعش بیشتر بچربد به آن طرف روی می‌آورد].

**نان خواردن:** برێتی له بەڕێوبردنی خواردەمەنی و گوزەرانی ژیان (هێشتا نووسەرێ ناتوانێ به قەڵەمەکەی (نان بخوات)).

**نان شەو:** برێتی له کەمترین پێخوری پێویست بۆ بەرگری له برسیەتی و زیندوومان ژیان. (ڕۆژێ ده سەعات کار دەکا و هێشتا بۆ (نان شەو داماوه): کنایه از غذای لازم برای رفع گرسنگی و ادامه حیات.

**نان له دەم سەگ ئەڕفێنێ:** برێتی له یەکێکی زۆر برسی و کەم تاقەت *(ڕخزادی.٣٧٥)*: [کنایه از آدم بسیار گرسنه و ناآرام].

**نان لە دەم سەگ ئەسێنێتۆ:** بە یەکێکی ڕژد و پیسکە ئەوترێ (رخزادی.۲۷۶). [کنایه از آدم خسیس].

**نان و حەڵوا:** برێتی لە کاری زۆر هاسان: (ئەم کارە بۆ من نان و حەلوایە): کنایه از کار بسیار آسان. (مەژار.۸۵۸)

**نان و دۆی خۆی هەیە:** برێتی لە یەکێك کە ئاتاجی بە کەس نەبێت (جلال محمود. بەرگی۲. ۱٤٤): [کنایه از کسی که احتیاج به کسی نداشته باشد].

**نان و چایی:** برێتی لە چاشت، خواردنی بەیانی: کنایه از صبحانه. (مەژار.۸۵۸)

**نان و نمەك خواردن:** برێتی لە پێزانین و هەڤاڵیەتی: کنایه از حق شناسی و دوستی.(مەژار.۸۵۸)

**نان و نمەکیان بە یەکەو خوارد:** [واتە بە یەك خەیانەت ناکەن]: کنایه از این که به هم خیانت نمی‌کنند. (حیرت.٤۹۸)

**نانبڕێر:** برێتی لە کەسێك لە ناو ماڵدا ڕژد بێت: کنایه از خسیس در منزل. (مەژار.۸۵۷)

**نانبڕین:** برێتی لە بێبەش کردن لە بژیو: کنایه از محروم کردن از زندگی. (مەژار.۸۵۷)

**نانتاڵ:** برێتی لە پیاوی چرووك و ڕژد: کنایه از آدم خسیس. (مەژار.۸۵۸)

**نانەشوێن:** برێتی لە قسە خستنە شوێن، دەنگۆی خراب دروست کردن بۆ کەسێ (خال.ف.۳۳۳): [کنایه از شایعه به دنبال کسی انداختن].

**نانەکەی بە دڵەوە نووسا:** بە باشی و هێمنی و دڵێکی ئارامەوە خواردی (جلال محمود. بەرگی۲. ۱٤٤): [کنایه از با آرامش خاطر غذایش را خورد].

**نانەلەم:** برێتی لە یەکێك کە لە جیاتی خواردنێك کە پێ ئەدەن کار دەکات: کنایه از کسی که در مقابل سیر شدن شکمش کار می‌کند.

**نانەمل:** برێتی لەوەی کە شتێك بخەیتە ئەستۆی کەسێك و بە سەریا ساغی کەیتەوە (خال.ف.۲۳۳): [کنایه از این که چیزی را به گردن کسی انداختن و از او بخواهید که جبران کند].

**نانخۆر و قەراخنشین:** [برێتی لە مرۆڤی بێ ناو و نیشان]: کنایه از آدم خامل و بی‌خاصیت. (حیرت.٤۹٦)

**نانخۆر:** برێتی لە خێزان و منداڵ: کنایه از عیال و فرزندان. (مەژار.۸۵۸)

**نانماڵ:** برێتی لە مرۆیەك کە ئاتاجی بە کەس نییە: کنایه از آدم خودکفا. (مەژار.۸۵۸)

**نانوئاو:** برێتی لە بژیو، مایەی ژیان: مایەی زندگی. (مەژار.۸۵۸)

**نانی پێژیاگە:** برێتی لە رەحەتی و خاترجەمی ژیانی یەکێك دابین کردن. کنایه از آسایش مطمئن کسی را فراهم کردن.

**نانی قەتش:** برێتی لە ژیان بە فەقیری: کنایه از زندگی کردن به فقیری و درماندگی. (مەژار.۸۵٦)

**نانی کەفتگە ڕۆن:** [واتە هەل و دەرفەتێکی باشی بۆ ڕەخساوە]: کنایه از موقعیت خوبی برایش پیش آمده. (حیرت.٤۹۱)

**نانی نانی:** برێتی لە مەردومی ڕژد و نان کوێر (خال.ف.۳۳۳): [کنایه از آدم خسیس].

**نانی ها لە بەر شاڵیا:** واتە خۆی ئەتوانێ خۆی بژینێ (رخزادی.۳۷۸): [کنایه از کسی که می‌تواند مخارج زندگی خود را تامین کند].

**نانی ها لە دۆڵەدا:** [واتە لە ژیانیدا خاترجەمە و خەمێکی نییە و پشتیوانی پتەوە]: کنایه از کسی که تأمین است و غم و غصه‌ای ندارد و پشتیبانش قوی است. (حیرت.٤۹۱)

**نانیان ها لە دۆڵەیەکا:** [واتە لە سەر سفرەیەکەوە نان

ئەخۆن و دۆسی گیانی گیانین]: کنایه از این که هم‌سفره‌اند و خیلی صمیمی هستند. (حیرت.٤٩٨)

**نانێکی لە گەڵ ئەودا خواردووە:** واتە ڕەوشتی ئەوی هەیە، هی ئەوی گرتووە وەك ئەو بیر و ڕەفتاری هەیە (جلال محمود. بەرگی٢. ١٤٥): [کنایه از کسی که خوی و اخلاق دیگری را گرفته باشد و مثل او بیندیشد].

**ناو خۆی لە بیر چوەتەوە:** تووشی چورتمێکی وابووە، وا گرفتار بووە، پەشۆکاوە، خەفەت و مەراقێکی قورس تووشی بووە هۆشی لە بەر براوە (جلال محمود. بەرگی٢. ١٤٥)؛ [کنایه از کسی که دچار مصیبت و بلایی شده و به همین دلیل آشفته و غمگین شده باشد].

**ناو سکم ڕەش بۆتەوە:** واتە خەفەت رزاندوومی، هێندە لە سەرم باربووە (جلال محمود. بەرگی٢. ١٤٥)؛ [کنایه از غم و غصه من را پوسیده کرده است].

**ناو چاو دێز:** برێتی لە مەردومی مۆنی بەد (خال.ف.٣٣٥): [کنایه از اخمو و ترشرو].

**ناو چاوان پاك:** برێتی لە پیاوچاکی لە خواترس: کنایه شخص پارسا و پرهیزگار. (مەزبر.٨٦٠)

**ناو چاوی بۆران ئەکا:** برێتی لە یەکێکی تووڕە: کنایه از آدم عصبانی.

**ناو کوێر بوونەوە:** برێتی لە مردن و نەمانی ناو و نیشانی یەکێك (خال.ف.٣٣٦): [کنایه از مردن و نماندن اسم و رسم کسی].

**ناوچاوان قوفز:** برێتی لە کلۆڵ و چارەڕەش: کنایه از بدبخت. (مەزبر.٨٦)

**ناوچاوتاڵە:** خوێن‌تاڵە ئێسکی قورسە: کنایه از آدم اخمو و عبوس.

**ناوچەوان بەیەکا دان:** برێتی لە تووڕەبوون (خال.ف.٣٣٥): [کنایه از اخم کردن و عصبانی شدن].

**ناوچەوان قەشقە (ناو چاو قەشقە):** برێتی لە یەکێکی بەدبەخت و چارەڕەش (جلال محمود. بەرگی٢. ١٤٥)؛ [کنایه از آدم بدبخت].

**ناوك گرتنەوە:** ١) برێتی لە ئازار دانی زۆر ٢) برێتی لە گران فرۆشتنی شتێك بە یەکێك: ١) کنایه از رنج و آزار زیاد ٢) کنایه از گران فروختن چیزی به کسی. (مەزبر.٨٦١)

**ناونانی دەیگە خەرج:** برێتی لە یەکێکی ماستاوکەر (جلال محمود. بەرگی٢. ١٤٥)؛ [کنایه از آدم متملق و چاپلوس].

**ناونووس:** برێتی لە دیاری کردن و دابین کردنی شتێك (خال.ف.٣٣٧): [کنایه از مشخص کردن چیزی].

**ناوی کەوتووەسەر زوانگەل:** ١) [سوك و ڕسوای ناو کومەڵ بووە] ٢) [ناوبانگی دەرکردووە]: ١) کنایه از رسوا و بدنام شدن در میان مردم ٢) کنایه از مشهور شدن. (حیرت.٥٠١)

**ناوێرێت بلێ لەل:** واتە بە ڕادەیەك دەترسێت کە دەمی پێ هەڵ نایەتەوە، ناوێرێ بەرەنگاری ببێت (جلال محمود. بەرگی٢. ١٤٦): [کنایه از به اندازه‌ای می‌ترسد که نمی‌تواند چیـزی بگوید و جرئت نمی‌کند با او مقابله کند].

**ناوێرێت لە کراسەکەی خۆیدا (لە پێستی خۆیدا) بجووڵێتەوە:** واتە کەمەندکێشیان کردووە ترساندوویانە، هەڕەشەیان لێکردووە، دەترسێت شتێکی لێ بقەومێت تووشی گاشەیەك ببێت: کنایه از جذبش کرده‌اند و ترساندنش و تهدیداش کرده‌اند و می‌ترسد دچار حادثه‌ای ناگوار شود.

**ناهێڵم بۆنی پێوە بکات:** ناهێڵم بۆ ئەو بێت (جلال محمود. بەرگی٢. ١٤٦): [کنایه از نمی‌گذارم به او تعلق گیرد].

**نایە قۆڵی مشتی:** واتە ڕەپ و ڕاست پێی گەیاند، دای

بە گوێیدا (جلال محمود. بەرگی۲. ۱٤٦): [کنایە از رک و صریح بە او گفت].

**نایەڵێت هەناسە بدات:** تەنگی پێ‌هەڵچنیوە، شپرزەی کردووە بواری هیچی نادات (جلال محمود. بەرگی۲. ۱٤٦): [کنایە از او را در تنگنا گذاشتە، پریشان‌حالش کردە. هیچ فرصتی بە او نمی‌دهد].

**نایرێتی بە ڕووی خۆیا:** برێتی لە زانین تێگەیین لە شتێك بەڵام وا نیشان بدەی کە تێنەگیشتووی و لێ نازانی: کنایە از دانستن چیزی و وانمود کردن بە ندانستن.

**نزیکی:** برێتی لە ئیلاقە: کنایە از جماع. (مەزەر.۸۹٤)

**نسك و ناهمێ:** [برێتی لە یەکێکی دەستەنگ و ڕەشوڕووت]: کنایە از آدم بیچارە و ناامید، لات و آسمان جل. (حیرت.۵۰۱)

**نقی برپیا:** [واتە: بێدەنگ بوو]: کنایە از آرام و ساکت شد. (حیرت.۵۰۲)

**نقی چنیا:** [واتە: بێدەنگ بوو]: کنایە از صدایش قطع شد و ساکت ماند. (حیرت.۵۰۲)

**نمەك خواردن:** برێتی لە خواردنی نانی کەسێك: کنایە از خوردن نان کسی. (مەزەر.۸٦۹)

**نمك کردن:** برێتی لە خواردنی نانی یەکێك و لە بەرچاوبوونی چاکەو پیاوەتی (خال.ف.۳٤۳): [کنایە از نان و نمک کسی را خوردن و خوبی کسی را پیش چشم داشتن].

**نۆبە دلانە:** [واتە بە زۆرە ملێ کارێ کردن]: کنایە از کاری را بە اجبار و اکراه و بی‌میلی انجام دادن. (حیرت.۵۰۲)

**نوخوونبوونەوە:** برێتی لە لەناوچوونی دارایی و سامان: از دست دادن مال و ثروت. (مەزەر.۸۷۲)

**نوقمبوون:** برێتی لە بێ‌سەروشوێن بوون: کنایە از فنا شدن و نابود شدن. (مەزەر.۸۷٤)

**نۆکەر خۆمم و ئاغەی خۆم:** [برێتی لە کەسێکی سەڵت و ڕەبەن کە کاروباری خۆی بەرێوە بات]: کنایە از آدم مجرد کە خودش کارهای خویش را روبراە می‌کند. (حیرت.۵۰۲)

**نۆ بکە بە سێ:** واتە نۆ مانگی هەوا خۆشی ساڵ هەوڵ بدە بۆ سێ مانگەی زستان (خال.٤٥١): [کنایە از نە ماە خوش سال تلاش کن برای سە ماە زمستان].

**نۆ گوێر زاییگە و ئەیژێ کەنیشکم:** [برێتی لە ژنێکی تەرپۆش و هەوەس‌باز کە حەز لە ڕابواردن دەکات]: کنایە از زن خوش پوش و خوش گذران و هوسباز. (حیرت.۵۰۲)

**نۆکیسەیە:** تازە کیسەیە ۱) بۆ تەشەرە برێتی لە یەکێك کە تازە دەستی بە کاسبی کردبێت: ۱) [برای طعنە است بە کسی گفتە می‌شود کە تازە شروع بە داد و ستد یا معاملە کردە باشد] ۲) برێتی لە یەکێك کە تازە دەوڵەمەند بوویێتەوە و پارەپەرەست بێ (جلال محمود. بەرگی۲. ۱٤۷)؛ ۲) [کنایە از تازە ثروتمندی کە پول‌پرست باشد].

**نوورونێو چاوان پاك:** برێتی لە پیاوی خوا: کنایە از مرد خدایی. (مەزەر.۸۷۲)

**نە گەردی قورگە و نە پەیخامی سك:** [برێتی لە خوارەدەمەنیەکی زۆر کەم، نەختێك]: کنایە از غذا یا هر چیز خوردنی بسیار کم. (حیرت.۵۰۷)

**نە گوڵ گەنمی دیوە و نە چەقچەقەی ئاسیاو:** [بۆ تانەوتەشەرە، برێتی لە یەکێکی نەزان]: کنایە از آدم نادان. (حیرت.۵۰۷)

**نەبان:** برێتی لە کەسێ کە دەنگی لە یەکێ گۆڕیوە

(کاکم لێمان نەبانە نامان دوێنێ): بیگانگی کردن آشنا. (معزی.877)

**نەبڕ:** برێتی لە مەردومێ کەمبڕشت و سست (خال.ف.350): [کنایە از آدم سست کار].

**نەتاشراو:** برێتی لە بنیادەمی کەم فام و پەروەردە نەکراو: کنایە از آدم نافرهیختە و کم‌فهم. (معزی.878)

**نەتاشراوە:** برێتی لە بنیادەمی کەم فام و پەروەردە نەکراو (جلال محمود. بەرگی 2. 146): [کنایە از آدم نفهم و بی‌تربیت].

**نە پخاندن:** برێتی لە تاریفکردنی بە درۆ: کنایە از مدح دروغین گفتن. (معزی.878)

**نە پشت نە زك:** برێتی لە ناڕاست و درۆ: کنایە از دورو و منافق. (معزی.878)

**نەجات بە:** [واتە: تەواوی بکە]: کنایە از بس کن، خاتمە بدە. (حیرت.505)

**نەخۆر:** برێتی لە رژد و لەچەر، (ماڵ نەخۆر هین بخور): کنایە از خسیس. (معزی.880)

**نەژنەوا:** برێتی لە مەردومی بێ‌گوێ (خال.ف.355): [کنایە از آدم حرف نشنو].

**نەرم هەژاندن:** برێتی لە رازیکردن و هێنانەرێ بە پێهەڵگوتن: کنایە از راضی کردن بە وسیلە مدح و ثنا گفتن. (معزی.882)

**نەرمبوون:** 1) برێتی لە مەردومی لەسەرخۆ و هێدی: 1) [کنایە از آدم آرام و شکیبا]، 2) رازیبوون، تەسلیمبوون (خال.ف.353): 2) [کنایە از راضی شدن و تسلیم گشتن].

**نەرمەبڕ:** [بە یەکێکی ئاوژێرکا و ئاژاوەگێڕ دەڵێن]: کنایە از آدم نیرنگ‌باز و گربز. (حیرت.506)

**نەرمەبڕ:** برێتی لە مەردومی زمان لووسی فێڵباز (خال.ف.354): [کنایە از آدم چرب زبان و مکار].

**نەرمونیان:** برێتی لە بنیادەمی بەسەبر و حەوسەڵە، نیان و هێمن و دوور لە توورەیی: کنایە از آدم با صبر و حوصلە.

**نەرنایش:** برێتی لە ژنی زەبەلاحی ناقولا: کنایە از لندهور. (معزی.882)

**نەشارەزا و چەواشەکار:** کنایە از کسی کە کارش را پس و پیش انجام می‌دهد، کار را برعکس انجام دهد.

**نەفەسی خستگە دوا:** [برێتی لە پیرە پیاوێك کە زۆر بکۆکێ کەوێتە هەناسەبڕکێ]: کنایە از پیری کە زیاد سرفە کند و راه نفسش بند آید. (حیرت.507)

**نەفەسی لە جێگەی گەرمەوە دەرتێ:** کنایە از دل خوش و خیال راحت داشتن و از مشکلات کار یا مشکلات زندگی دیگران بی‌خبر بودن.

**نەمامکردن:** برێتی لە لای دیوار خستن و کوشتنی (خان کاورایەکی نەمام کرد): کنایە از محکوم را لای دیوار گذاشتن. (معزی.886)

**نەمر:** برێتی لە خوا (خال.ف.357): [کنایە از خداوند].

**نەمرونەژی:** برێتی لە ژیانی دژوار: کنایە از زندگی دشوار. (معزی.887)

**نەوکیسە:** برێتی لە کەسێك کە تازە دەوڵەمەند بووبێ (خال.ف.367): [کنایە از کسی کە تازە ثروتمند شدە باشد].

**نەها نەیژێ نەنە:** برێتی لە هیچ نەوتن: کنایە از هیچ نگفتن.

**نهاندن:** برێتی لە ئیلاقە کردن: کنایە از مجامعت. (معزی.877)

**نهشتی:** برێتی لە سەنگین و گران: کنایە از آدم باوقار. (معزی.884)

**نیان شۆن کەسێك:** برێتی لە بەپەلبوونی کەسێك

وەکوو نیاگیانە شۆتتەو: کنایە از تعجیل.

**نیایە هەرگ (قوڕ)**: بریتی لە یەکێك کلۆل و چارەڕەش کردن: کنایە از کسی را بدبخت و سیەروز کردن.

**نیایەتاقەو**: [بریتی لە وازهێنان لە شتێك]: کنایە از رها کردن موضوعی. (حیرت.٥٠٩)

**نێرە بێ کێرمیە**: بریتی لە ئافرەتێك، کچێك کە جەربەزەی بێت و بە سەر ئەم و ئەودا بخورێت و باکی لە کەس نەبێت (جلال محمود. بەرگی٢. ١٤٧): [کنایە از زنی یا دختری شجاع کە آمرانە رفتار کند و ترسی از کسی نداشتە باشد].

**نێرە**: بریتی لە بنیادەمی ئازاو بەکار: کنایە از آدم شجاع و کارا. (مەژار.٨٩٣)

**نێرەکەری**: بریتی لە زۆرداری کردن (خال.ف.٣٦١): [کنایە از ستمگری].

**نێرەی بێ (...)**: [بریتی لە ژنێك کە ئاکار و کردەوەی پیاوانەی بێت]: کنایە از زن مرد صفت. (حیرت.٥١٠)

**نێری وردەمالان**: [بریتی لە لاوێك کە خەریکی حەزلێکەری بیت]: کنایە از جوانی کە مشغول عشقبازی باشد. (فتاحی قاضی.٢٠٩)

**نیشتکە ژێر پای**: بریتی لە هاندانی کەسێك بۆ کارێ: کنایە از تحریک کردن کسی بە انجام کاری.

**نیشتن**: بریتی لە ڕیان: کنایە از ریدن. (مەژار.٨٩٥)

**نیشتنگا**: بریتی لە ئاودەست، مەبال: کنایە از مستراح. (مەژار.٨٩٥)

**نیشتووە ژێرپای**: [بریتی لە خەڵەتاندنی کەسێك بە قسە و بڕیاری درۆ]: کنایە از این کە او را بە گفتار و وعدەهای دروغین فریب داد. (حیرت.٥١٠)

**نیڤەمێر**: بریتی لە لاوێ کە هێشتا ژنی نەهێناوە: کنایە از جوان مجرّد. (مەژار.٨٩٤)

**نێکەرد نێومرد**: بریتی لە بێ لایەن: کنایە از بی‌طرف. (مەژار.٨٩٦)

**نێنۆکی نییە سەری خۆی پێ بخورێنێت**: ١) بریتی لە یەکێك کە دەسەڵات و توانای هیچێکی نەبێت: ١) [کنایە از کسی کە قدرت و توانایی هیچ کاری را نداشتە باشد]. ٢) بریتی لە نەدار و هەژار (جلال محمود. بەرگی٢. ١٤٧): ٢) [کنایە از آدم فقیر و تنگدست].

**نیوە عەمر بووە**: ١) زۆر ترسا: ١) [کنایە از بسیار ترسید] ٢) زور ماندوو و شەکەت بوو (جلال محمود. بەرگی٢. ١٤٧): ٢) [کنایە از بسیار خستە شدە].

**نێوی خۆم دەگۆڕم**: [بریتی لە قەد سەرناگرێ، بۆ وێنە: ئەگەر هات نێوی خۆم ئەگورم]: کنایە از فلان کار جزو محالات است. (فتاحی قاضی.٢٠٩)

**نییە لە بان شاخ گاوە**: واتە خۆ هێندە گران نییە، یان خۆ بە کۆڵی شێرەوە نییە (جلال محمود. بەرگی٢. ٦١): [کنایە از این کە اینقدر مهم و دست‌نیافتنی نیست].

# و

**وا نەدراوە پینە بکرێت (وا نەڕژاوە نەبژێت)**: بە هەڵەیەك دەوترێت ئەوەندە زل بێت ڕێگە چارەسەری بۆ نەبێت (جلال محمود. بەرگی۱. ٤٧٢): کنایه از اشتباهی که آنقدر بزرگ است نمی‌شود آنرا درست و مرمت کرد.

**واجبون کورتان**: بریتی لە مرۆڤی نەزان و گێل: کنایه از آدم نفهم. (فتاحی قاضی)

**وادیارە پیتا پەریگە**: واتە: ۱) [وادیارە شێت بووگی] ۲) [بە منداڵی هاروهاج دەڵێن]: ۱) کنایه از این که به خلی و دیوانگی دچار شده‌ای ۲) کنایه از بچه‌ی شلوغ. (حیرت.۵۱۲)

**وارڕاکردن**: بریتی لە زار و زیچی زۆر خستنەوە: کنایه از بسیار زاد و ولد کردن. (مەژبر.۹۰۳)

**وارکۆر**: بریتی لە بێ ئەولاد، وەجاخ کوێر: کنایه از اجاق کور و بی‌فرزند. (مەژبر.۹۰۳)

**وارووێخی دەرهێنا**: دوو وشەی تورکین: واتە هەر چییەکی هەبوو بۆی فەوتاند و هەژاری خست (جلال محمود. بەرگی۱. ٤٧٢): [کنایه از هر چه داشت از دست داد و از میان برد و او را به فقر و تنگدستی انداخت].

**واقەکەر**: بریتی لە ماڵاتی ماڵی: (واقەکەر لە ماڵما نییە): کنایه از احشام. (مەژبر.۹۰۵)

**والاڕنی کرد**: بە کاڵی خواردی (جلال محمود. بەرگی۱. ٤٧٢): [کنایه از به خامی خوردن].

**وای (بای) باقە (باقە) شێون**: بریتی لە یەکێکی گێرەشێوێن و ئاژاوەگێڕ (جلال محمود. بەرگی۲. ١٤٨): [کنایه از شخص آشوبگر].

**وجاخ ڕوونە یان وجاخ ڕۆشنە**: ۱) بریتی لە منداڵی هەیە، بە تایبەتی نێرینە: ۱) [کنایه از فرزند داشتن به خصوص پسر] ۲) منداڵەکەی جێی ئومێدە: ۲) [کنایه از آینده‌ی فرزندانش خوب و امیدوار کننده است] ۳) یان وەجاخ شوێن ئاگرە واتە و بۆ پیاوی بەخشندە بەکار دێت (جلال محمود. بەرگی۱. ٤٧٢)؛ ۳) [کنایه از شخص بخشنده و سخاوتمند].

**ورد**: بریتی لە مەردومی زیرەك (خال.ف.٣٧٣): [کنایه از آدم زرنگ].

**وردبوون**: بریتی لە ژیر و بەنەزم: (پیاوێکی وردە لە کاری خۆدا): کنایه از آدم منظم و باهوش. (مەژبر.۹۰۸)

**وردبین**: بریتی لە کەسێك کە لە هەر کارێکا ورد و زیرەك بێ (خال.ف.٣٧٣): [کنایه از کسی که در هر کاری هوشیار و نازکبین و بادقت باشد].

**وردە ئاهەنگ لێدان**: بریتی لە تڕ: کنایه از گوز یا باد مقعد. (مەژبر.۹۰۹)

**وردە با دەرکردن**: بریتی لە تڕ و تس: باد مقعد. (مەژبر.۹۰۹)

**وردە**: بریتی لە بزن و مەڕ (وردەم چەن سەرێك هەیە): کنایه از بز و گوسفند. (مەژبر.۹۰۹)

**وردەفرۆش**: بریتی لە دوکانداری فەقیر: کنایه از کاسب کم‌سرمایه خرده‌پا. (مەژبر.۹۰۹)

**وردەواڵەفرۆش**: بریتی لە دووکاندارێك کە شتی کەم بەها بفرۆشێت: کنایه از خنزرپنزری. (مەژبر.۹۰۹)

**وردی**: بریتی لە زیرەکی و تێبینی (خال.ف.٣٧٤): [کنایه از زیرکی].

**ورچەکەی ئەوێهەنگ** (ئەمومن.٦٠): [بریتی لە یەکێکی چاخ و پێیەوبووگ: کنایه از شخص چاق و تنومند].

**ورگدڕاو**: بریتی لە زۆرخۆر: کنایه از آدم پرخور. (مەژبر.۹۱۰)

**ورگهاتن:** بریتی لە ژنی زگپڕ (خالَ.ف.۳۷۵): [کنایە از زن حاملە].

**ورگی بە کۆڵیدا یان بە شانیدا داوە:** بریتی لە کەسێکی فرەخۆر (جلال محمود. بەرگی۱. ٤٨١): [کنایە از شخص شکم پرست کە دنبال خوردن باشد].

**ورگی سەرناوە:** بریتی لە کەسێك کە لە سەر خوانێك دانیشتبێت، تێرخواردنی نەبێت، تا خواردنەکە تەواو نەبێت دەست هەڵنەگرێت (جلال محمود. بەرگی۱. ٤٨١): [کنایە از پرخور، تا آخر سرسفرە می‌نشیند و می‌خورد].

**ورك ئەکا:** [بریتی لە منداڵێك کە زۆر بگیرێ و پەڵپ و بیانگ بگرێ]: کنایە از بچەای بسیار گریان و بهانەگیر. (حیرت.۵۱۷)

**ورکن:** بریتی لە خواردنی شتێك بە زۆری (خالَ.ف.۳۷۵): [کنایە از خوردن چیزی بە اجبار].

**وروڕە:** بریتی لە ژنی چەنەبازی فێڵاوی: کنایە از زن مکار و وراج. (مەژار.۹۱۰)

**وروڕەی جادوو:** بریتی لە پیرەژنی بەفوتوفێڵ: کنایە از پیرزن مکار. (مەژار.۹۱۰)

**ورێنەی نەخۆشە:** بە کەسێك دەوترێت داوای شتێك بکات نەیدەنێ، قسەیەك بکات بۆی نەشێت. واتە قسەکەت وەرناگیرێت و بیبڕەوە (جلال محمود. بەرگی۱. ٤٨١): [کنایە از کسی کە چیزی بخواهد و بە او ندهند و حرفی بزند و بە آن بی‌اعتماد باشند: یعنی خواستەات مورد قبول واقع نمی‌شود دیگر تمامش کن و حرف نزن].

**وشتر بە بارەوە قووتدان:** [بریتی لە دزی گەورە، دزەڕۆژە]: کنایە از دزد روز، کنایە از دزد بزرگ. (فتاحی قاضی. بەرگی۱. ٤٣٥)

**وشتر بە کونی شووژنێدا ئەچێ:** [بریتی لە شتێك یان کارێکی نەگونجاو]: کنایە از چیزی یا کاری دشوار و محال. (فتاحی قاضی. بەرگی۱. ٤٣٤)

**وشتر قونگی دەدڕا، بەڵمیان دەزاریدا خنی:** [چارەسەری نادروست و پرپێچەوانە بۆ کارێك]: کنایە از اعمال راەحل غلط و انحرافی. (فتاحی قاضی. بەرگی۱. ٤٣٥)

**وشتر و ئەلاقەبەندی:** [بریتی لە دوو شت کە پەیوەندی و هاوڕێییان بەیەکەوە نەبێ]: کنایە از دو چیز نامربوط و نامتناسب. (فتاحی قاضی. بەرگی۱. ٤٣٥)

**وشك و تەڕی تێدا سووتا:** بریتی لە گوناهبار و بێ گوناه پێکەوە گرفتار بوون، بێ جیاوازی و لێککردنەوە تێیاچوون (جلال محمود. بەرگی۱. ٤٨١): [کنایە از گناهکار و بی‌گناه با هم گرفتار شدند].

**وشکە سۆفییە:** بە تەوسەوە بە یەکێك ئەڵێن کە دووری لە خەڵك و کۆڕ بکات و حەز بە تێکەڵاوی و ڕابواردن نەکات: وەك سۆفی گۆشەگیرە (جلال محمود. بەرگی۱. ٤٨١): [برای طعنە است کنایە از کسی کە میل معاشرت با دیگران و با مردم بودن را نداشتە باشد یعنی مثل صوفی گوشەگیر و تنها باشد].

**وشکە سەما:** بریتی لە کەسێك بە درۆوە خۆی خۆشحاڵ پیشان بدات: کنایە از کسی کە تظاهر بە شادی و خوشحالی می‌کند و بە دروغ اظهار شادی کند

**وشکە مزە کار دەکات:** بێ خواردن و خواردنەوە و مووچە کار دەکات (جلال محمود. بەرگی۱. ٤٨٢): [کنایە از مفت کار کردن].

**وشکە، مرۆڤێکی وشکە (وشکە پیاوە):** بە کەسێك دەڵێن کە لەگەڵ خەڵکدا دۆستایەتی نەنوێنێت ناسك نەبێت، ڕووی خۆش بە کەس نەدات (جلال محمود. بەرگی۱. ٤٨١): [کنایە از کسی کە با مردم رفتار دوستانە نداشتە

باشد].

**وشکەجاو نەکا:** [برێتی لە یەکێك کە لە کات و ژەمی دیاریکراودا نان نەخوات]: کنایە از کسی کە خارج از وعدەهای مشخص (صبحانە، نهار، شام) غذا بخورد. (حیرت.٥١٨)

**وشکەڕۆبوون:** برێتی لە یەکێك کە لە تینواندا وشك بۆتەوە و تەڕایی لە لەشیدا نەماوە (جلال محمود. بەرگی١. ٤٨١): [کنایە از کسی کە از تشنگی لاغر شدە و آب بدنش خشك شدە باشد].

**وشکەوبووگ:** [برێتی لە یەکێکی لەڕولاواز]: کنایە از آدم لاغر و تکیدە. (حیرت.٥١٨)

**وشکەیی دەکات:** بۆ سووکییە بە یەکێك دەوترێت کە ڕووبامایی و ڕیایی بکات (جلال محمود. بەرگی١. ٤٨٢): [برای تحقیر است و کنایە از کسی کە چاپلوسی می کند].

**وشکەیی:** برێتی لە ڕووبینی و کلکەسووتە: کنایە از تملق. (معزیر.٩١٤)

**وڵات:** برێتی لە دەوروبەرو دارودیوار (هەموو وڵاتی پیس کرد، بە سەر وڵاتی دا مەڕێژە): کنایە از دور و بر، اطراف. (معزیر.٩١٤)

**وڵکەی بان دڵکە:** [برێتی لە منداڵێك کە هەمیشە لە ئامێز و لە سەر ڕانی دایك یان باوکیەوە بێ]: کنایە از بچەی ننُر کە دائم در بغل یا روی زانوی پدر یا مادر باشد. (حیرت.٥١٨)

**وڵیە فەتی:** برێتی لە مێرد، بەرانبەر بە ژن: (بە چڕو دەچیە وەلای وڵیە فەتی): کنایە از همسر زن، شوهر. (معزیر.٩١٥)

**وە بەر ئالای پێغەمبەر کەوتن:** [کەوتنە بەر ڕەحمەتی خودا]: کنایە از مشمول عفو و رحمت خدا بشوید، دعاست. (فتاحی قاضی. بەرگی١. ٤٣٦)

**وە بن کەوتن:** برێتی لە زیان: (لەو سەودایەدا وە بن کەوتم): کنایە از زیان دیدن. (معزیر.٩١٦)

**وە ڕفتن:** برێتی لە نابووت بوون: کنایە از نابود شدن. (معزیر.٩٢٠)

**وە زووین ناکەوێ:** برێتی لە کاڵا و شتومەکێ کە لە سەردەستەوە بڕوا و بە فرۆش بگەیێ: کنایە از کالایی کە زود بە فروش برسد.

**وەتەنی:** برێتی لە پارچەی هەرزان قیمەت: کنایە از پارچەی ارزان. (معزیر.٩١٧)

**وەجاخ زادە:** برێتی لە سەید و ئەولادی پێغەمبەر: کنایە از سیّد. (معزیر.٩١٧)

**وەجاخ کوێرە:** ١) جاران بە یەکێك دەوترا کە منداڵی نێرینەی نەبوایە یان کوڕەکانی خوێڕی و بێکار بوونایە ٢) بە یەکێك دەڵێن کە هەر هیچ منداڵی نەبێت، نە کوڕ و نە کچ (جلال محمود. بەرگی١. ٤٧٣): ١) [کنایە از کسی کە فرزند پسر ندارد یا فرزندان لاابال و بیکارە باشند] ٢) [کنایە از کسی کە هیچ فرزندی نداشتە باشد اعم از پسر یا دختر].

**وەجاخ:** برێتی لە منالّی نێرینەی مرۆڤ (خال.ف.١٣٨١): [کنایە از فرزند پسر].

**وەحەی لێ بکەیت دەچێتە گاگەل:** واتە زۆر کەودەن و بێ لێکدانەوەیە (جلال محمود. بەرگی١. ٤٧٣): [کنایە از آدم نادان و بی آورد].

**وەختە بترەکێت:** ١) شادمانی زۆر: ١) کنایە از شادمانی زیاد ٢) قین و رقی زۆر: ٢) کنایە از خشم و کینەی زیاد.

**وەختە پەڕ دەرکات (دەرکات):** لە خۆشیدا وەختە باڵ بگرێتەوە (جلال محمود. بەرگی٢. ١٤٨): [کنایە از کسی کە بسیار خوشحال باشد].

**وەختە دڵم دەربێ بۆی:** [برێتی لە ئۆقرە و ئارام نەگرتن

لە دووری یەکێك یا شتێك]: کنایە از بی‌تابی زیاد درد دوری از کسی یا چیزی. (حیرت.٥١٩)

**وەختە زیرە بکەم:** [برێتی لە ئێشی زۆریان سەرمای سەخت]: کنایە از داشتن درد شدید و سرمای زیاد. (حیرت.٥١٩)

**وەختە گیانم دەرچێ:** [برێتی لە ئێش و ئازاری زۆر]: کنایە از داشتن درد شدید. (حیرت.٥١٩)

**وەختە فنگی بۆی دەربێت:** بۆ گەمە و خۆشی برێتی لە یەکێك کە حەز لە هەر کەسێك، یان هەر شتێك بکات (جلال محمود. بەرگی۲. ١٤٨)؛ [از روی شوخی و مزاح و کنایە از کسی کە فرد دیگر یا چیزی را زیاد دوست داشته باشد یا آرزو بکند].

**وەرمق هەڵگەڕاوەتەوە:** واتە نەهامەتییەتی، باری کەوتووە (جلال محمود. بەرگی۱. ٤٧٤)؛ [کنایە از کسی کە بدشانسی بە او رو کردە باشد].

**وەرد:** برێتی لە دووپاتکردنەوە: کنایە از تکرار کردن. (مەژار.٩١٩)

**وەردایش:** برێتی لە بەرتیلخواردن: رشوە خوردن. (مەژار.٩١٩)

**وەرزی خۆی دەشکێنێت:** برێتی لە یەکێك لە دڵی خۆی خۆش دەکات (جلال محمود. بەرگی۱. ٤٧٣)؛ [کنایە از کسی کە دل خویش را راضی نگە می‌دارد].

**وەرڤاندن:** برێتی لە دارایی بەهەدەردان: کنایە از هدر دادن مال. (مەژار.٩٢٠)

**وەرڤین:** برێتی لە نابووتبوون: کنایە از نابود شدن. (مەژار.٩٢٠)

**وەزندار:** برێتی لە مرۆڤی ماقووڵ و بەوەج: کنایە از شخص محترم و متشخص. (مەژار.٩٢٢)

**وەشاردن:** برێتی لە ڕاکردن لە ترسانا (خاڵ.ف.٣٧٧)؛ [کنایە از فرار کردن از روی ترس].

**وەگۆن:** برێتی کە مرۆڤێ کە هێشتا بە هێز و توانایە: کنایە از آدمی کە هنوز نیرومند و تواناست.

**وەك ئاو بخوانەوە:** ١) برێتی لە یەکێك کە زۆر بە ئاسانی کارەکانی ڕاپەڕێنێ. ٢) واتە بە تەنگەوە نەهات (جلال محمود. بەرگی۱. ٤٧٤): ١) [کنایە از کسی کە کارش بە آسانی حل کند]. ٢) [کنایە از این کە دچار مشکل نشد].

**وەل (لەگەڵ) سای خوەیا جەنگ دەکات:** برێتی لە یەکێکی زۆر تووڕە (جلال محمود. بەرگی۲. ١٥٥)؛ [کنایە از آدمی کە بسیار زود عصبانی می‌شود].

**وەللووززنا:** برێتی لە یەکێکی زۆر فێڵبەباز: کنایە از شخص بسیار نیرنگ‌باز.

**وەلی وەلی دەناسێت:** واتە هەموو کەسێك هاوبیری خۆی دەناسێت (جلال محمود. بەرگی۱. ٤٨٠)؛ [کنایە از هر کسی همفکران خود را خوب می‌شناسد].

**وەیشوومە:** برێتی لە سەرمای سەخت و تەڕ و تووشی زستان: سرما و کولاك سخت زمستان. (مەژار.٩٢٩)

**وێران:** برێتی لە حاڵپەرێشانی، بێئاوەز: (وێرانە هەر باسی مەکەن): کنایە از پریشان حالی، بی‌عقل. (مەژار.٩٣٠)

ھ

**ها بە دەمیەوە:** [نزیکە کارەساتێك بقەومێنی]: کنایە از نزدیک است مصیبتی یا حادثەای بە وجود آورد. (حیرت.٥٥٨)

**ها بە ناو چاویەوە:** [واتە: لە چاوانیا دەبینم کارێکی خراپ و نالەباری لێ دەبێتەوە]: کنایە از این کە در چشمانش می‌بینم کە فلان کار بد را انجام خواهد داد. (حیرت.٥٥٨)

**ها لە بان تەڵەو:** [برێتی لە یەکێك کە لە قۆناغێکی پڕ لە مەترسیدایە]: کنایە از کسی کە در مرحلەی خطرناکی قرار دارد. (حیرت.٥٦٠)

**ها لە بان تەڵەوە:** برێتی لە یەکێك کە ساویلکانە کەوتبێتە داوی کەسێکی فێڵبازەوە و تووش بووبێت (جلال محمود. بەرگی١. ٤٨٣): [کنایە از آدم سادەای کە در دام فردی نیرنگ‌باز افتادە باشد].

**ها لە بان کای ئاگر تێبەردراوەوە:** برێتی لە کەسێك کە مەترسی گەمارۆی دابێت و ژیان و مانی لە مەترسیدا بێت (جلال محمود. بەرگی١. ٤٨٣): [کنایە از کسی کە ترس محاصرەاش کردە باشد و زندگیش در خطر افتادە باشد].

**ها لە ژێر سەریا:** پیلانێکی بە دەستەوەیە: توطئەای زیر سر اوست.

**ها لە سەرگوان:** برێتی لە گیانلەبەرێك کە نزیك زایینی بێ: کنایە از حیوانی کە نزدیک بە زاییدن باشد.

**ها لە ناو خۆیا:** [برێتی لە یەکێك کە لە نێو خەیالی خۆیدا نوقمە و بیر دەکاتەوە]: کنایە از کسی کە غرق خیال و تفکر است. (حیرت.٥٦٠)

**هابەخۆیەو:** [برێتی لە یەکێکی پێبەوبووگ و قەڵەو]: کنایە از آدم با بنیە و چاق. (حیرت.٥٥٨)

**هاتە دەسی:** واتە تێگەیی و زانی کە کێ خراپە و کێ باشە: کنایە از فهمید و پی برد کە چە کسی خوب و چە کسی بد است.

**هاتە سەر ڕا (هاتە سەر ڕێگە):** ١) ملی شۆڕ کرد، ملی دا: ١) [کنایە از تسلیم شد] ٢) قەبووڵی کرد: ٢) [راضی شد] ٣) سەلماندی و بڕوای کرد و ڕێك کەوت (جلال محمود. بەرگی٢. ١٥٧): ٣) [قبولش کرد].

**هاتەوە سەر خەت:** [برێتی لە یەکێك کە بێتە سەر ڕێی ڕاست]: کنایە از کسی کە از راە کج دست برداشتە و بە راە راست قدم نهادە است. (فتاحی قاضی. بەرگی١. ٤٦٠)

**هاتەوە سەر ڕا:** پەشیمان بووەوە، ڕێگای ڕاستی گرتەبەر، و وازی هێنا (جلال محمود. بەرگی١. ٤٨٣): [کنایە از پشیمان شد، برگشت، راە درست را در پیش گرفت و دست کشید].

**هاتنە بەر بار:** برێتی لە هاتنە سەر ڕێگە و سەرنەرمبوونی یەکێك بۆ کارێك (خاڵ.ف.٣٩٠): [کنایە از رام شدن و سرتعظیم فرود آوردن برای انجام کاری].

**هاتنە خوار:** برێتی لە هاتنە بەر بار و ئەهوەن بوونەوە: کنایە از دست از لجبازی برداشتن. (مەژار.٩٣٦)

**هاتنە سەر بەڕێ:** خوازبێنی کردن، هاتنە خوازبێنی (نانەوزادە.٤١٤): [کنایە از خواستگاری کردن از کسی].

**هاتنە سەر چۆك:** برێتی لە بەزین و تەسلیم بوون: کنایە از بە زانو درآمدن و تسلیم شدن. (مەژار.٩٣٦)

**هاتنە لا:** برێتی لە مردن: کنایە از مردن. (مەژار.٩٣٦)

**هاتووە بە خۆیا:** قەڵەو بووە: کنایە از چاق شدە.

**هاتووە شیر بۆی:** برێتی لە یەکێك کە بۆ یەکێکیتر کەڵکی ببێ و ڕازی بێ بۆی: کنایە از کسی کە برای دیگری سود داشتە باشد.

**هاتوونە سەر بەڕەی:** ١) [بۆ خوازبێنی کچەکەی هاتوونەتە ماڵەکەی]. ٢) [بۆ ئاشتبوونەوە، لێخۆشبوون و تکایەکی گەورە هاتوونەتە ماڵەکەی، پەنایان بۆ هێناوە]: ١) کنایە از برای خواستگاری بە خانەاش آمدەاند ٢) کنایە از برای صلح و آشتی و یک خواهش بزرگ بە خانەاش آمدەاند، بە او پناه آوردەاند. (فتاحی قاضي. بەرگی١. ٤٦٠)

**هاربوون:** ١) برێتی لە یەکێکی ئوقرەنەگر. ٢) برێتی لە پیاوی بەدفەڕ و بەئازار. ٣) برێتی لە مرۆڤی زیرەك و وریا: ١) کنایە از شخص ناآرام ٢) کنایە از شخص مردم آزار ٣) کنایە از آدم هوشیار و زیرک. (مەژار.٩٣٨)

**هاڕەی لە بڕەی ناکاتەوە:** ١) [برێتی لە یەکێك کە چاك و خراپ و خزم و بێگانە لە یەك ناکاتەوە]. ٢) [ناشارەزایە لەو شتە لەو باس هیچ نازانێت]: ١) کنایە از آدم ناآگاه کە خوب را از بد تشخیص نمی‌دهد. ٢) کنایە از اینکە ناوارد است و از آن چیز یا بحث چیزی نمی‌داند. (فتاحی قاضي. بەرگی١. ٤٦٠)

**هاشوهووش (هارتوهوورت):** ١) خۆهەڵکێشان و فشە و درۆی زل کردن: ١) [کنایە از خودستایی و دروغ گفتن] دەڵێن کەوتۆتە هاشەوهووشە: ٢) واتە کەوتۆتە درۆودەلەسەی قەبەی بێ جێ (جلال محمود. بەرگی١. ٤٨٥): ٢) [کنایە از دورغ بزرگ و بی‌جا و بی‌ربط].

**هاڤینا میرشەرەف:** برێتی لە مانگی ڕەزبەر: کنایە از مهر ماه. (مەژار.٩٤٠)

**هام پیاڵە:** برێتی لە دۆستی گیانی: کنایە از دوست صمیمی. (مەژار.٩٤١)

**هامسەر:** برێتی لە ژن بۆ مێرد: کنایە از همسر. (مەژار.٩٤١)

**هانام بردە دەمت:** واتە بەو قسانە بێت کە تۆ دەیکەیت. کەسێك ئەمە دەڵێت کە خۆزگە بە قسەیەك بخوازێت کە بەرامبەرەکەی بیکات (جلال محمود. بەرگی١. ٤٨٥): [کنایە از ای کاش همانگونە باشد کە تو می‌گویی].

**هانینەوە:** برێتی لە چارە کردنی لە جێ چووگ (ناوکمی هانیەوە): کنایە از علاج، از جا در رفتە. (مەژار.٩٤١)

**هاوجفت (هاوجووت):** برێتی لە ژن و مێرد، نێر و مێ: کنایە از جفت نر و مادە.

**هاووجوت:** ژنی حەڵاڵ: کنایە از همسر. (مەژار.٩٤٣)

**هاوشان نین:** [لە زۆر شتدا وەکوو یەك نین. لە ڕیزی یەك نین. بە کوڕ و کچێك، پیاو و ژنێك دەڵێن کە لە ئاکار و ڕەوشتدا جیاوازن و بۆ یەك باش نین]: در بسیاری از چیزها مثل هم نیستند. در یک ردە نیستند. بە پسر و دختر یا مرد و زنی گفتە می‌شود کە در اخلاق و خلق و خوی با هم متفاوتند و برای هم خوب نیستند. (فتاحی قاضي. بەرگی١. ٤٦١)

**هاولان:** برێتی لە دوو دۆست کە دایم پێکەوەن: کنایە از دو دوست کە همیشە با هم باشند. (مەژار.٩٤٤)

**هاوماڵ:** هەڤاڵ و نزیك: دوست و رفیق.

**هاونیلە:** برێتی لە ژنی شوو: کنایە از همسر. (مەژار.٩٤٥)

**هرمەت:** برێتی لە ژنی بەمێرد: کنایە از زن شوهردار. (مەژار.٩٤٦)

**هشکیان:** برێتی لە بێ هەستی و بێ بەزەیی و مرۆڤایەتی: کنایە از بی‌رحم بودن. (مەژار.٩٤٧)

**هوڕمە:** برێتی لە ژن: کنایە از زن. (مەژار.٩٥٦)

**هوورگ زل:** برێتی لە یەکێکی پێیەوبووگ و چاخ: کنایە از آدم چاق.

**هۆرتەوبەرزانین:** برێتی لە زانینی مەردوم لە دارایی و گوژمەی خۆیان من هۆرتەوبەری خۆم ئەزانم

(خالن.ف.٤٠٠): [کنایه از آگاهی مردم از درآمد و هزینەی خودشان، من درآمد و هزینەی خود را می‌دانم].

**هۆڤێتی:** برێتی لە زوڵم کردن: کنایه از ظلم کردن. (معزەر.٩٥٨)

**هۆقەباز:** برێتی لە یەکێکی فێڵباز و کەڵەکەباز (جلال محمود. بەرگی٢. ١٦٣): [کنایه از آدم نیرنگ باز و حقەباز].

**هۆقەبازە:** برێتی لە یەکێکی کەڵەکبازە، دەغەڵی لە کار دەکات، ناپاکە، ناڕاسە (جلال محمود. بەرگی١. ٤٩٥): [کنایه از شخص حقه باز که در کار نارو می‌زند، خائن، ناراست].

**هۆکردنەوە:** برێتی لە کەڵك وەرگرتنی شتێك یا کەسێك لە کاتی پێویستیدا (خالن.ف.٤٠٢): [کنایه از بهره گرفتن از چیزی یا کسی که در موقع لازم].

**هۆنان:** برێتی لە بنیات نانی دامودەزگای میری یان بازرگانی: کنایه از تشکیل سازمان. (معزەر.٩٦٠)

**هۆنەر:** برێتی لە شاعر: کنایه از شاعر. (معزەر.٩٦١)

**هۆندراوە:** برێتی لە شیعر: کنایه از نظم، شعر. (معزەر.٩٦٠)

**هۆنراوە:** برێتی لە شیعر (خالن.ف.٤٠٣): [کنایه از شعر].

**هووهەوی دوای گورگە:** برێتی لە یەکێك کە لە ماڵی یەکێکیتر خواردبێتی و بە هیچ رەنگێك لێی نەسەنرێتەوە و هەرچی هاوار و پەلەقاژەی بۆ بکات نەسنرێتەوە. هەوڵ و دەوڵەکەت وەك هی ئەو کەسەیە کە بە دەنگ بیەوێت بەرخێك لە گورگێك بسێنێتەوە (جلال محمود. بەرگی١. ٤٩٥): [کنایه از کسی که مال و ثروتش را خورده باشند و با داد و فریاد راه انداختن نتواند آن را پس بگیرد].

**هەتا با لەو کونەوە بێ:** [هەتا زۆڵەچەرم ئاو نەیبردووە]: تا وضع بدین منوال باشد. (فتاحی قاضی. بەرگی١. ٤٦٣)

**هەتا دەست هەڵبڕێت کەڵەگەتە:** برێتی لە یەکێکی باڵابەرز: کنایه از آدم بلندقد. (معزەر)

**هەتا شیرم (شمشێرم) بڕ کات:** واتە هەتا لە وزە و دەسەڵات و توانامدا بێت (جلال محمود. بەرگی٢. ١٥٨): [کنایه از تا در نهایت توان و تلاش برای کاری].

**هەتیوباری:** برێتی لە نەداری و فەقیری ژنی بێ مێرد: کنایه از بیوه بی‌نوا. (معزەر.٩٦٤)

**هەژدە هەژدە قسە دەکات:** خێرا خێرا و گوستاخانە دەدوێت (جلال محمود. بەرگی١. ٤٩٠): [کنایه از کسی که سریع و پشت سر هم و بی‌شرمانه صحبت کند].

**هەر ئاخ بە چاوانە:** واتە دەیخلافێنێت و درۆی لەگەڵدا دەکات (جلال محمود. بەرگی١. ٤٨٦): [کنایه از فریبش می‌دهد و به او دروغ می گوید].

**هەر ئەو تاس و حەمامەیە:** ١) برێتی لە یەکێك کە زۆر ئامۆژگاری بکەیت هیچ نەگۆڕێت و کاری تێ نەکات. ٢) بە دۆخێك دەوترێت کە گۆڕانی بەسەردا نەهاتبێت یان گەڕابێتەوە سەربارەکەی پێشووی: ١) کنایه از کسی که بسیار نصیحتش کنی ولی تأثیری نداشته باشد ٢) به حالتی گفته می‌شود که تغییر نکرده باشد یا سرجای اولش برگشته باشد.

**هەر بە لای خۆیدا ئەتاشێت:** واتە هەرکەڵك و قازانجی خۆی لە بەر چاوە و دەپارێزێت ئیتر گوێ بە کەس نادات (جلال محمود. بەرگی٢. ١٥٨): [کنایه از کسی که منافع خود را در نظر می‌گیرد و دیگر گوش به کسی نمی‌دهد].

**هەر پەلێکی بە دەست ئیزرائیلێکەوەیە:** واتە: ئازارێکی زۆری هەیە و لە ناو ئازار وەختە گیانی دەرچێت (جلال محمود. بەرگی١. ٤٨٦): [کنایه از درد و آزار زیادی دارد و به علت درد شدید نزدیک است بمیرد].

**هەر دەرەلنگێکی لە ماڵێك پساوە:** بریتی لە ژنێکی گەڕۆك (جلال محمود. بەرگی ١. ٤٨٧): [کنایه از زن هرزه گرد].

**هەر دوو پای کردگە کەوشێکەوە:** [بریتی لە پەلپ و بیانکگرتن لە سەر کارێك یان شتێك و سووربوون لە کردن یا نەکردنی]: کنایه از اصرار و پافشاری بر انجام یا عدم انجام کاری یا چیزی. (فتاحی قاضی. بەرگی ١. ٤٧٣)

**هەر دیانێکی بە ساڵێك دەرهاوردگە:** [بریتی لە یەکێکی پیسکەی ڕژد و بەرچاوتەنگ]: کنایه از آدم خسیس. (فتاحی قاضی. بەرگی ١. ٤٧٣)

**هەر کەس بە لێفی خۆی دەنوێت:** هەرکەس بە پارەی خۆی دەژیت (جلال محمود. بەرگی ١. ٤٨٧): [کنایه از هر کسی با پول و درآمد خویش زندگی می‌کند].

**هەر کەس بە یاری خویدا هەڵدەڵێ:** واتە: هەر کەس چی لا پەسەند و خۆشەویست بێت، ئاواتی بۆ ئەخوازێت و بۆ ئەوە کۆشش دەکات (جلال محمود. بەرگی ١. ٤٨٧): [کنایه از هر کسی هر چه که مورد پسند و محبوبش باشد آرزویش را می‌کند و برای بدست آوردنش کوشش و تلاش می‌کند].

**هەر کەس دست بۆ دەمی خۆی دەبات:** هەرکەس قازانجی خۆی دەوێت (جلال محمود. بەرگی ١. ٤٨٧): [کنایه از هرکس به فکر منافع خودش است].

**هەر کەس کەر بێت ئەو کورتانە:** بریتی لە یەکێکی هەلپەرەست (جلال محمود. بەرگی ١. ٤٨٧): [کنایه از فرصت‌طلب].

**هەر کەسە گوێز لە باری خۆی دەژمێرێت:** هەر کەسە بە پێی نیاز و دڵ و دەروونی خۆی قسە دەکات (جلال محمود. بەرگی ١. ٤٨٨): [کنایه از این که هرکس بنا به احتیاج و خواسته‌ی خویش حرف می‌زند].

**هەر لە بڕ نەکردنەوە:** بریتی لە یەکێك کە لە کارێکا زۆر ناشارەزا بێ (خال.ف.٤٠٨): [کنایه از کسی که در کاری ناوارد باشد].

**هەر لە سەر بەزمی خۆیەتی:** بریتی لە یەکێك کە لە سەر ئارەزوو و خواستی خۆیەتی و گوێ بە هیچ نادات، بیر لە هیچ ناکاتەوە، جگە لە مەرامەکانی خۆی نەبێ: کنایه از آدمی که خواست و آرزوی خود را در نظر می‌گیرد و گوش به هیچ چیز نمی‌دهد و به هیچ چیزی نمی‌اندیشد، غیر از اهداف خویش نباشد.

**هەر لە ورگی خۆت بدە:** هەرببلێ و بیلێرەوە، خەفەت بخۆ، دستت دەربەسەوە نایەن هیچت بۆ ناکرێت، دەستگیر نابێت (جلال محمود. بەرگی ٢. ١٦٠): [کنایه از هر چه بگویی و غم و غصه بخورید فایده ندارد و هیچ کاری از دست برنمی‌آید و چیزی دستگیرت نخواهد شد].

**هەر ملەیەك سەختە برۆ بیگرە:** واتە ئەوپەڕی هەوڵی خۆت بۆ بەزاندنی من بە کار بێنە (جلال محمود. بەرگی ١. ٤٨٨): [کنایه از کوتاهی نکن، تمام تلاش خودت را بر ضد من انجام بده].

**هەر موویەکی بە ساڵێك ڕواوە:** بریتی لە یەکێکی زۆر وریا و چاوکراوە (خال.٤٩٥): [کنایه از شخص دانا و فرزانه].

**هەڕاکردن:** بریتی لە بەلەزبوون لە هەموو کار و بارێکا فسیارکەس (لە نانخواردنە هەڕا ئەکا) (خال.ف.٤٠٧): [کنایه از سریع عمل کردن در هر کاری].

**هەراو زەنا (هەراوهوریا):** پەشێوی و ئاژاوە (جلال محمود. بەرگی ١. ٤٨٨): [کنایه از آشفتگی و جنجال].

**هەربلاندن:** بریتی لە ئاڵۆز کردنی کار: کنایه از بهم ریختن کار. (هەژار.٩٦٦)

**هەرەم:** بریتی لە ژنی مێرد: کنایه از همسر، عیال. (هەژار.٩٧١)

**هەڕەو گوڕە (هەڕەشە و گوڕەشە):** (ترساندن و بڤەربەست کردن (جلال محمود. بەرگی‌١. ٤٨٨): [کنایە از ترساندن و سد کردن].

**هەرخواردگیە و نەڕیاگە:** بریتی لە یەکێکی زۆر قەڵەو (جلال محمود. بەرگی‌٢. ١٥٩): [کنایە از آدم بسیار چاق و تنومند].

**هەرزان کڕ:** ١) بریتی لە فەقیر و نەدار. ٢) بریتی لە چرووك و ڕژد: ١) بینوا ٢) خسیس. (مەژار.٩٦٨)

**هەرزە دڕ:** [بریتی لە یەکێکی وڕلێدەر و چناکە شکیاو]: کنایە از هرزەگوی و پرچانە، فضول. (حیرت.٥٧٠)

**هەرزە چەنە:** [بریتی لە یەکێکی وڕلێدەر و چناکە شکیاو]: کنایە از هرزەگوی و پرچانە و فضول. (حیرت.٤٨٩)

**هەرچەکەی ملی دێ:** [بریتی لە یەکێکی هێز لێبڕاو، ماندوو]: کنایە از خستە و ناتوان. (فتاحی قاضی. بەرگی‌١. ٤٧١)

**هەرچی و پەرچی:** بریتی لە تاقمە مرۆڤێك کە سووك بێتە بەرچاو، یان خۆیان سووك بن، ناکەس (جلال محمود. بەرگی‌١. ٤٨٩): [کنایە از گروهی آدم کە بی‌ارزش بنظر برسند یا خودشان بی‌ارزش باشند، ناکس].

**هەرگ (قوڕ) دەکولێنێ:** واتە سەری لێ شێواوە (جلال محمود. بەرگی‌٢. ٥٨): [کنایە از آدم پریشان و سرگردان].

**هەرگ بە سەر:** بریتی لە بێچارە: کنایە از بیچارە.

**هەروبار:** بریتی لە دار مێوێك کە لە داریتر هاڵاوە: کنایە از تاک پیچیدە بر درخت دیگر. (مەژار.٩٧٠)

**هەروپف:** بریتی لە تووڕەبوونێ کە زوو خەلاس دەبێ (گوێ مەدەیە تووڕەیی ئەو هەروپفێکە دەبڕێتەوە): کنایە از خشم زودگذر. (مەژار.٩٧٠)

**هەزار ئەحمەد و مەحموود دەکات:** ١) بە پێچ و پەنایە. ٢) پەلی بلاوە و کاری زۆرە (جلال محمود. بەرگی‌١. ٤٨٩): ١) [کنایە از آدم موذی] ٢) [بسیار سرشلوغ].

**هەزار تەڵەی بە کلك تەقاندووە:** بریتی لە مرۆڤێك کە ناکەوێتە داوەوە، زۆر زانێکە، فێڵبازێکە هاوتای نییە (جلال محمود. بەرگی‌١. ٤٨٩): [کنایە از آدم کە بە دام نمی‌افتد، بسیارآگاە و نیرنگ‌باز و حریفی ندارد].

**هەزار پەتپەتیی پێ کرد:** زۆری هێنا و بردی، تووشی گرفتێکی زۆری کرد. سزایەکی زۆری دا (جلال محمود. بەرگی‌٢. ١٦٠): [کنایە از بسیار او را آورد و برد. و او را دچار گرفتاری و مشکل ساخت و رنج و آزار بسیاری بە او داد].

**هەزار پەلی بە پشتی ئەودا داوە:** واتە ئەم لەو زۆر خراپترە (جلال محمود. بەرگی‌١. ٤٨٩): [کنایە از خیلی از او بدتر است].

**هەزار پیشە:** بریتی لە کەسێ سەری لە زۆرکاران دەرچێ: کنایە از آدم همە فن حریف. (مەژار.٩٧٢)

**هەزار ڕەگ:** بریتی لە زۆڵ و حەرامزادە: کنایە از حرامزادە. (مەژار.٩٧٢)

**هەزار گۆزەی بێ‌دەسە دروست دەکا:** بریتی لە یەکێك کە هەموو ئیشەکەی بە نیوەچڵی بیکات (جلال محمود. بەرگی‌١. ٤٩٠): [کنایە از کسی کە همە کارش ناقص و نیمە کارە باشد].

**هەزار فاکت بە فیکێکی:** واتە ئەو لە تۆ زۆرزانترە و گرەوی لێ نابەیتەوە بەدەسەلاتتر و بەتواناترە (جلال محمود. بەرگی‌١. ٤٩٠): [کنایە از این کە او از تو داناتر و تواناتر است و بر او پیروز نمی‌شوی].

**هەزار قوڕ و چڵپاوی بە قنگدا هەڵپژاوە:** بریتی لە یەکێك کە لە دنیادا زۆر قاڵ بووە و تاڵی و سوێری ژیانی زۆر چەشتووە (جلال محمود. بەرگی‌١. ٤٩٠): [کنایە از

فرد باتجربه آشنا به سختی‌های زندگی].

**هەزار کەفەنی زەرد کرد:** [برێتی لە یەکێك کە زۆر ترسیابێ]: کنایه از کسی که بسیار ترسیده باشد. (حیرت.٥٨٥)

**هەزاری وا دەبەمە سەر ئاو و ئاوی نادەم و دەیهێنمەوە:** بۆ شانازی قسەکەر و بە سووكگرتنی ئەوی‌تر دەوترێت واتە من لەو زۆر زانترم و باشتر لە ژیان دەگەم ئەو ساویلکە و بوودەڵەیە (جلال محمود. بەرگی۱. ٤٩٠): [متکلم به عنوان افتخار و برای رسوا کردن مخاطب می گوید یعنی من از او آگاه ترم و خوبتر به مسایل زندگی آگاهم].

**هەزاری وام ناڵ کردووە:** گرەوم لە هەزاری وا بردۆتەوە. جەزرەبەم گەیاندوویەتی (جلال محمود. بەرگی۲. ١٦١): [کنایه از بر هزاران مثل او پیروز شده‌ام، آزار رسانده‌ام].

**هەسان لێدان:** برێتی لە هەڵخەڵەتاندنی یەکێك (خاڵ.ف.٤١٢): [کنایه از فریب دادن کسی].

**هەسانی لە بەرپێی دا:** هەڵی دا لە خشتەی برد، بە قسەی لووس هەڵی فریواند و لاسی دا (جلال محمود. بەرگی۲. ١٦١): [کنایه از ، با زبان چرب او را فریب داد].

**هەستانەوە:** برێتی لە دەوڵەمەندبوونەوە دوای نابووتی و بەدبەختی (خاڵ.ف.٤١٢): [کنایه از ثروتمند بعد از بیچارگی].

**هەستونیست:** برێتی لە هەموو دارایی مرۆڤ (خاڵ.ف.٤١٣): [کنایه از تمام ثروت و اموال کسی].

**هەستی کوێ:** برێتی لە زۆر خۆر: کنایه از پرخور. (مەژار.٩٧٥)

**هەسدانەوە:** برێتی لە بە توندی پەرچ دانەوە (زۆری وت ئاخری هەسم دایەوە): جواب دندان شکن دادن. (مەژار.٩٧٥)

**هەسەهەسووك:** برێتی لە شاخی بزنەکێوی و کەڵەکێوی: کنایه از شاخ بز کوهی. (مەژار.٩٧٦)

**هەش بە سەر:** ١) برێتی لە بەدبەخت ٢) برێتی لە تازیەبار: ١) کنایه از سیه روز ٢) کنایه از ماتم‌زده. (مەژار.٩٧٧)

**هەچەهەچ:** برێتی لە قسەی زۆر بێ تام: کنایه از یاوه گویی. (مەژار.٩٦٥)

**هەچکە بە تاوە:** بە کەسێك دەڵێن کە لە هەموو شتێکدا بەپەلە بێت و بیەوێت هەموو کارێك و شتێکی زوو بۆ جێبەجێ بێت (جلال محمود. بەرگی۱. ٤٨٦): [کنایه از آدم عجول که می‌خواهد همه چیز و همه کاری را سریع انجام دهد].

**هەڤدەل:** برێتی لە تێکەڵ پێکەڵی و نارێکی: کنایه از درهم برهمی و بی‌نظمی. (مەژار.٩٨٠)

**هەڤرەنگی:** برێتی لە دۆستایەتی گەرم: کنایه از دوستی گرم، صمیمیت. (مەژار.٩٨٠)

**هەڤکێش:** برێتی لە وێکچوونی ئاکاری دوو کەس یا چەند کەس: کنایه از تشابه اخلاقی دو یا چند نفر. (مەژار ٩٨١)

**هەفترۆو:** برێتی لە مەراییکەر، ڕووبین: کنایه از متملق و ریاکار. (مەژار.٩٧٨)

**هەفتیار:** برێتی لە ژنێ کە دەگەڵ زۆرکەس حەز لێکردویی دەکا: کنایه از زنی که عشّاق بسیار دارد. (مەژار.٩٧٨)

**هەڵ پڕووزن:** برێتی لە کاری بە پەلە و بەلەز: کنایه از عجله و باشتاب. (مەژار.٩٨٧)

**هەلاّجان ئەکا** (مەربوخ.٢٥): [١) زۆر بێ دەسەڵات بوو و کەم توانایە. ٢) قسەکانی هیچی جێی خۆی ناگرێت: ١) کنایه از بسیار ناتوان و بی‌قدرت و جلف و کم‌توان ٢) کنایه از سخنانش بی‌تأثیر است].

**هەلاخنین:** برێتی لە پڕجوێن کردنی یەکێك (خاڵ.ف.٤١٥): [کنایه از فحش و ناسزای بسیار به کسی].

**هەڵایسان:** بریتی لە شەڕ و هەرا قەومان: کنایه از آشوب بپا شدن. (معزبر.٩٨٥)

**هەڵایساندن:** بریتی لە کێشە نانەوە: کنایه از آشوب بپا کردن. (معزبر.٩٨٥)

**هەڵایسین:** بریتی لە هۆی کێشەو هەرا: کنایه از مایەی شر و فتنه. (معزبر.٩٨٥)

**هەڵتۆقیوە:** بریتی لە منداڵێك بە تایبەتی بە کچێك کە خەریك بێت پێ بگات. واتە باڵای کردووە و زوو گەورە بووە (جلال محمود. بەرگی١. ٤٩١): [کنایه از دختری که تازه به سن نوجوانی پاگذاشته باشد].

**هەڵەداوان:** بەهەڵەداوان هات: بریتی لە یەکێك کە بە شپرزەیی و خێرایی هات (جلال محمود. بەرگی١. ٤٩١): [کنایه از این که با عجله و پریشانی آمد].

**هەڵەسوون هێنانەوە:** بریتی لە دووبارە داوا کردن (بەشم داوە دیسان هەڵە سوّقی هێناوەتەوە): کنایه از توقع و ادّعای دوباره. (معزبر.١٠٠١)

**هەڵەسیایا:** بریتی لە قەڵەوی تەمەڵ: کنایه از فربه تنبل. (معزبر.١٠٠١)

**هەڵەقومەلەق دەدوێت:** بریتی لە یەکێك کە قسەی بزربزر و شاشوویش دەکات کە قسەکانی نەچنەوە سەر یەك (جلال محمود. بەرگی١. ٤٩١): [کنایه از کسی که سخنان بریده بریده و نامعلوم بر زبان می‌آورد و حرفهایش بی‌انجام است].

**هەڵتلۆپین:** بریتی لە مردن ئەم وتەیە بۆ سووکی ئەوتری (خاڵ.ف.٤٢٠): [کنایه از مردن. این حرف برای تحقیر است].

**هەڵەوەڕ:** ١) بریتی لە چەنەباز، قسەفرەکەر: ١) کنایه از وراج ٢) بریتی لە مرۆڤی دەم پیسی بێ شەرم: ٢) کنایه از آدم بدزبان و بی‌شرم. (معزبر.١٠٠٢)/(خاڵ.ف.٤٣٣)

**هەڵەوەڕە (دەمەوەڕە):** بۆ سووکی بە یەکێك دەوترێت کە زۆر بڵێت و هەڵە زۆر بکات لە قسەدا، یان قسەیەك بکات بە دڵی گوێگرەکەی نەبێت. واتە وەڕەی دێت و بە هەڵەش دەدوێت بە ناسیاو و نەناس: واتە: خراپ دەڵێت (جلال محمود. بەرگی١. ٤٩١): [برای تحقیر و کنایه از کسی است که زیاد حرف بزند و اشتبا زیادی در حرف‌هایش باشد و یا سخنی بگوید که باب طبع شنونده‌اش نباشد و به آشنا و ناآشنا حمله و پرخاش می کند].

**هەڵتیزاندن:** [بریتی لە تووڕەبوون و هەڵچوون]: کنایه از عصبانی و خشمگین بودن. (فتاحی قاضی. بەرگی١. ٤٩٥)

**هەڵتیقان کردن:** بریتی لە یەکێکی بەکەیف و بێ خەیاڵ: کنایه از شخص شاد و بی‌خیال.

**هەڵپەرتاوتن:** بریتی لە ڕێك و پێك کردنی شتی نارێك (ناو ماڵەکە هەڵپەرپتوە): کنایه از پیرایه، تنظیم. (معزبر.٩٨٨)

**هەڵپەردا پەڕ:** بریتی لە کۆشش و تەقالای زیرەکانە: کنایه از تلاش و کوشش زیرکانه. (معزبر.٩٨٨)

**هەڵپەسارتن:** بریتی لە کار خستن و چاوە نۆڕ ڕاگرتن: کنایه از معلق کردن از کار. (معزبر.٩٨٨)

**هەڵپڕژان:** بریتی لە هەڵواسان و بەگژداچوون و شەڕ: کنایه از گلاویز شدن برای جنگ. (معزبر.٩٨٧)

**هەڵپرووسقیاوە:** [بریتی لە یەکێك کە بە بۆنەی ڕووداوێکەوە هەوڵ بێ و بێهۆشکێ]: کنایه از رنگ پریده و مضطرب. (حیرت.٥٨٥)

**هەڵپفان:** بریتی لە تووڕەبوون و با کردن لە ڕقا: کنایه از بسیار خشمگین شدن. (معزبر.٩٨٨)

**هەڵخراندن:** بریتی لە هاندان و فریودان: کنایه از تحریک و فریب. (معزبر.٩٩١/ حیرت.٥٨٦)

**هەڵخستن:** [بریتی لە خواردن و تەواوکردنی

خواردەمەنیەك]: کنایه از خوردن و تمام کردن چیزی خوراکی. (حیرت.٥٨٦)

**هەڵڕووشیانەوە:** [برێتی لە تێکدانی کارێك یان مامڵە و ئاڵوێرێ]: کنایه از به هم خوردن کاری یا باطل شدن معامله و قراردادی. (حیرت.٥٨٧)

**هەڵسانەوە:** برێتی لە دەوڵەمەندبوونەوەی کەسێك کە هەژار کەوتبێ (خاڵ.ف.٤٢٤): [کنایه از کسی که بعد از فقیری ثروتمند شود].

**هەڵسەنگان:** برێتی لە تاقیکردنەوە و نرخ بۆ دانان: کنایه از سنجش و ارزیابی. (مەزن.٩٩٤)

**هەڵسووڕاو:** برێتی لە مرۆڤی بەکار و تێکۆشەر (پیاوێکی هەڵسووڕاوە): کنایه از آدم پرتحرك. (مەزن.٩٩٣)

**هەڵسووڕێن:** برێتی لە بەڕیوەبەر و کارپێکهێنەر (مام حەسەن کاروباری ئاغا هەڵدەسووڕێنێ): کنایه از گرداننده‌ی کار. (مەزن.٩٩٣)

**هەڵشێواندن:** [برێتی لە تێکدان و هەڵوەشانەوەی مامڵە و ئاڵوێرێك]: کنایه از بهم خوردن معامله یا کاری. (حیرت.٥٨٧)

**هەڵچوون:** برێتی لە تووڕەبوون: خشمگین شدن. (مەزن.٩٩٠)

**هەڵگەڕاندنەوە:** برێتی لە پەژیوان کردنەوە: کنایه از پشیمان کردن. (مەزن.٩٩٨)

**هەڵگەڕاوە:** برێتی لە یەکێك کە زۆر دەوڵەمەند بووە و پێگەیشتووە وەك چۆن ئاگر بەرز دەبێتەوە و شەوق دەداتەوە و کڵپە دەسێنێت (جلال محمود. بەرگی١. ٤٩١): [کنایه از کسی که ناگهان ثروتمند شده باشد مانند آتشی که ناگهان شعله‌ور شود و همه‌جا را روشن کند].

**هەڵگران:** برێتی لە دەوڵەمەندبوونی یەکێك زووبەزوویی (خاڵ.ف.٤٢٨): [کنایه از ثروتمند شدن سریع کسی].

**هەڵگرساندن:** [برێتی لە تووڕەبوون یان شەڕ و ئاژاوە نیانەوە]: کنایه از عصبانی کردن و آشوب برپا کردن. (حیرت.٥٨٧)

**هەڵگێڕ و داگێڕی کرد:** سەرنجدان و لێکدانەوە و هەڵسەنگاندن (جلال محمود. بەرگی١. ٤٩٢): [کنایه از در آن دقت کرد و مورد بررسی و تحقیق قرارداد، ارزیابی].

**هەڵگیرسان:** برێتی لە دەستپێکردنی جەنگ و هەرا (خاڵ.ف.٤٢٩): [کنایه از شروع شدن جنگ و جدال].

**هەڵگیرساندن:** برێتی لە دامەزراندنی شەڕ و هەرا (خاڵ.ف.٤٢٩): [کنایه از ایجاد جنگ و دعوا].

**هەڵگێڕووەرگێڕ:** برێتی لە جووڵانەوە (پیر بووە هەڵگێڕووەرگێڕی پێ ناکرێ): کنایه از جنبش و تحرك. (مەزن.٩٩٨)

**هەڵقوڵین:** برێتی لە پەیابوون و قوتبوونەوەی یەکێك بە کوتوپڕی (خاڵ.ف.٤٢٦): [کنایه از پیدا شدن و گم شدن ناگهانی کسی].

**هەڵکراندن:** برێتی لە زانینی شتێکی کەم لە باسێکی گران (تۆزێکم لە دەرسەکەم هەڵکڕان) پەیاکردنی شتێکی کەم (خاڵ.ف.٤٢٦): [کنایه از آگاهی کم از مطلبی مهم].

**هەڵکشاو:** برێتی لە مەردومی باڵابەرز (خاڵ.ف.٤٢٧): [کنایه از آدم قدبلند].

**هەڵکورمان:** برێتی لە کزکردن لە لاپەڕ و بن دیواران: کنایه از انزوا و کز کردن در گوشه و کنار. (مەزن.٩٩٧)

**هەڵکورماو:** برێتی لە مرۆڤی گۆشەگرتوو و لاپەڕ: کنایه از آدم گوشه‌گیر و منزوی. (مەزن.٩٩٧)

**هەڵلاجی لێو ئەکا** (مربوخ.٢٥): [قسە زۆر دەکات و

قسەکەیشی بەدگۆییيە بە سەروپۆ و تەلاکی ئەم و ئەودا دێت، قسە دێنێت و دەبات: کنایە از بسیار حرف، بدگویی و پشت سر بد گفتن و فتنەانگیزی].

**هەڵمەتە کاسە:** برێتی لە مەردومی خۆتێهەڵقورتێن لە هەموو کارێکا (خال.ف.٤٣٠): [کنایە از آدمی کە در هر کاری دخالت می‌کند].

**هەڵوەشاندنەوە:** برێتی لە تێکدانی کارێك(خال.ف.٤٣٢): [کنایە از بە هم زدن کاری].

**هەڵی بڕی:** ڕاوی نا، دەری کرد (جلال محمود. بەرگی٢. ١٦١): [کنایە از فراریش داد، بیرونش کرد].

**هەڵی تراند:** خەساری زۆری پێ گەیاند، شکستی دا (جلال محمود. بەرگی١. ٤٩٢): [تحقیر، او را دچار آسیب بزرگی کرد، شکست داد].

**هەڵی پێچا:** هێنایە گیر و گاز، سەری کردە سەری، زۆری بۆ هێنا، سزای توندی دا (جلال محمود. بەرگی٢. ١٦١): [کنایە از او را تحت فشار قرار داد و رنج و آزار بسیاری بە او رساند].

**هەڵی کێشا:** هەڵی نا، بەرزی کردەوە، ڕێزی بۆ دانا (جلال محمود. بەرگی٢. ١٦١): [کنایە از بلندش ساخت و برایش احترام گذاشت].

**هەڵیان تەکاند:** نابووتیان کرد وەك چۆن دەفرێك سەرەوخوار دەکرێت و رادەتەکێنرێت هیچی تێدا نامێنێت (جلال محمود. بەرگی١. ٤٩١): [کنایە از نابود و ورشکستش کردند درست مثل کاسەای کە واژگونش کنند و چیزی در آن نماند].

**هەڵێن تێ بەڵێن نەوات:** [برێتی لە جێگایەکی شپرز و دانەمەزراو و زۆر جەنجاڵ و بێ یاسا و ڕێسا]: کنایە از جایی بی نظم و قانون. (حیرت.٥٨٨)

**هەم لێفە و هەم دۆشەکە:** [برێتی لە ژنێکی پێیەبووگ و قەڵەو، بۆ گاڵتەیە]: بە مزاح کنایە از زن چاق. (حیرت.٥٨٩)

**هەمانە بەری بە کۆی زووخاڵ بێت:** واتە درۆ و فشەی زۆرە، جاران درۆکانی وەکو لە هەمانەدا بوویێت وابوو، کەس پێی نەدەزانی ئێستە هەمانەکەی دزراوە و درۆکانی کەوتوونە ڕوو: پەردەی لە سەر هەڵماڵراوە و ڕووی ڕەشی بە خەڵك ناسێنراوە (جلال محمود. بەرگی١. ٤٩٢): [کنایە از آدم دروغگو و خودستا کە پس از مدتی کە چهرەی واقعیش برای مردم آشکار شود].

**هەمانەی زۆر پەستراوە:** واتە خەریکە لە دەست دەچێت چونکە هەمانەکە زۆر پەستێوراو شتی تێ ئاخنرا، دەتەقێت. هەموو شتێك لە ئەندازەی خۆیە ئەگینا لە دەست دەچێت (جلال محمود. بەرگی١. ٤٩٢): [کنایە از این کە نزدیک است از دست برود چون کە انبانش پر است نزدیک است بترکد . همە چیز بە اندازەی خودش باید باشد و گرنە از دست می‌رود].

**هەمرۆ دارە وا دیارە:** [برێتی هەواڵدان لە هەبوونی شتێك یان دروست بوونی بابەتێك]: کنایە از از صحت و وجود چیزی خبر دادن. (حیرت.٤٩٥)

**هەموو ڕێیەك بۆ بانە دەچێت:** واتە بە هەموو جۆرێك یەك ئەنجام دەردەکەوێت (جلال محمود. بەرگی١. ٤٩٣): [کنایە از همە چیز یک نتیجە دارد].

**هەموو زەردێك ئاڵتوون نییە:** بەدیمەن دەسخەرۆ مەبە (جلال محمود. بەرگی١. ٤٩٣): [کنایە از فریب ظاهر را مخور].

**هەموو شتێك بە گەزی خۆیان دەپێون:** هەمووان وەك خۆیان تەماشا دەکەن، وا دەزانن خەڵکیش لە ئەندازە و ویژەی خۆیانن. هەمووان دەبەنە ڕیزی خۆیانەوە چاك بن یان خراپ (جلال محمود. بەرگی٢. ١٦٢): [کنایە از کسانی کە با چشم خویش بە دیگران می‌نگرند و دیگران را مثل

خودشان تصور می‌کنند و همه را در ردیف خویش می‌پندارد چه خوب باشند چه بد].

**هەموو کەسێك مەنی ماڵی خۆیەتی:** برێتی لە هەموو کەسێك گەورەی ماڵی خۆیەتی (جلال محمود. بەرگی۱. ۴۹۳): [کنایە از هر کس بزرگ و رئیس خانەی خویش است].

**هەمیشە کوتەکی لە ناودایە:** برێتی لە یەکێکی شەڕانی و توورە کە هەمیشە ئامادەی شەڕە (جلال محمود. بەرگی۲. ۱۶۲): [کنایە از آدم ستیزەجو و عصبی و کە همیشە آمادەی جنگ و جدال است].

**هەناسە بە قنگ دەدات:** برێتی لە یەکێك کە زۆر نەخۆشە و هەناسەی سوارە (جلال محمود. بەرگی۱. ۴۹۳): [کنایە از کسی کە بسیار بیمار باشد و بە زور نفس بکشد].

**هەناسە بڕین:** ۱) برێتی لە لێدان لە یەکێك بە جۆرێك کە نەتوانێ هەناسە بدا. ۲) برێتی لە کونبڕکردنی شوێنێك (خاڵ.ف.٤٣٥): ۱) [کنایە از کسی را زدن بە طوری کە نای تنفس نداشتە باشد] ۲) [کنایە از مسدود کردن جایی].

**هەناسە دان:** برێتی لە کەمێك پشوودان و حەسانەوە: دانیشە (هەناسەیك) بدە (خاڵ.ف.٤٣٦): [کنایە از کمی استراحت کردن].

**هەناسە سەرد:** برێتی لە خاکسەر و بێکەس: کنایە از بینوا و بیچارە. (هەژار.۱۰۰۵)

**هەناسە هەڵکێشان:** برێتی لە خەفەت خواردن (خاڵ.ف.٤٣٦): [کنایە از غم و غصە خوردن].

**هەناسەسوار بوون:** برێتی لە هەناسە بڕکێ (خاڵ.ف.٤٣٦): [کنایە از نفس‌تنگی].

**هەناسەی سارد بووە:** ۱) باری کەوتووە و لێی قەوماوە. ۲) دەردەکەی کوشندەیە. ۳) نابووت بووە، تووش بووە ٤) هومێدی بڕاوە (جلال محمود. بەرگی۱. ۴۹۳): ۱) [کنایە از کسی کە دچار بلا و مصیبت و بدبیاری شدە] ۲) [بیماریش خطرناك است] ۳) [گرفتار شدە] ۴) [امید و آرزویش را از دست دادە].

**هەناسەیەك:** ۱) برێتی لە هاتوچۆ کردنی با لە شوێنێکەوە ۲) ماوەیەکی کورت: پەنجەرەکە لە گەڵێ لاوە. (هەناسە ئەدا) (خاڵ.ف.٤٣٦): ۱) [کنایە از رفت و آمد کردن باد از جایی] ۲) [لحظەای کوتاه].

**هەنگاونان:** برێتی لە پێشکەوتن لە کارێکا: فلاڵنە کەس (هەنگاوێکی باشی نا) (خاڵ.ف.٤٣٧): [کنایە از پیشرفت کردن در کاری].

**هەنگوێن بە دەمی تاڵە:** زۆر خەفەتبار و نەخۆشە (جلال محمود. بەرگی۱. ٤٩٤): [کنایە از بسیار غمگین و بیمار است].

**هەنگوینی بێ مێش:** برێتی لە دەستکەوتێکی بەنرخی بێ ئەرك (خاڵ.ف.٤٣٨): [کنایە از بهرەی با ارزش و بدون زحمت].

**هەنگوینی شەمەتلێنکەیە:** ۱) برێتی لە یەکێکی دڵناسك کە هەر لە خۆیەوە زویر بێت زوو هاواری لێ هەڵسێت. ۲) برێتی لە یەکێك کە دەرەنگ خۆی دەربخات و خۆی خۆشەویست بکات (جلال محمود. بەرگی۱. ٤٩٤): ۱) [کنایە از آدم نازك دل کە زود خشمگین شود و داد و فریادش بلند شود] ۲) [کنایە از کسی کە خودش را دیر بشناساند و محبوب گرداند].

**هەنی دا ژێر باڵی:** بە درۆ بە شاخ و باڵیا هات بۆ ئەوەی فریوی بدا (رخزادی): [کنایە از تعریف و تمجید دروغین کسی برای فریب دادنش].

**هەوابڕ:** برێتی لە دیوار و خانووی بڵند: کنایە از دیوار

و خانەی بلند. (معزی.۱۰۰۸)

**هەوانە در:** مشك: کنایە از موش. (کریمپور.۱۰۶۲)

**هەوساری بە دەس خۆیەوە نییە:** برێتی لە یەکێك کە دەسەڵاتی خۆی نییە و کەسێکی تر فرمانی پێ ئەدا: کنایە از صاحب اختیار خود نبودن، آزادی عمل نداشتن و بە فرمان کسی دیگر عمل کردن.

**هەوساری بڕیگە:** برێتی لە یەکێك کە بۆ کەسێکی تر مل دانەوێنێ و بە گوێی نەکا: کنایە از، کسی کە از امر و فرمان کس دیگر سرپیچی کند.

**هەوساری داماڵراوە (لە جڵەو بەر بووە):** برێتی لە یەکێکی بەرەڵایە کە گوێ بە کەس نادات و چی بە دڵدا بێت دەیکات (جلال محمود. بەرگی۱. ٤٩٤): [کنایە از شخص لاقید کە حرف کسی را گوش ندهد و هرچە بخواهد انجام دهد).

**هەوساری داماڵیاگە:** [برێتی لە یەکێکی بەرەڵا و بێ باك]: کنایە از آدم جسور و افسار گسیختە. (حیرت.۵۹۲)

**هەوێنی نۆ قازان شیرە:** برێتی لە یەکێك کە زۆر خراپ بێت، پێی بکەوێتە هەر شوێنێکەوە ئاژاوەی تێ بخات، فێڵباز و تەڵەکەباز بێت (جلال محمود. بەرگی۱. ٤٩٤): [کنایە از شخص بسیار بد کە پایش بە هرجا بیفتد آشوب بپا کند، نیرنگ‌باز و حیلە گر است].

**هەیپێ لێ کرد:** ۱) هانی دا خێرا بڕوات. ۲) خێرا ڕۆیشت تا زوو بگات جێ (جلال محمود. بەرگی۱. ٤٩٤): ۱) [کنایە از تحریکش کرد زودتر برود] ۲) [کنایە از این کە سریع رفت تا زود بە مقصد برسد].

**هەیهوو:** [برێتی لە نادیاربوونی سەرگرتنی کارێك لە زەمەنێکی دووورودرێژدا]: کنایە از نامعلومی انجام کاری در زمانی طولانی. (حیرت.۵۹۳)

**هێشتا ئەسپی نەکڕیوە ئاخوڕی بۆ هەڵدەبەستێت:** برێتی لە کەسێك کە دەستی نەدابێتە کارێك، شتێکی نەکردبێت، خەریکی چاك کردنی جێگەکەی بێت و بە خەیاڵ ئامادەی بەرخواردنی بێت (جلال محمود. بەرگی۱. ٤٩٦): [کنایە از کسی کە هنوز کاری را انجام ندادە اما بفکر مرتب کردن جایگاە و سودش هست].

**هێشتا نەبووە بە قۆچەقانی شرقەی لێوە دێت:** برێتی لە کەسێك کە بەر لە تەواوبوونی کارێك خۆی بۆ حازر بکات (جلال محمود. بەرگی۱. ٤٩٦): [هنوز درست نشدە خود را برای استفادە حاضر کردە است].

**هیچ نەدیگ:** [برێتی لە سواڵکەر، ناپیاو، لە خوارەوەبوونی پلەوپایەی کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی]: کنایە از آدم گدا، رذل، بی‌فرهنگ. (حیرت.۵۹٦)

**هیچێ بە زمانیەوە ناوێسێت:** زمان نەوێسیاگە، نهێنی قایم نییە، زوو ئاشکرای دەکات (جلال محمود. بەرگی۱. ٤٩٥): [کنایە از کسی کە رازنگهدار نیست].

**هیچوپووچە:** برێتی لە شتێك، یان کەسێکی بێ کەڵك و بێ نرخ (جلال محمود. بەرگی۱. ٤٩٥): [کنایە از چیز یا فرد بی‌سود و بی‌ارزش].

**هیچی سەوز نەکردووە:** هیچی پەیدا نەکردووە و دەستگیر نەبووە (جلال محمود. بەرگی۲. ١٦٣): [کنایە از چیزی عایدش نشدە است].

**هیچی لە باردا نییە:** بێ بڕشتە. بوودەڵەیە، بێ دەسەڵاتە، نەکردەیە (جلال محمود. بەرگی۲. ١٦٣): [کنایە از آدم ناتوان و ناکارآمد].

**هیچی لە خۆ نەگرتووە:** ۱) برێتی لە یەکێك کە هیچ یاری و چاکەیەك ناکات. ۲) برێتی لە یەکێك کە هیچ تەشەر و توانج و قسەیەك کاری تێ ناکات (جلال محمود. بەرگی۱. ٤٩٥): ۱) [کنایە از کسی کە در هیچ کار نیکی یا کمک بە دیگران دخالت نمی‌کند] ۲) [کنایە از کسی

که هیچ طعنه‌ای در او اثر نمی‌کند].

**هیچی لێ نایێ:** [برێتی لە یەکێکی نالایەق و بێ کەڵك]: کنایه از آدم بی‌لیاقت. (حیرت.۵۹۷)

**هێلانەشێویان:** برێتی لە سەر لێ تێکچوون و ماڵوێرانبوونی یەکێك (خاڵ.ف.٤٤٥): [کنایه از آشفتن و خانه خراب شدن کسی].

**هێلکە بە بن هەنگەڵ یان بن باخەڵ دەبرژێنێت:** برێتی لە یەکێکی گەنج و بەگڕوتین (جلال محمود. بەرگی۱. ٤٩٦): [کنایه از جوان پرتوان].

**هێلکە ڕەنگ دەکات:** برێتی لە یەکێکی مەرایی‌کەرە (جلال محمود. بەرگی۱. ٤٩٦): [کنایه از شخص متملق].

**هێلکە لە قەڵ ئەدزێ:** بە یەکێکی فێڵباز و زیرەك ئەوترێ (رخزادی.٤٢٨): [کنایه از آدم حیله‌گر و زرنگ].

**هێلکەم ڕەنگ نەکردووە:** کارەکەم کارێکی ئاسان نییە (جلال محمود. بەرگی۲. ٦١): [کنایه از این که کارم اینقدر آسان نیست].

**هێلکەی بێ زەردێنە ئەفرۆشێ:** واتە زۆر ناڕاست و بەفروفێڵ (خاڵ.٥٠٦/جلال محمود. بەرگی۱. ٤٩٦): [کنایه از آدم بسیار نادرست و نیرنگ‌باز].

**هێلکەی شکاو پینە ئەکات:** برێتی لە یەکێکی زۆر وریا و دانا بە جۆرێك کە بتوانێ هەموو کارێك ئەنجام بدات (خاڵ.٥٠٦/ جلال محمود. بەرگی۲. ١٦٣): [کنایه از آدم بسیار هوشیار و دانا که در هر کاری همه‌فن حریف باشد].

**هێندە چەورە ڕۆنی لێ دەتکێت:** بۆ سەرزەنشتی کەسێکی نەخۆر بەکار دێت (جلال محمود. بەرگی۱. ٤٩٦): [کنایه از سرزنش کردن ممسک].

# ی

**یاری بە ئاگر دەکات:** ۱) شەر دەنێتەوە ئاشووب و هەرا دەگێڕێت: ۱) [کنایە از آدم آشوبگر] ۲) بە کەسێك دەڵێن کە خۆی بخاتە گێژاوێکەوە کە پڕ لە مەترسی و گاشە و ئەندێشە بێت (جلال محمود. بەرگی ۱. ۴۹۷): ۲) [کنایە از کسی کە خود را گرفتار مشکل و تنگنای خطرناکی بکند].

**یاڵگەنیگ:** برێتی لە کەچەڵ: کنایە از آدم کچل. (مەژار ۱۰۲۸)

**یاڵویژ:** برێتی لە مووی سەری قرژ و تێك ئاڵۆزاو: کنایە از موی ژولیدە. (مەژار ۱۰۲۸)

**یانەوان:** برێتی لە باوك: کنایە از پدر. (مەژار ۱۰۲۸)

**یەخە دادرین:** برێتی لە دۆعای شەڕ کردن: کنایە از نفرین کردن. (مەژار ۱۰۳۰)

**یەخەگرتن:** برێتی لە گیردان بۆ شەڕ: کنایە از گیر دادن برای دعوا. (مەژار ۱۰۳۰)

**یەخەگیر:** برێتی لە شتێك کە بوویێ بە کوڵتەوە (خاڵ.ف.۴۵۳): [کنایە از چیزی یا کسی کە گریبانگیرت شدە باشد].

**یەخەکێشیاگ:** برێتی لە کەسێ کە پیاو بە فرزەندی قبوڵی دەکا: فرزند خواندە. (مەژار ۱۰۳۰)

**یەخەی خۆی دادڕیوە:** واتە بێزار و وەڕەس و خەفەتبارە (جلال محمود. بەرگی ۱. ۴۹۷): [کنایە از آدم کە بیزار و غمگین است].

**یەخەی لێ هەڵتەکاند:** واتە لێی وەڕەس بوو (جلال محمود. بەرگی ۱. ۴۹۸): [کنایە از او بیزار و متنفر شد].

**یەك ئاخوڕ فێر بووە:** ۱) حەز بە تەنیایی دەکات ۲) یەك مەنجەڵی فێر بووە: کنایە از: ۱) دوستدار تنهایی است. ۲) جداگانە غذا می‌خورد.

**یەك تەنە (یەك دەستە):** برێتی لە یەکێك کە یاریدەدەری نییە و بە تەنیا دەرەنجێت کار دەکات، هەر خۆیەتی (جلال محمود. بەرگی ۱. ۴۹۸): [کنایە از کسی کە بی‌پشتیبان باشد و تنها زحمت بکشد].

**یەك دەستەن:** واتە وەکوو یەکن (جلال محمود. بەرگی ۱. ۴۹۸): [کنایە از مانند هم هستند].

**یەك دڵە:** ۱) پاکە، ڕاستە: ۱) [کنایە از پاك و صادق] ۲) ڕاڕانییە: ۲) [دو دل و متردد نیست] ۳) دڵنیایە (جلال محمود. بەرگی ۱. ۴۹۸): ۳) [مطمئن است].

**یەك چاو بوونەوە:** برێتی لە یەکلاکردنەوەی کار: کنایە از مشخص و قطعی نمودن کاری.

**یەك قسەیە:** ۱) سەر ڕاستە: ۱) [کنایە از کسی کە قولش درست باشد] ۲) کە گفتی دا دەیباتە سەر: ۲) [کنایە از بە عهدش وفا می‌کند] ۳) لە سەر قسەی خۆی سوورە (خاڵ.ف.۴۹۹): ۳) [کنایە از بر سر حرف خویش پایدار است].

**یەك و دووی لێ ناکات:** واتە لێی ڕازی نابێت، بە بێ لێکدانەوە و تێڕامان پەلاماری شتەکە یان کارەکە دەدات: (خاڵ.ف.۴۹۹) [کنایە از او راضی نمی‌شود، و بدون تحقیق و اندیشە بە آن می‌پردازد].

**یەکان دەردوو:** یەکسەر، بێشەرم و پێچ و پەنا (جلال محمود. بەرگی ۱. ۴۹۸): [کنایە از بدون شرم و رودربایستی].

**یەکباد:** برێتی لە گیانداری لاواز و باریك و بێ تین: کنایە از آدم لاغر و ناتوان. (مەژار ۱۰۳۰)

**یەکباڵ:** برێتی لە مرۆڤی تەنیا و بێ یاریدەر: کنایە از آدم تنها و بی یار و یاور. (مەژار ۱۰۳۱)

**یەکبایە:** چووزی باریکە، ئێسکی باریکە بە پێچەوانەیەوە، دووبایە. واتە: ئێسکی ئەستوورە و

بەخۆوەیە (جلال محمود. بەرگی ۱. ٤٩٨): [کنایە از لاغر و استخوانی].

**یەکپابوون:** بریتی لە سەرسەختی، لاساری، سووربوون: (یەکپا ویستاوە هەردەیموێ): کنایە از پافشاری. (معزبر.۱۰۲۱)

**یەکدڵن:** تەبان، ڕێکن، یەکیان گرتووە (جلال محمود. بەرگی ۱. ٤٩٩): [با هم متحد و موافقند].

**یەکرەنگ:** بریتی لە مرۆی ڕاست و بێگزوگەڕ: کنایە از آدم صادق و بی‌غل و غش. (معزبر.۱۰۲۲)

**یەکزمانە (یەك ڕووە):** ۱) قسەی پاشملەی نییە، پێچوپەنای نییە: کنایە از کسی کە غیبت نمی‌کند ۲) ڕاستگۆیە: کنایە از صادق و راستگوست.

**یەکشەوەیە:** بریتی لە یەکێك کە لە ناکاودا دەوڵەمەند بووبێت بە میرات یان بە شتێکیتر (خاڵ.ف.٤٥٦): [کنایە از کسی کە ناگهان ثروتمند شود بە خاطر ارث و میراث یا از راه دیگری].

**یەکچاوبوونەوە:** بریتی لە لاچوونی دوودڵی و ساغبوونەوەی کار بە لایەکا (خاڵ.ف.٤٥٥): [کنایە از حل و فصل شدن کاری، مشخص و قطعی شدن کاری].

**یەکچاوە:** ۱) بە تەنیا و بێ یاریدەدەرە: ۱) کنایە از بی‌پشتیبان است ۲) لە کارەکەیدا، لە ژیانیدا، دڵنیا دەژی کەسێك نییە سەری بسێنێت، چەواشەی بکات: ۲) کنایە از کسی کە در کارش یا زندگیش آسودە است و کسی نیست مزاحمتی برای او ایجاد کند. دەڵێن باش بوو یەکچاو بوومەوە واتە لێیان ڕزگار بووم کە سەریان لێ تێك دابووم، چەواشەیان کردبووم یان لە تەواو کردنی کارەکە بۆتەوە و دەستی بەتاڵە.

**یەکماڵ:** بریتی لە دۆستی ماڵ یەك: من و تۆ (یەکماڵ)ین (خاڵ.ف.٤٥٦): [کنایە از دارایی و شراکتی کە تقسیم نشدە].

**یەکماڵی:** بریتی لە تێکەڵی دووکەس کە درێغیان لە یەك نەبێ (خاڵ.ف.٤٥٦): [کنایە از دو نفر کە هیچ گونە کوتاهی و قصوری در میانشان نباشد، یکدل].

**یەکودوو:** بریتی لە دەمقرێ و شەڕە قسە: کنایە از جرّ و بحث و جدال. (معزبر.۱۰۲۲)

**یەو (یەك) سەر دێری و هەزار زوان:** بریتی لە یەکێکی درۆزن: کنایە از آدم دروغگو.

**ییخ خواردن:** بریتی دانەوینەوە (هەر دەستم بۆ برد ییخی خوارد): کنایە از خم شد و تسلیم شد. (معزبر.۱۰۲۵)

**ییخبوون:** بریتی لە دانیان و کۆڵدان لە شتێکدا: کنایە از تسلیم شدن و باختن. (معزبر.۱۰۲۵)

**ییخدان:** بریتی لە شکستدانی کەسێ (خەریك بۆ دەس بکاتەوە بەڵام زۆر زووییخم دا) کنایە از خوابانیدن و شکست دادن کسی. (معزبر.۱۰۲۵)

*دوایی...*

## سەرچاوەکان

## کوردی:


١- ئیبراهیم محەممەدی، محەممەد سەعید (١٣٦٤)، **گەشتی لە عیلمی بەلاغە**، تهران: چاپخانە مهارت.

٢- ئینسافجویی، محەممەد (ئەهوەن) (١٣٨٢)، **پەند و مووچیاری گەورەکانمان**، سنندج: انتشارات گوران.

٣- جەلال مەحموود، عەلی (١٩٨٢ و٢٠٠١)، **ئیدیوم لە زمانی کوردیدا، بەرگی١و٢**، سلێمانی: چاپ و پەخشی سەردەم کۆماری عێراق: وەزارەتی ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی بەغداد.

٤- حیرت سجادی، عەبدولحەمید (١٣٦٩)، **پەندی پێشینیان، بەرگی١و٢**، ورمێ: بڵاوکردنەوەی سەلاحەددین ورمێ.

٥- خاڵ، شێخ محەممەد (٢٠٠٠)، **پەندی پێشینیان**، کوردستانی عێراق: دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم.

٦- خاڵ، شێخ محەممەد (١٩٦٠و ١٩٦٤و ١٩٧٦)، **فەرهەنگی خاڵ بەرگی ١و٢و٣**، سلێمانی، چاپخانە کامرانی.

٧- روخزادی، عەلی (١٣٨٢)، **گوارەی کوردەواری**، سنندج: بڵاوکەرەوەی کوردستان.

٨- رەسووڵ، شوکریە و تەقی، جەلال (١٩٨٤)، **پەندی پێشینیان و قسەی نەستەقی کوردی**، هەولێر (اربیل): دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس.

٩- شەرەفکەندی، عەبدوڕڕەحمان (هەژار) (١٣٨٤)، **فەرهەنگی هەنبانە بۆرینە، کوردی - فارسی**، تاران: بڵاوکردنەوەی سروش.

١٠- شێخەڵا دەشتەکی، عومەر (١٩٨٥)، **پەندی کوردی**، بەغداد: وەزارەتی ڕۆشنبیری.

١١- فتاحی قاضـي، قادر (١٣٦٤و١٣٧٥)، **امثال و حکـم کـوردی بـەرگی ١و٢**، تبریـز: انتشارات دانشگاه.

١٢- فەیزیزادە، تەها (١٣٦٧)، **فەرهەنگی وشـە دووانـەکانی زمـانی کـوردی**، ورمـێ: ناوەندی بلاّوکردنەوەی فەرهەنگی کوردی.

١٣- کەریمپوور، کەریم (١٣٨٠)، **فەرهەنگی کوردی خۆرهەلاّت**، کرمانـشاه: نـشر صـبح روشن.

١٤- مەردۆخ، محەمەد (١٣٦٢)، **فەرهەنگ مەردۆخ**، سنندج: انتشارات غریقی.

١٥- مەعرووف شارەزووری، عەلی (١٩٨١و١٩٨٧)، **پەندی پێشینیان**، بەغداد: الحوادث.

١٦- نانەوازادە، عەلی (١٣٨٠)، **فەرهەنگی هەرمان**، تاران: چاپەمەنی تەوەکولی.

## فارسی:


۱- دهخدا، علی اکبر (۱۳۶۳)، امثال و حکم، تهران: چاپخانه سپهر.

۲- شاملو، احمد (۱۳۷۷)، فرهنگ کوچه، تهران: انتشارات مازیار.

۳- شمیسا، سیروس (۱۳۷۰)، بیان، تهران: انتشارات فردوس و مجید.

۴- فتاحی قاضی، قادر، گزیده از لغات و عبارات کردی، نشریه‌ی دانشکده‌ی ادبیات و علوم انسانی تبریز: ، سال ۲۵- شماره مسلسل ۱۰۶.

۵- کریمی، لطف‌الله (۱۳۷۲)، بررسی تطبیقی اصطلاحات ادبی انگلیسی- فارسی، تهران: انتشارات فرهنگ.

۶- کزازی، جلال‌الدین (۱۳۶۸)، بیان، تهران: انتشارات سعیدی.

۷- منصوری، مهتاب (۱۳۸۰)، ضرب‌المثلهای ایرانی، تهران: انتشارات فراین.

۸- میرزانیا، منصور (۱۳۷۸)، فرهنگنامه کنایه، تهران: چاپخانه سپهر.

۹- نجفی، عبدالحسین (۱۳۷۸)، فرهنگ فارسی عامه، تهران: انتشارات نیلوفر.